# کاروان

KARWAN

گۆڤارێکی
مانگانەی ئەدەبی و
رۆشنبیری یە
وەزارەتی رۆشنبیریی
حکومەتی هەرێمی
کوردستان
دەری دەکات



**خولی راپەڕین**



نیسان
١٩٩٣

3

گۆڤارێکی مانگانەی
ئەدەبی و رۆشنبیرییە
وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی
هەرێمی کوردستان دەری دەکات

# کاروان
KARWAN

خولی راپەڕین




## لەم ژمارەیەدا





ناوونیشان
هەولێر/ وەزارەتی رۆشنبیری
هەرێمی کوردستان

چاپخانەی رۆشنبیری
(ت ٢١٦٥٨)

# چەمکی ژمارە

ئەمە سێیەم ژمارەی (کاروان)ی خولی راپەرینە (کاروانی)ی قەڵەمی ئازادو دوور لە هەموو قەفەزو چەقۆی سانسۆرو دیوجامەی رەقیبێ،(کاروان)ی وشەی رەنگ بەدەستی کوردستانی شۆرش و راپەرین، کوردستانی باخی شکوفە کردووی‌و دیموکراتی‌و خۆشەویستی‌و تەبایی، کوردستانی خاڵی لەمێرەمزەمەی بەعس و جروجانەوەرەکانی رژێمی خوێن و سێدارەو گازی ژەهراوی‌و ئەنفالی بەدناو.. کوردستانی پڕ لەسەروەریی پێشمەرگەو پڕ لە هاواری شەهیدان و پڕ لە ئازادی. ئەمە (کاروان)ی هەڵمەتە سەرتاسەریەکانی بەهاری کوردستانی (١٩٩١)مانە. هەڵمەتی ژن و پیاوو منداڵ و کاروانی گەلەکەمانە. بۆسەر قەڵای دیکتاتۆریی‌و بنەبڕکردنی زۆرداری.. ئەم (کاروان)ە گۆڤاری خوێنی هەموو قوربانیە کانمانەو گۆڤاری خوێنی هەموو نووسەرو رۆناکبیرە شەهیدەکانمان و رەنگی هەمیشە زیندووی ئەوانە.. (کاروانی) بێ دیمەنی ڤیزەوەنی دیکتاتۆرو بێ لاپەرەی تاریك و لەبەرگەوە بۆ بەرگ رووناك و خۆشەویست.. گۆڤاری هەموو ئەو نووسەرو هونەرمەندو شاعیرو زانایانەی کە چارەنووسی ووشەو قەڵەم و رەنگ و دەنگی خۆیان، بەهەرەو توانای خۆیان، بەسەرجەمی چارەنووسی گوڵ و گیاو شاخ و داخ و کانی‌و داروو‌وباری ئەم خاکە زامدارو شیرینەوە بەستۆتەوە،

ئەمە (کاروان) مەشخەڵی بابەگوڕ گوڕو (کەرکوك)ی چاوو دڵ و قودسی کوردستانە. کاروانی کۆچی بە کۆمەڵی ملیونانی هەرگیز لەیاد نەچووە.
لاپەرەکانی گۆڤاری (کاروان)ی راپەرین، سنگیان بەقەد پێدەشتەکانی کوردستان فراوانە. هێندەی ئەشکەوت و لێرەوارو گەوەی چیاکانیشمان دۆست و پەناگەن بۆ هەموو بیروباوەڕێکی ئازادو هەموو دەنگێکی‌سەربەست و هەموو ئەفراندنێکی تازەو خولقێنەر. ئێمە دەرگامان لەبەردەم هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی‌و رۆشنبیری‌و زانستی هەمە رەنگدا والایە. ئێمە ئەفراندن و داهێنان و خولقاندنی تازەو روانینی هونەریی باڵاو جیهان بینی هەمە لایەن و قووڵ ئەناسین نەك رواڵەت و ناو ئێمە تەنها پێوانەمان بۆ پەسند کردنی هەربابەت و نووسینێ، پرشنگدانەوەی دەق و بەبرشتی‌و بەپێزی بەرهەمەکەیە. ئێمە بایەخ بەتوێژینەوەو هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەی زانستیانە ئەدەبی و رەخنەی شەخسی بریندارکەرو سووکایەتی پێ کردن ئەنێینە لاوەو پاکی‌و بێگەردی گۆڤارەکەمان ئەپارێزین و ئەمەیش بە ئەرکێکی پێویستی پاراستنی دیموکراتی‌و مافی رەوای خۆمان ئەزانین.

نووسینی جوانتان لەسەرچاو
رەخنەی دڵسۆزانەتان لەسەرچاو

کاروان

لێكۆڵینەوە

# كوردو (كێشەی كورد) لەرۆمانی حەمەدۆكدا

خالید كەریم كورەداوی

رۆمانی (حەمەدۆك) یەكێكە لەرۆمانە مەزنەكانی جیهان و بەشاكاری رۆمان نوسی گەورەی كوردستانی توركیا (یەشار كەمال) دەژمێردرێت، رۆمانەكە (٤) بەرگە كەتائێستا هەرجواری بۆ فارسی وەرگێردراون، بەرگی یەكەم بەناوی (اینجە ممد حەمەدۆك) بەرگی دووەم بەناوی (شاهین - اناوا رزا - شەهێنی ئاناوارزا)، سێیەم بەناوی (بگذار خارستان بوزد - لێگەرێن بادروەلان بسووتێ)و بەرگی جوارەم بەناوی (اخرین نهرهای اینجەممد دوا نەبەردەكانی حەمەدۆك)، بەشی یەكەم و دووەمی لەلایەن مامۆستای هێژای كورد (عبداللە حسن زادە) هەر لەژێر ناوی (حەمەدۆك) دا لە فارسیەوە كراونەتە كوردی، بەشی یەكەمی ساڵی ١٩٨٦ لەقەوارەی (٥٥٢) لاپەڕەداو بەشی دووەمی ساڵی ١٩٩١ لە (٥٩٢) لاپەرەدا لەچاپ دران، كە هەردوكیان بەیەكەوە (١١٤٤) لاپەڕەی قەبارە گەورەن بەفەرهەنگۆكەوە، مامۆستای هێزا ئەركێكی زۆری پێوە كێشاوەو شایانی سوپاسی سەرجەمی گەلەكەمانە، پەندێكی یۆنانی هەیە دەڵێت (وەرگێڕان خیانەتەو وەرگێڕیش خائین)

ش دەڵێین خۆزگە هەموو خائینان خیانەتەكەیان ئاوها بوایە، ئەوسا هەموویانمان گوڵ باران دەكرد.

یەشار كەمال كوردێكی كوردستانی توركیایەو بۆخۆی گەلێ جارو بەشێوەیەكی راستەوخۆ دانی بە نەتەوایەتی خۆی داناوەو بەشانازیەوەو وتوویەتی من كوردم، بەشێوەیەكی ناراستەوخۆش لەنووسینەكانیدا ئاماژەی بۆ ئەو راستیە كردووە، كە ئەمەش بەگەورەترین و پیرۆزترین هەڵوێست دەژمێردرێت بەتایبەتی ئەگەر زانیمان كە لەكوردستانی توركیادا هەر لەساڵی ١٩٢٧ تا ساڵی ١٩٨٩ زمانی كوردی قەدەغە كراوەو كورد بەتوركی شاخاوی ناوبراون.

باوكی یەشار كەمال خەڵكی ناوچەی (ئەرجیش)ی دەوروبەری گۆلی (وان)ە، لەساڵانی جەنگی یەكەمدا لەبەرنەبوونی و قات و قڕی وەك هەزاران جوتیاری كورد ڕوی كردۆتە ناوچەی چكورئاوای چیاكانی تۆرووس كە ناوچەیەكی بەپیت و بەرەكەت بووە. ساڵی ١٩٢٣ لەگوندی (هەمیتە)ی ناوچەی (سیهان) یەشار لەدایك بوەو ناویان نا (كەمال). زۆربەی ماوەی ژیانی لەگوندەكانی ناوچەی چكور ئاوا بردۆتە سەر، حا چ بەخوێندن یان كاركردن ماوەی هەشت ساڵی ژیانی لەمەرەزەجارەكانی دەوروبەری چۆمی (ساوران) كاری (میراو) بوەو بۆخۆی ئەم كارەی بەخۆشترین ماوەی ژیانی زانیوەو هەفتەی دووجار تاسەرچاوەی چۆمی (ساوران) بەپێ دەرۆیشت.

یەشار كەمال نووسەرێكی شۆڕشگێڕبوو، لەهەموو نووسینەكانیدا ئاماژەی بۆ گیروگرفتە سیاسیو كۆمەلایەتی و ئابووریەكانی توركیا بەگشتیو ناوچەی ئەنەدۆڵ و كوردستان بەتایبەتی كردووەو بێ باك لەگرتن و لێدان رەخنەی لەرژێمە دكتاتۆرەكان و كۆنەپەرست و شۆڤێنیەكان گرتووەو خۆی بەنووسەری جوتیارو ڕەنجبەرانو كرێكاران و ڕاوچیان زانیوە.

یەشار كەمال كوردێكی خاوەن بەهرەبوو، سەرەڕای نوسینی چیرۆك و رۆمان، شاعیرو مۆسیقازانیش

بووە ،رۆمانسی و سروشت پەروەربووەو بەجۆرێک وەسفی سروشتی شانۆی رۆمانەکانی دەکات کە ئەوە هەر لەکوردێکی پەروەردەی بناری چیاکانی ئارارات و تۆرووس دەوەشێتەوەو چکورئاوای دلێ تۆرووسیش وەکو بەری دەستی دەناسێ و دیمەنە جوانەکانی کوردستانیش لەئاراراتدا دەبنە ملوانکەی رۆمانەکانی .

شانۆی رۆمانی ( حەمەدۆک ) بەتایبەتی چکورئاوا و ئاناوارنازا دەکەونە ناوجەرگەی تۆرووس و — باکوری دەریای سپی ناوەراست ،بەواتای ئەوەی کە دەکەونە ئەودیوو سنوری جوگرافیای کوردستان چونکە سنووری کوردستان لەباکورەوە چیاکانی ئاراراتەو لەخۆرئاواوە چیاکانی ( تۆرووس ) ە — بەلام لێرەدا سرووشتی سەختی شاخەکان نەیتوانیوە دوو میللەتی کوردوتورک لەیەک دابېرێت و هەر بۆیە ئاناوارزاو چکورئاواش جێگەی تێکەڵ بوونی میللەتانی تورکیان و هەر بەپێی ئەم واقیعەش پاڵەوانانی رۆمانی ( حەمەدۆک ) لە کوردوتورک و تورکمان و ئەرمەن و چەرکەس و عەرەب پێک هاتوون .

مێژووی رۆمانی حەمەدۆک دەگەرێتەوە بۆرۆژگاری فەرمانرەوایی ( مصطفى كمال ئەتاتورک ) ئەتاتورک لە ١٨٨١ لەدایک بوو ،لە ١٩١٩ پارتی نەتەوەیی تورکی دامەزراند،لە ١٩٢٣ تورکیای کرد بەکۆماری و سالانی ١٩٢٧ — ١٩٣١ — ١٩٣٥ بۆ سەرۆک کۆماری تورکیا هەلبژێردراوەتەوە ،سالی ١٩٣٧ مردووە . لەرۆژگاری فەرمانرەوایی ئەودا درندەترین تاوان دژ بەگەلەکەمان لەو پارچەیەی کوردستاندا کرا ،بەدەیان هەزار گوللەباران کران و دەیان هەزار زیندەبەچاڵ کران و دەیان هەزاریش سووتێنران دوای ئەوەی لەچاڵێکدا کۆ دەکرانەوەو دارودرەختیان بەسەرّدادەراو ئاگریان تێبەردەدراو ژمارەیەکی زۆریشیان فرێ درانە ئاوی جەمو رووبارەکانەوە دوای ئەوەی دەخرانە فەردەو جەوالەو سەرەکەی گرێ دەدرا . هەموو ئەم تاوانانەی ئەتاتورکی نامرۆڤ وایان لە یەشارکەمال کرد کە سەردەمی ئەو درندەیە هەلبژێرێت بۆ شاکاری ( حەمەدۆک ) بەتایبەتی ئەگەر زانیمان ماوەی ( ١٤ ) سالی منالی لە ژیانیدا لەژێر حوکمي ئەودا گوزەراندویەتی کە بەهەستدارترین ماوەی ژیانی مرۆڤ دەژمێردرێت هەربۆیە ( حەمەدۆک ) رەمزی شۆرشگێرو تێکۆشەرانی کوردستانەو رۆمانەکەش بەگشتی شۆرشێکی فیکری و دەروونی و رۆشنبیرییە بەرووی تاوانبارانی وەکو ( ئەتاتورک ) دا ،مامۆستا سەلاح سەعدوڵلا لە ( المسألة الكردية في تركيا )دا دەلێت ( حەمەدۆک کەس نییە ( رۆبنی هۆد )ی کورد نەبێت ) .

ئەتاتورک ی گۆربەگۆر رژێمی دەرەبەگی لە ناوچە تورکییەکاندا لەناوبرد بەلام بە هەموو شێوەیەک پشتگیری مانەوەی کرد لەناوچە کوردی یەکاندا چونکە لەگەل بەرژەوەندی و سروشتی شۆڤێنییانەی ئەودا دەگونجا ،هەربۆیە لەسەردەمی ئەودا باری ژیانی جووتیارانی کورد زۆر سەخت تر بوو لەماوەی گرانی و قاتییەکانی سالانی جەنگی یەکەم و جووتیاران تووشی راگوازتن و لەناوبردن دەبوونەوە لەسەردەستی ئەتاتورک و دەرەبەگە کوردەکان . هەر بەپێی ئەم واقیعەش شۆرشەکەی حەمەدۆک ململانێی نێوان دێهاتیەکانو ئاغاکانە ،کەئەمەش کێشەی سەرەکییە لە رۆمانەکەدا . سەرەرای ئەم کێشە سەرەکییە ( حەمەدۆک ) ئەم کێشانەی گرتۆتە خۆی : — کێشەی زەوی و زار — هەژاری و دواکەوتوویی و نەزانی خەلکی ناوچەی تۆرووس — پشتگیری حکوومەت بۆ ئاغاکان — بلاوبوونەوەی مێشولەو نەخۆش مەلاریا — دزی و جەردەیی — نەخوێندەواری نارەوایی دادگاو یاساکانی ئەتاتورک — ناشارستانی رژێمەکەی ئەتاتورک — چەتەو یاغییەکان

کەس جۆربوون ،جۆرێکیان ئامانجیان جەردەیی بوو،جۆرکیان بەفیتی ئاغاکان و بۆبەرژەوەندی ئەوان یاخی بوون – جۆری سێیەمیان ئەوانەبوون کەلەدژی زوڵموزۆرداری حکوومەت و ئاغاکانی و پیاوەکانی ڕاپەڕیبوون و حەمەدۆک لەوان بوو ئەمەو دەیەها گیروگرفتی تری تورکیای کەمالی لەبەرگەکانی ( حەمەدۆک ) دا خۆیان بەدیار دەخەن . ئەوەی ئێمەش لێرەدا مەبەستمانە خستنە رووی کێشەی نەتەوایەتی کوردە لەڕوانگەی بۆ چوونی پاڵەوانەکانی رۆمانی ( حەمەدۆک )ەوە .

باوکی یەشارکەمال بەدەستی ( وسووە کوردە ) کە بەناوی را دیارە کورد بووە لەساڵی ۱۹۲۷ دا – کوژراوە ،یەشارکەمال کەباوکی بەبەرچاویەوە بەخەنجەر دەکوژرێت تەمەنی چوار ساڵان بووە هەر لەهەمان کات و ساتدا دەنگی تەقە لەهەموو لایەکی دێیەکەیان بەرزدەبێتەوە ،بۆیە یەشار تا ساڵی ( ۱۹۳۷ ) لاڵ دەبێت و سەرەڕای ئەوەش لەو بارودۆخە سەختەدا بژیوی خۆی و خێزانەکەی دەکەوێتە ئەستۆ . سەرەڕای هەموو ئەو نەهامەتی یانەی بەهۆی ئەو کوردە نمەك حەرامەوە بەسەری هات یەشاری دڵ گەورە نەتۆڵەی لەئەو کردەوەو نە تۆڵەی لەگەلەکەی کردەوە بەوەی کەخۆی بەتورك لەقەڵەم بدات ،وەك ئەو دەروون نزمانەی کە بەهۆی ناپیاوی تەنها کەسێکەوە نەفرەت لەتەواوی نەتەوەیەك دەکەن ،بەتایبەتی ئەگەر زانیمان کە هەر ئەوساڵە ( ۱۹۲۷ ) یاسای بەتورك کردنی کوردو قەدەغەکردنی زمانی کوردی دەرچووبەڵکو رۆژەکانی تەمەنی یەشار ئەوەیان دەرخست کە هەمیشە گەل و نیشتمانی خۆی خۆش ویستووەو لە کۆت و زیندانەکانی ئەتاتورك نەسڵەمیوەتەوەو هەمیشە شانازی بەوە کردووە کە کوردەو بەرێگەی تایبەتی خۆی بەهەموو شۆڤێنیەکانی تورکیای وتووە من کوردم و کوردیش دەزانم ،بەزەکۆبەگی باوکی عارف صائم بەگ دەڵێت ( یەك ووشەش تورکی نەدەزانی ) هەر بۆیە بەزمانی ئەوەوە قسە دەکات ( کورۆ حەسیەکە بقەهرن – لاوۆ عەلی سەفا تووسەر سەران هاتی ،سەرچاوان هاتی ،فراروونی چاوانی ( چۆنی ) – تووهاتی باڵ بەگ ؟ بەگ فێرایە ؟ – هەرۆ لاوۆ زووری ب٢ – ل ٢٣٧).

* یەشارکەمال لەدەربارەی شۆڕشەکەی کوردستانی ۱۹۲۵ ی شێخ سەعیدی پیران دا ئەم ووشانە دەدرکێنێت ،عەلی سەفابەگ بەژنەکەی دەڵێت ( حکوومەتت پێ چییە خاتوون ،ڕاپەڕینی کوردەکانی سەرکوت کرد،پێت وایە بەچەند یاغی کاڵە لەپێ ناوێرێ . ب١ – ل٣٥٤) ،یان دەڵێت ( دریژەتان بەیاخی بوون دژی دەوڵەت و میللەت دا ،یاخی بوونی ئێوە راست وەك یاخی بوونی شێخ سەعید بوو ب ٢ – ل ٤٧٢ ) . لەم دوو وتەیەی عەلی سەفابەگ دوو ڕاستیمان بۆ دەردەکەوێت :–

۱– بەهێزی شۆڕشەکەی ۱۹۲۵ ی کوردستان ،بەڵام سەرەڕای بەهێزی بەزەبروزەنگی حکوومەت تێك شکا ئیتر چۆن حکوومەتی کەمالی بەچەند یاغیێك ناوێرێت کە بەهیچ جۆرێك هێزەکەیان ناگاتە هێزی شۆڕشەکە .

۲– سروشتی پێشکەوتنخوازی راپەڕینەکەی ۱۹۲۵کە راست وەك ڕاپەڕینی دێهاتیەکان و چەوساوەکانی ( حەمەدۆك ) دژی ئاغاو ملکدارو حکوومەتەکەی ئەتاتۆرك بوون . لەشوێنێکی تری رۆمانەکەدا ئاکامی شۆڕشی کوردستان و شۆڕشی دێهاتیەکانی رۆمانەکە بەیەکەوە دەبەستێت و ئاکامی سەرکردە کانیشیان لەسێدارەدرانە لەژێر زەبروزەنگی حوکمێکی دکتاتۆرانەدا ،دەڵێت ( ئەمجارە عەلی سەفابەگ دووقامکی وەك ( ٨ ) سەرەوژێر ڕاگرتن ب٢–ل٤٧٢ ) ،ئەمەش لەبەردەمی دوو پیری گوندی وایوای کەوەسمانە زلەو سەخچەکاهیابوون و شۆڕشە کەیانی بەشۆڕشەکەی شیخ سەعید چوواند ،کە ئەم ئامازەیەش بیرخستنەوەی لەسێدارەدانی شیخ سەعید و ئەو دوو پیرەی رومانەکەیە ئەگەر دژی حکوومەت

بن ،جا هەرچەندە پیربن ،وەك چۆن شیخ سەعیدی پیران لەتەمەنی ( ٥٧ ) سالیدا شەهید کرا .

* رۆمانەکەی یەشارکەمال ئاماژەی زەبروزەنگی حکوومەتی ئەتاتوورك دەکات دژ بەرۆلەکانی کوردستان ،بەتایبەتی لەشاری دیاربەکر کەشاری هەلمەت و قوربانی کوردستانی تورکیایە ،بۆنموونە ( چەرکەسێکی دنیا دیدەو بە ئەزموون گوتی ئەو ( باسی عارف صائم بەگ دەکات ) دەستی راستی مستەفا کەمال پاشایە ،هاورێی شەرکەری مستەفا کەمال پاشایە ،پێکەوە گیانێکن لەدوو قالبدا لەدیاربەکر ئەو کەسانەم دیت کە بەفەرمانی وی لەدار درابوون ،لەم سەرو ئەوسەری شار هەرداربو چەقابوو ب٢ ـ ل ١٩٧ ) شایانی باسە عارف صائم بەگ لەرۆمانەکەدا بەکورد ناوی هاتووە ( کوری یەکێك لە کوردە هەژارەکانی ( بین گوللي ) بوو ب٢ ـ ل ١٩٨) ( نەختێك لەهجەی کوردی دەزانی ب٢ ـ ل٢٠٠) کەچی دەستیشی بەخوێنی کورد سوورە لێرەدا هیچ دورنییە ئەم عارف بەگە ناوێکی رەمزی بێت بۆ جەنەرال کازم قەرەبەکر پاشا کە کورد بووەو سەرکردەیەکی عەسکەری و دۆستێکی نزیکی ئەتاتورك بووەو بەشدارییەکی گەورە بەلام سەرشۆرانەو بێ ئەخلاقانەی کرد لەکوژاندنەوەی ئاگری شۆرشی ئەوسای کوردستان دا .

* هەرلەباسی قرکردنی بەکۆمەلی و راگوارتن لەتورکیای کەمالیدا ئەم برگانەمان بەرچاو دەکەوێت ( پشتی قەلای ئاناوارزا مەوتەنی کورانی لەکە ،کوردە لەکەکان وەك هەلۆ وابوون ،ئەو کوردە لەکانە ئێستا تەنها لەداستاندا ماون(ب ٢ ل٣٨٨ ) هەروەها :( ئەو گەرەکانەی کە ئەرمەنییەکان چۆلیان کردبوو،رۆیشتبوون و خەریك بوو وێران دەبوو،ئەو کوردانەی کە لەرۆژهەلاتی ئەنەدۆلەوە کۆچیان پێ کرابوو ،نیشتەجێ ببوون ب٢ ـ ل ٤١٧ ) ،سەرنجی ووشەی ( کۆچیان پێ کرابوو ) بدە .

* یەشار لەباسی ئازایەتی و چاونەترسی و ئەمەکداری و بەوەفایی کوردەکان نەسلەمیوەتەوەو هەمیشە ناوی پالەوانە کوردەکانی رۆمانەکەی بەرز نەخشاندووەو بروای تەواوی پێیان هەبووە بۆ هەلبژاردنیان بۆ یارمەتی پالەوانی رۆمانەکە لەم بارانەی سەرەوە دەلێت :ـ

ـ تائەمرۆ جگە لەرەشیدە کوردە هیچ یاخییەك لاقی وەچکورئاوا نەکەوتووە ب١ ـ ل٣٢١ .

ـ ( ئەم دێیە پیاوێکی جوامێری تیدایە ب٢ـ ل ٤٠) هەر لەوەسفی حەسەنی یۆبار ئۆغلی‌دا وەسمانەزلە دەلێت ( بابي خوالێ خوشبووت قزلباش بوو،بەلام کوردێکی قارەمان بوو(ب٢ ـ ل٤٦ ) ، ( ئەتۆ کورە کوردێکی ب٢ ـ ل١١٩) .

ـ ( لەنێو کوردەکانی وەك هەلۆی دەرسیم کەس نەبوو تۆ نەناسی ب ٢ ـ ل ٨٢ ) .

ـ ئیدریس بەگ بەعەلی سەفابەگ دەلێت ( هاتینەلای جەنابت ،دیسان لەمال نەبووی ،چووینە مالی ( مام عەلییە کوردە ) ،حەوتویەك لەلای مایئەوە میوانداریەکی باشی لێ کردین ب٢ ـ ل٢٣٠ ).

ـ جەبار بەحەمەدۆکی شۆرشگێرو یاغی دەلێت ( سێ رۆژان لەمالی ( تەمیرە کوردە ) چاوەرێت دەبم ب١ ـ ل٤٤١ ) .

ـ لەباسی ئازایەتی و هەروەها زۆرداری ش لای ـ خێلی کوردی هەوشار دەلێت :ـ

( ئەوان لەهەرجێیەکی چکورئاوا پێیان خۆش با گەرمێن و کوێستانیان دەکرد ب١ ـ ل ٣٤٨ ) .

ـ یەشار بۆئەوەی بۆ خوێنەری دەربخات کە ( کوری زالا ) کە یەکێکە لەو یاخیانەی دژی چەوساندنەوە لەشاری ماراشی کوردستانەوە یاخی بوون ،کوردە دەلێت ( جووتێك کەوشی سووری ماراش و جووتێك گۆرەوی کوردی لەپێدابوون ب٢ ـ ل٣١٠ ) .

* یەشارکەمال بۆ پەربەرچ دانەوەی شۆفێنییەکانی تورك کە دەیانگوت کورد لەتورکیادانییە ، هەروەها بۆبەرچاوی رۆشنبیرانی جیهان ،هەر بە

ئەنقەست پاڵەوانە کوردەکانی لەرۆمانەکەدا جێی کردوتەوەو دەنگیان لەتورکیادا لەبڵندگـــۆی ( حەمەدۆک ) ەوە بەرزدەکاتەوەو دەڵێت ئێمـــە کوردین و تورک ی شاخاوی نین ،ئێمە گەلێکـــی سەربەخۆین و کوردستانیش نیشتمانمانە هەربۆیـــە پاڵەوانەکان لەسنووری کوردستان دا دەژیـــن و هەژارو دەوڵەمەندن و ئاغاو مسکێنن و چەوساوەو چەوسێنەرن . نموونەی ئەم خاڵەش :ـ

ـ( حەمەد لەخاڵێکدا کە هەتا پشتێني قوڕاوی بوو لەبەردەرکي ماڵي ( کەرەمە کوردە ) ڕاوەستـــا ب٢ ل ٣٦٩ ) .

ـ ئیدریس بەگ بۆئەوەی عارف بەگ لێی خۆش بێـــت ( تەنانەت چووە ئەنتەب بۆلای خورشید بەگي کـورد ب ٢ ـ ل ) .

ـ( جەمشیدە کوردە لەنارلي قشلا حەمەدۆکي دیبـوو ب ٢ ـ ل ٢٢٣ ) .

ـ( ئادەم ڕاستەڕێ ڕۆیشت بۆماڵي سەفەرە کـــوردە ب ٢ ـ ل ٢١٧ ) .

ـ ـ( مەمۆ کوردە یەکێکە لەئاغایانی زەمینـــدار بەکرێی گرتووە ب١ ل٤٠٤ ) .

ـ حەمەدۆک دەڵێت ( هەموو دەوروبەری فورات هەموو عێلاتە کوردە ناحاڵیەکان گەرام ب٢ ل ٢١٧ ) .

ـ لەباسی چاوچنۆکی عارف بەگ دا دەڵێت ( بـــێ پەروا لەعەشیرەتي کوردەکاني ( بین گوللـــــي ) ب٢ ـ ل١٣٧ ) .

ـ ئادەمی نۆکەری عەلی سەفا ( زوو تووشـــی کچە کوردێك ببوو کە جل وبەرگێکی ڕەنگاورەنگ و پـــڕ نەخش ونیگاری لەبەردابوو ب٢ ل ٣٦٩ ) .

یەشارکەماڵ ی کورد یەکێکە لەقوربانیەکانـــی سیاسەتی بەتورك کردن بۆیە بەتورکی نووسیویەتـی بەڵام بەکوردی دواوەو بەدڵ کورد بووە ،بۆیـــە لەکلاوڕۆژنەی ( حەمەدۆک ) ەوە دوکەڵی ووشەکانـی دەکاتە ناو چاوی شۆڤێنیەکانی تورکـــــەوە ، ئەوانەی دەڵێن کوردلەتورکیادانیە ،بۆیە کێشەی کوردیش بوونی نیە ،کەواتە ( حەمەدۆك ) پەلەێك تفە بەڕووی هەموو ڕەگەزپەرستانی جیهانـــــەوەو ئەمرۆ بێ یان سبەی گەلی کوردی تورکیا بەتەواوی مافەڕەواکانی چارەی خۆنووسین دەگات ....

١٩٩١/٧/١٢

لێرەدا شایانی باسکردنە کە لە ١٩٩١/٤/٢٠بەهۆی پەرەسەندنی شۆڕشی کوردستانی تورکیا بەتایبەتـی هێزی ( بەرەی پارت و هێزە سیاسیەکانی (تەڤگەر)ە وە بڕیاری حکوومەتی تورکی لەوەزارەتی ( مسعود یەڵماز ) و سەرۆکایەتی ( تورگوت ئۆزال ) ەوە ، دەرچوو سەبارەت بەلابردنی یاسای قەدەغەکردنـــی زمانی کوردی ساڵي ١٩٢٧ و لابردنی گەمـــــارۆی ڕۆشنبیری لەسەر کەلەپورو گورانی کوردیهەروەها پەرەسەندنی شۆڕشی کوردستانی عێراق و ئازادکردنی نیوەی کوردستان و باهۆزی دیموکراتیەت و مافـــی مرۆڤ وای لەوەزارەتی ( سلێمان دیمریـــــل )و ( ئەردال ئەنینۆ ) کرد کە لەمانگي کانونـــــی یەکەمي ( ١٩٩١) دا بەڕەسمي دانابەبوونی گەلـــی کوردا لەتورکیاو ئامادەیی دەربڕێ بۆ دانــــی هەموو مافە نەتەوەییەکانی گەلەکەمان ،چکە لــە مافي جیابوونەوە .

سەرچاوەکـــان :ـ


١ـ عەبدوڵلا حەسەن زادە ،حەمەدۆك ،هەردووبەرگـە کوردیەکـــەی .

٢ـ د. صلاح سعدالله ،المسالە الکردیە في ترکیـا مرحلە جدیدە ،بغداد ١٩٩١ .

٣ـ ئیرگەی دەنگی گەلي کوردستان .


تێبینـــی :

ب = بەرگ

ل = لاپـــەرە

«من حەز لە بەرهەمەکانی همینگوای دەکەم. بەلام فاکنەر زیتر «روشنایی لە ئاب»ی ئەو بەرهەمینەکە لەرادەبەدەر. کە سایەتی ژنەکەمنجە بلردارەکە (حامل) فەراموش ناکری. لە سەفەری ئەو لە «ئالابامەوە بۆ «تنسی» خوێنەرێکی کە ئەمریکای نەدیوە بەراحەتی دەتوانێ شتێ لە بێ کەناری و جەوهەری ئەو سەرزەمینە دەرکبکا.»

پاسترناک



# ویلیام فاکنەر ژیان و بەرهەم

وەرگێرانی / دانا سەعید سوفی

١٨٩٧ـ «ولیام فاکنەر» لە ٢٥ی سیبتیمبەر ئەو ساڵە لە (نیو ئالبانی)

ـ ویلایەتی (می سی سی پی) هاتە سەر دنیا. دایك و باوکی چوار کوریان هەبو ئەو بەتەمەنترینیان بو. هێشتا چەند ساڵێك بەسەر تەمەنیدا تێنەپەری بو کە خێزانەکەیان لە(نیو ئالبانی)یەوە بۆ (ئاکسفور) (می سی سی پی) گواستیانەوەو لە هامان شار بو کە خوێندنە بەراییەکانی. بەبێ تەواوکردنی ئامادەیی ئەنجام دا.

١٩١٤ـ لەگەڵ دەسپێکی جەنگی یەکەمی جیهانی سکاڵای پەیوەندی بەسوپای ئەمریکا پێشکەش کرد. بەلام چون سکاڵاکەی رەتکرایەوە بە هێزی ئاسمانی کەنەدا وە پەیوەست بوو ماوەیەکی لە جەنگ دا بەسەر برد. دوای جەنگ چوە زانکۆی (می سی سی پی). بەخاتری ئەوەی کە لە جەنگ دا بەشداری کرد بو بەبێ هەبونی دیپلۆمی ئامادەیی دەیتوانی بچێتە زانکۆوە. زانکۆش چنگی لە دڵی نەداو هەرزورەهای کردو بۆ (نیونوولیان) رۆیشت. لە وشارەدا لە ساڵی (١٩١٤) ئاشنای

«فیل نیستون» بو ـ پاشان بوە نزیکترین دوستەکانی ـ کە لە زانکۆکانی (می سی سی پی) و(ییل)دا دەرچوبو. «نیستون» کاریگەریەکی شایستەی لە ژیانی ئەدەبی فاکنەردا هەبومو بەهاندانیوی بو کە فاکنەر روی بەلای شیعر داوەرگێرا. فاکنەر ماوەی چوار ساڵ لە نیونورلیان ژیا. لەگەڵ ئەوەی بۆ گوزەرانی ژیان بە چەند کارێکی جیا جیا. لەوانە دەرکەوانی، دارتاشی، رۆژ نامەنوسی،... خەریك بو بەلام کاری ئەسڵیوی هۆنینەوەی شیعربو کە زۆر بەیان لە گوفارەکانی ٣٢٣٢٣٣ و Doule Dealer, New Mississp ian چاپ بوون. ساڵی ١٩١٨ بۆیەکەمجار ئاشنای خانم ئیلیزابیت پرال بو ولەری ئەوەوە «شرورد ئەندرسن»ی ناسی ـ خانم پرال پاشان شوی بە ئەندرسن کرد ـ ئەندرسن کارێکی مەزنی لەسەر ژیانی ئەدەبی فاکنەرو گۆرانی بیری فاکنەر هەبومو بە هاندانیوی بوە کە بەلای چیروکنوس داچور هەم بە هیمەتی وی بوو کە یەکەمین کارەکانی فاکنەر، بلاوکرانەوە. بێجگە «ئەندرسن»، کاریگەری «دوس پاسوس»، «هاکسلی»، «جویس» بەچاکی لە کارەکانی

فاکنەردا دەبینریت (فاکنەر پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ «جویس» هەبو).

١٩٢٤ـ بڵاوبونەوەی کۆمەڵە شیعری بەناوی (خوای مەرمەڕین) کە شیعرە یەکەمینەکانی فاکنەر لە خۆدەگریت. ئەم کۆمەڵە شیعرە بەهیمەتی «فیل ئیستون»، کە فاکنەر لە تەمەنی حەڤدە ساڵیەوە ئاشنای بوەو لە ژیانی ئەدەبیشدا کاریگەریەکی فراوانی بە سەریەوە هەبوە، بڵاوکرایەوە.

١٩٢٦ـ (پاداشی سەرباز) بەیەکەمین رۆمانی فاکنەر دەژمێردریت بەهۆی هیمەتی «شروود ئەندرسن» و «ئیلیزابیت پرال» بڵاوکرایەوە. ئەورۆمانە لە ئەزمونەکان فاکنەر لە جەنگ دا مایەی گرتوە، رافەی ئازارو دەربری باری سەربازێکی بریندارە (دونالد ماهون) کە لە جەنگەوە بۆ ماڵەکەی لە (جورجیا) دەگەڕێتەوە. بابەتی کتێبەکە بەتەرزێکی سەیر رۆمانی هیولا Monster بەرهەمی «ئیستفن کرین» بەیاد دێنێتەوە، پەیوەندی فاکنەر لەگەل شتە نا ئاساییەکان نیشان دەدات.

١٩٢٧ـ بڵاوبونەوەی رۆمانی (پێشکەکان). لەوکتێبەدا کە رۆمانێکی گاڵتەئامێز، دەربارەی (نیونۆرلیان) و خەڵکەکەی. فاکنەر لە هەر جۆرە پێشنیازو پیلان، پێچاوپێچی، وترس رایکردوە (بەدژی «پاداشی سەرباز» کە هەمو ئەمانەی لە خۆگرتوە) وروی لە گاڵتەکردوە. ئەورۆمانەش بەگوتەی «ئەندرسن» بڵاو بوتەوە.

١٩٢٩ـ (سارتوریس). لەو رۆمانەدا باس لە لێکۆڵینەوەی باری کۆمەلایەتی دەوروبەری (می سی سی پی) وخانەوادەی (سارتوریس)مکان دەکات بۆ یەکەمین جار سەرزەمینە خەیالیەکەی بە ناوی (یوکنا پاتاڤا) و پایتەختەکەی جیفرسن دەئافرێنێت. ئەو سەر زەمینە خەیالیەکە هەتاپیوانە، ژمارەی دانیشتوان، نەخشەکەی لەلایەن نوسەرەوە ئامادەکراوە (پیوانە ..٢٤میل چوارگۆشە، دانیشتوان: سپی ٦٢٩٨و رەش: ٩٣١٣ کەس) سەیری نەخشەکەبکە ـ ماوەی چواردە ساڵ هزری فاکنەر داگیرکردو نۆرۆمان وزۆربەی چیرۆکە کورتەکانی بەهاگان سەرزەمین دا تێدەپەرن.

١٩٢٩ـ (تورەیی و هەراو هۆریا). ئەو رۆمانە بە باوەری هەندێ لە رەخنەگران بە باشترین بەرهەمی فاکنەر دەژمێردرێت لە ساڵی ١٩٥٠ خەلاتی نوبڵی ئەدەبی پێ وەرگرت. فاکنەر ناونیشانی ئەورۆمانەی لەورستەیەی شکسپیرەوە وەرگرتوە: «ژیان ئەفسانەیەکە کە لە زمانی شێتێکەوە بگوازرێتەوە، کەپل لە هەراو هۆریاو تورەیی کە هیچ واتایەکی نیە ـ ماکبێث، پەردەی پێنجەم، دیمەنی پێنجەم». «تورەیی وهەراو هۆریا» رۆخانی خێزانە ئەشرافێکی (کامپسون) لە دیدگای سێ براوە (بنجی، کۆنیتن، وجیسن) نیشان دەدات.
یەکێ لەو مەسەلانەی کەچەند باسێکی فراوانێ لەبارەی ئەم کتێبەوە لەگەڵ خۆیدا هێناوە مەسەلەی «زەمەن بەندی»یە لە رۆماندا کە فاکنەر بەدواهاتنی زەمەنی لێک داوە.
ژان پۆل سارتەر لەوبارەیەوە دەڵێ: «فاکنەر لە رۆمانەکەی پێشینی خۆی ـ سارتوریس ـ هەمیشە رودوامەکانی ئەوکاتە رافە دەکات کە بە ئەنجام گەیشتبن لە ـ تورەیی و هەراو هۆریا ـ دا هەموشتێ لە پشتی شانۆدا تێدەپەرێت: هیچ شتێ رێناکەوێت، بەڵکە هەموشتێ رێکەوتوە. لێرەوەیەکە دەتوانین ئەو رستە سەیرەی یەکێ لە پاڵەوانەکانی کتێبە کە بدۆزینەوە. «من نیم، بەڵکە بووم». (ژان پۆل سارتەر ـ رۆمان لە روانگەی فاکنەرەوە).
«تورەیی و هەراو هۆریا» لە پێش کتێبی «سارتوریس» نوسرابو بەلام فاکنەر شەش مانگ پاشئەمە بڵاوی کردەوە.
١٩٢٩ـ لە ئۆکتۆبەری ئەو ساڵە فاکنەر، خانم «ئیستل ئۆلد هام»ی خواست. بەرهەمی ئەو پەیوەندیە دو کچ بو کە یەکێک لەوانە ماوەیەک پاش بونی کۆچی کرد.
١٩٣٠ـ (وا رادەکشێم تا بمرم) چیرۆکی مەرگ و مەراسیمی ناشتنی «ئیدی باندرون»ە کەلە دەرپەچەی چاوی مێردو منداڵەکانی «بەشێوەیەکی تاک گۆیی» دەگێردرێتەوە «ئیدی» بەلێنی لە مێردەکەی «ئەنس» وەرگرتوە کە کاتێ مرد بیبەنە (جیفرسۆن) لەتەک قەومۆقیلەی خۆیدا بەخاکی بسپێرن. لە سەر ئەو بنچینەیە رۆمانەکە باسی سەفرکردنیان بۆ «جیفرسون» وبەخاکێ سپاردنی «باندرون» دەکات. رۆمانەکە لە شێنست بەش پێکهاتوەو تێکرا ئاشنای پانزە کاراکتەر دەبین(حەفت کە سیان ئەندامانی خێزانی باندرونن وباقیەکەشی دەوروبەرەکەین) فاکنەر ئەورمانەی لە نیوەی دومی ساڵی ١٩٢٩، کە لە کارخانەی کارەبایی شوێتی شەوانە کاری دەکرد،

لە بەینی نیوەی شەو تا چواری بەیانی لە ماوەی شەش هەفتدا

کۆتایی پێ هێنا«نیدی باندرون» کە کەسێتی رەسەن و چەقی رۆمانەکەیە شایەدی دروسبونی تا بوتەکەی‌و بزمارکوتەکەیەتی.

١٩٣١ـ «پەناگە» یان«میحراب» رەگەزی توندخویی لەو رۆمانـەدا زیتـر لەگشت بەرهەمەکانی فاکنەر بەکارهێنراوە. لەوانـەیە لەبەر ئەو هۆیەبێ کە بەپێی گوتەی خودی «نوسەر» ئامانجی سەرەکی لە نوسینی ئەم رۆمانەدا وروژاندنی خوێنەرەکانی بوە. بەلام بە پێچەوانەی مەزەندەی خودی فاکنەر کە بەگشتی دەیویست بەرهەمێکی هەژێنەرو گشتپەسند بنوسێ، ئەم کتێبە بوە هۆی ئەوەی رەخنەگرەکانیش پێشوازی بکەن و پتر لەیەك میلۆن دانەی لێ فرۆشرا. تەوەرەی سەرەکی رۆمانەکە لە سەر پەیوەندی نێوان پوپی(مرۆڤێکی نزم، کورێکی مانشکێنی پیشـەیی کە تەنیا بیر لە پارە دەکاتەوە)و تمپل دریك (ژنێکی باشورکە سادەیەو ناپاك نیە) پێکهاتوە. هەندێ لە رەخنەگران (لەوانە مالکوم کولی) پوپی بەروخساری شارانشینێ و«باکور» سنعـەتی دەزانن کە«باشور»ی بێ کەلك و لاواز دەخاتە ژێر تەجـاوزەوە(پـوپی کەلەروی سێکسیەوە پیاوێکی ناتەوانە بە لکـەگـەنمەشامی تەجاوز بە«تمپل دریك»دەکات). کۆمپانیای پارامـونت لە سالی١٩٥٤ فلیمێکی لەو کتێبە بەناوی«چیرۆکی تمپل دریك» دروست کردوە.

١٩٣١ـ (ئـەو سیـزدەیـە)ـ یەکـەمـین کۆمـەلەی کورتـە چیرۆکەکانی فاکنەرە «سیزدە چیرۆك» کەبە چاپ دەگەیەنرێت.

١٩٣٢ـ لەم سالەدا فاکنەر بۆبە دەستهێنانی پارەو بەرێوە بردنی ژیان دەچێتە هۆلیودو دەستدەکات بە سینارێو نوسین. ئەم کارە لەو دەیەوە دەیەی دوای(١٩٤٠) بە شێوەیەکی بەدوای یەکدا بەردەوامی هەبـوە. ئەو سینـاریـۆیەی کە لە رۆمانی «هەبون نەبون»ی هەمەنگوای وەرگیراوە بەرهەمی ئەوە.

١٩٣٢ـ لەو سالەدا دوکـۆمـەلە شیـعـری بەنـاو نیشانی«ئەورەمینە» و«ناگرگالە نێویەك کولیو»ی بلاوە دەبێتەوە. لەو شیعـرانـەدا کاریگـەری ئەلیـوت بەتـایبەتی شیعرەکانی پێشوی«وێرانەخاك» و«کامینز» دەبینرێت. لە کۆمەلەی«ناگری لە نێویەك کولیو» دا شیعرێکی هەمەنگوای لە گەل شیعرەکانی فاکنەر چاپ کراون.

١٩٣٢ـ «بەتالی لە مانگی ئاب»، ئەم رۆمانە بەو ناونیشانەش وەرگێردراوە«رۆشنـایی‌لە مانگی ئاب». باوەری یەکەم لەوەوە راستـەکـە لە بارەی زانین گا دروست دێتە بەرچاو چونکە لە رۆمانەکە ئامازە بۆ ناوسبونی لینا گروف(هەمان ژنی کە بەدوای باوکی منالەکەی دەگەرێت و نوکای هەیە).

فاکنەر لەرۆمانەدا باس لە لێکۆلینەوەی مەسەلەی نەژادی‌و بەیـەك گەیشتنی سپی پێستـان ورەش پێستـان دەکـات. مەسەلەی نەژادی لەو رۆمانەیدا پترلە گشت بەرهەمەکانی دی چەقکـربـوەو کەوتـوتـە بەر قولترین لایەنی هەلسەنگاندنەوە. چربـونـەوەی زۆر لەو رۆمانەدا لە سەر ژیانی«جوکریسمس» دایە(کە لەیەتیمخانەیەك دەژیەت و لەبەر ئەوەی شەوی جەژنی کریسمس لەیـەتیمخـانـەی دەردە هێنن نازنـاوی کریسمس لەسـەر دادەنـێن)ـ کە قوربـانی پارچـە پارچـەو بێ بەش بونی«باشور»یەـ و«لینا گروف» کە ئاوێکی حەرامی لە زگ دایە وبەدوای باوکی منالەکە دەگەرێت. «جو» و«لینا» بەیەك دەگەن وبـەهـاوکـاری یەك دژیـەکـان ولاوازیـەکـانی کۆمـەلگـای داماوی«باشور» دەبینن.

١٩٣٣ـ لقێکی سەوزـ گرنگترین ولێراوترین کۆمەلە شیعری فاکنەرە کەچاپ دەکرێت. شیعرەکانی ئەم کۆمەلەیە پێشتر لە گوڤاری Doube Dealr بلاوکرابونەوە.

ـ ئەم کۆمـەلە شیعـرە (بەناونیشانی Lerameau Vert بۆ سەر زمانی فەرەنسی وەرگێردراوە.

١٩٣٣ـ میس زیلفیـاگـانتـ کۆمـەلە کورتە چیرۆکێکی دی فاکنەرە کەرودا وەکانی بەشاری «یوکناپاتافا»دا تێدەپەرێت. ئەو کۆمەلەیە لەبەر هۆیەك دیاریکراونیە بلاو بونەوەی کشتێ نەدیوە بەلکە بە شێوەیەکی تایبەت لە چەند نوسخەیەك دا بلاوبوتەوە.

١٩٣٤ـ «دکتـۆر مارتینـو وچـەنـد چیرۆکێکی‌دی» کۆمەلە چیرۆکێکی کورتە.

١٩٣٥ـ «قـولەی چاودێـری» رۆمـانێکی بەرێژەیەك کورتە ژیانی شوفێرێکی فرۆکە بە ناوی «شۆمان» لە خۆی دەگرێت کە گەل ژنـەکەی «لاورن»و چەتربازێك دەژێت. «لاورن» و«جاك» یەکدیان خۆشدەوێت ودور لە چاوی «شومان»ە وەپێك دەگەن. «لاورن» لە «جاك»ە وەئاوس دەبێ‌و «شومان» کەرچی دەزانێ کە باوکی منالەکەنیە. بەلام بەخاتری پەیوەندی بەژنەکەی لە پێشبـرکێـیـەکی ترسنـاك دا بەشداری دەکات تاکو بەلکە لە پارەی دەسکـەوتەکەی بتوانێت خەرجی زانی ژنەکەی بدات.

پێشبڕکێی نمایشێکی ئاسمانیە کە بە بۆنەی کردنەوەی فڕۆکەخانەی ناوخۆی نیوئۆرلیان ڕێکخراوە. «شومان» لەگەڵ پێزانینی بەوەی کە ئەو پێشبڕکێیە بە نرخی گیانی ئەو تەواو دەبێ تیایدا بەشداری دەکات و لە دواییدا گیان خۆی لە سەر دادەنێت. ئەو ڕۆمانە پەخشانێکی یەکجار سەنگین و(دەسکرد)ی هەیەو ئامانجی سەرەکی فاکنەر لەوەدا ئەوەبوە کە زمانی ڕۆمان لە شیعر نزیك بکاتەوە. لە ڕوانگەی بابەتەوە بۆ چەمکەیەکەمینیەکانی ڕۆمانەکانی«سەر بازو برینەکەی» دەگەڕێتەوە.

١٩٣٦ـ «ئیبسالوم: ئیبسالوم» چیرۆکی ژیان و ئارەزوەکانی (توماس ساپێن) سپی پێستێکی تازە پێگەیشتوەکە ئاواتی بەرەزە فرانەی هەیە. چیرۆکەکە بە شاری«جیفرسن»و سەرەتای سەدەی نۆزدەم داتیدەپەڕێت. لە سەرەتا ڕۆمانەکە ئاشنای خێزانی توماس ساپێن دەبین. باوکی جوتیارێکی هەژارە کە تاکو پێش کۆچ کردنیان بۆ«می سی سی پی» لە ڤێرجینا خەریکی کشتوکاڵ کردنە .«توماس ساپێن» ڕۆژێك بۆ گەیاندنی پەیامی بۆلای دەرگای خانوی ماڵی خاوەن کێڵگەکەدەڕوان: لە بەر دەرگاوە بە هۆی کوڕێکی ڕەش پێستەوە سوکایەتی پێدەکرێ‌و ڕاودەنرێ.«توماس» کە بەجۆرە بچوك بوتەوە بیر دەکاتەوە تا خۆی لەو فەلاکەتیە ڕزگاربکات. ببێتە خاوەنداریکی گەورە. گەرچی هەندێ لە پلانەکان جێبەجێ دەکات بەڵام یەکێ لە ئارەزوەکانی کە هاوردنی منداڵی نێرینەیە لە خۆی، جێبەجێ نابێ و بەناکامی دەمێنێتەوە. ئیبسالوم خۆی ناوێکی تایبەت و یەکێ لە کوڕەکانی حەزرەتی داودە کە لە دژی باوکی شۆڕش دەکاو دەکوژرێ.

١٩٣٨ـ «ڕامبونی ئابەدڵ» حەفت چیرۆکی کورتە دەربارەی خێزانی«سارتورس» گەرچی چیرۆکەکان هەریەکەو فۆرمی تایبەتی خۆی هەیە بەڵام ڕوە هاوبەشەکەیان ڕاوی«کوڕێك بە ناوی بایارد- ساتوریس» وبابەتی «بنەماڵەی ساتوریس» هاوبەشن.

١٩٣٩ـ «دارخورما کێویەکان» ئەو ڕۆمانە لە دوبەشی پێکەوە پەیوەست پێکهاتوە«دار خورما کێویەکان» و«پیرە مێرد». دارخورما کێویەکان لەوڕۆمانەی فاکنەرە کە ڕوداوەکانی بەشاری«یوکنوپاتاڤا»دا گوزەرناکەن. بابەتی ئەم ڕۆمانە سەر هاتی پزیشکێکە بە ناوی «هاری ویلبورن» وئەڤیندارەکەی«شارلوت» کە لە جەنجاڵی و ترسی شارێکی وەك (شیکاگو) ڕادەکەن بەڵام لەزیندان یەکەی دەبینەوە. ڕۆمانەکە کە لە چەند بەشێکی جیا جیا بەڵام پێکەوە پەیوەست پێکهاتوە.

١٩٤٠ـ «هاملت». کۆمەڵەیەکە لە شەش چیرۆکی کورت کە باور پانتاکەیان(وەتا لە هەندێ بواری کاراکتەری هاوبەش) زۆر لێك نزیکە.

ئەم چیرۆکانە بەزۆری دەربارەی ئەشو نماو بە توانا کەیینی خێزانی«ئەسینۆپس»ن ویەك دوای یەك لەوانە پێك دێت«گەدای بەدوای ئەسپێکدا». (سەگ شکاری». «ئەسپە خاڵدارەکان». «مارمولکەیێ لە حەوشی خانوی جەمشید». «عەمبارێکی سوتاو». کوڵێنکی سور بۆ ئیمیل».

١٩٤٢ـ «موسادابەزە» ئەم کۆمەڵەیە حەفت کورتە چیرۆکی لە خۆی گرتوە کە ئەمانەن «واز- Was». «ئاگرومەقەلیەکان». «جلی کاری ڕەش». پیرەکان». «ورچ». «دەلتای پایز». «موسادابەزە».

١٩٤٨ـ «بیباکێ لە غوباردا». ئەو ڕۆمانە سەر هاتی «بوشان» پیاوێکی ڕەش پێستە کە بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ کەوتوتە داوی تاوانباییەوە. هاوێشتویانەتە ناو زیندان و گەرەکیانە سزای بدەن. بەڵام بە هاوکاری کوڕێك و پیرێژنێکی سپی پێستەوە(یەکەمجاربە خاتری پەیوەندی عاتفی لەگەڵ تاوانبارەکەو دوەم بەخاتری بیری مرۆ خوازانەی) لە مەرگ قوتاری دەبێ.

١٩٤٩ـ Knight Gambit ـ لە پێنج چیرۆکی کورت و ڕۆمانێکی کورت پێکهاتوە.

چیرۆکەکان هەمویان بابەتی پۆلیسین و «گوین ئیستبونس»ـ پۆلیس پاراستن. پۆلیس زانیاری کۆ کردنەوەـ کاراکتەرێکی هاوبەشی هەمو ئەو چیرۆکانەیە. ڕەخنەگران ئەم کۆمەڵەیان بە لاوازترین کارەکانی فاکنەر داناوە. دیارە فاکنەر ئەزمونی سەرکەوتنی لە چیرۆکەکانی دانەبوا لە بەکارهێنانی تەکنیکی «چیرۆکی پۆلیس». بەوە پێنج چیرۆکەکە بەدوای یەکدا ئەمانەن: «دوکەڵ». «ڕاهبە». «دەستەکان لە سەر ئاوە. بەیانی». «هەڵەیەك لە کیمیا». لە گەڵ ڕۆمانە کورتەکە بەناونیشانی سەرەوە.

.١٩٥- «كۆمەڵەی چیرۆكەكان». چل ویەك چیرۆكی كورتە(پێویستە ئەوەش بڵێن كە ئەم كۆمەڵەیە گشت چیرۆكە كورتەكانی فاكنەر لە خۆناگرێت.فاكنەر بەدرێژایی ژیانی نۆزدە رۆمان ئەوە دو چوار. كورتە چیرۆكی نوسیوە).

.١٩٥- وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ ئەدەبی.

١٩٥١- «مەراسیمی راهبەیەك» دەتوانین ئەم بەرهەمە بەدرێژبونەوەی رۆمانی «پەناگە»ی حسێب بكەین. روداوەكانی ئەم رۆمانە كە بە شێتخانەیەك لە «جیفرسن»دا رادەبورێ. لەراستیدا پرسەنامەی دیماهی ژیانی «تمپل دریك»ە (هەمان ژنی كەله رۆمانی «پەناگە» دا لەلایەن «جۆكریسمس»ەوە تەجاوزی لە سەر دەكرێت) لە(مەراسیمی راهبەیەك دا فاكنەر مێژوچەی كامل شارە خەیالیەكەی یوكنایاتافا نیشان دەدات.

لەو بەر هەمەدا چەمكەكانی وەك «عەدالەت»، «تاوان پاداشەكان»- كە چەند ساڵێ هزریان داگیر كردبو- بەتەرزێكی نوێ دا دەرێژێت ئەو رۆمانە شانۆ نامەیەكی لەگەڵ دایە كە لە راستی دا بە بەشێك لە رۆمانەكە دەژمێدرێت و گشت دا نهێنانەكانی «تمپل دریك» بەرامبەر«گوین نیستیونس» نمایش دەكات(كەسێكی كە چەندبار لە رۆمانە جیا جیاكانی فاكنەر دەركەوتوەو ئەمجارەشیان لە رۆڵی نوێنەرێكی دادگاییە) لەبەر ئەوەی زۆران پێیانوایە ناتوانرێ ئەوبەر هەمەبە «شانۆنامە» دابنرێت. بەشكو فاكنەر ویستویە لە تەكنیكی شانۆنامە نوس دا سودوەرگرێ بۆرۆمان(وادەبینرێ ئەزمونێكی سەر كەوتونەبوە).

١٩٥٤- «ئەفسانەیەك» روداوەكانی ئەم رۆمانە چەند مانگێك پێش كۆتایی جەنگی جیهان یەكەم و بەفەرەنسا دا تێدەپەرێت. لەو رۆمانەدا ویستویە«مەسیحی دیسان لە خاچ دراو» بخوڵقێنێت. ئەمجارەیان مەسیحی دیسان لە خاچ دراو سەردەستە پەكە فەرنسایی بەناوی «كورپوران». كە تێپێكی فەرەنسی رادەگرێت تا دەستورەكانی فەرماندەكەیان هێرش بردنە سەر ئەڵمانەكان جێبەجێ نەكەن. كرۆكی ئەم رۆمانە پەیوەندی «كورپوران»و ژەنەراڵێكی فەرنسیە پاشان دەردەكەوێت كە باوكی «كورپوران» خۆیەتی. «كورپوران» لەلایەن باوكیەوە دادگاییو بەمەرگ مەحكوم دەكرێت. دوایی

وەك سەر بازێكی گومناو بەخاك دەسپێدرێت. بەشێكی ئەم كتێبە (ل ١٨٩- ١٥١) پێشتر بەناوی «دەربارەی ئەسپێكی دز» بڵاوكرابۆوە.

١٩٥٥- «جەنگەلی گەورە» كۆمەڵەی چوار چیرۆكی كورتە كە تەواوی بابەتەكانیان لە بارەی راو وسروشتەوەیە. لەم چیرۆكانە پێك دێن «وودچ» راوی ودچ». «كیبەركێی بەیانیان». «پیرەكان».

١٩٥٦- «نەخشەكانی نیوئورلیان». كۆمەڵەی یازدە «پێشنیاز» نەخشە دانانی كورتە لە بارەی نیوئورلیان كە بەهۆی «كارل كولنز»ەوە رێكخراوە وچاپكراوە. یەك لەو نەخشانە «قەلەمرەوی خودا»یە.

١٩٥٧- «شار» دو چیرۆكی لە خۆگرتوە «پەیكەری برنجی» و«هێستری لە حەوشەدا».

هەر دو چیرۆكەكە بەتواناگهیینی بنەماڵەی «ئەسنوپس» نیشان دەدەن.

١٩٥٨/- «سێ رۆمانی كورتی بەناوبانگ» ئەو سێ رۆمانە كورتە ئەمانەن «ئەسپە خاڵدارەكان». «ورچ». «پیرەمێرد».

١٩٥٨- «كۆمەڵەی چیرۆكەكانی ولیام فاكنەر». كۆمەڵەیەكی سێ برگیە لە چیرۆكەكانی فاكنەرو بەوشێوەیە! بەرگی یەكەم«مام ویلێ وچەند چیرۆكێكی دی» بەرگی دوەم «ئەو سێزدەیە» بەرگی سێیەم«دكتۆر مارتینۆو چەند چیرۆكێكی دی».

١٩٥٩ the Mansion فاكنەر سێ چیرۆكی دەربارەی خێزانی «ئەسنوپس» (ئەو جوتیارە بار ناوەندیانەی كە لە فەرەنساوە بۆ «نیوئورلیان» دێن و لەگەڵ هەوڵ و كۆششی سەختیان بەرەبەرە دەچنە نێوەڵبەندی پلانگێری ئابوریوورامیاری ناوچەكەوە) نوسیوە كە بە «نیسنوپسەكانی سیانە» ناسراوە. ئەم سێ چیرۆكانە ئەمانەن «شار». «خانوی خشتی»و «هاملت». كرۆكی سەرەكی هەرسێ چیرۆك ژیانی «مینك نیسنوپس» پێكی دەهێنێت. لە «خانوی خشتی» لە گەڵ روداوی كوشتنی «هیوستون» لەلایەن «مینك نیسنوپس»ەوە، دەسگیركردن و دادگایی كردنەكەی ئاشنا دەبین. پێویستە بڵێن كە لە «هاملیت»دا مێژوچەی ژیانی «مینك نیسنوپس»و راڤەی كوشتنی «هیوستون» دوبارە دەبێتەوەو لە«خانوی خشتی»دا

هەمان روداوەکان (بەتایبەت لە بەشی سەرەتای رۆمانەکەدا) لە خاڵی بینین «مینك ئیسنوپس» ەوە (کە ئێستا بەزیندانی هەتایی مەحکوم کراوە) دەبینرێت.

١٩٥٩ـ «فاکنەر لە زانکۆدا» ساڵەکانی ٨ـ ١٩٥٧ لە سەر داوەتی زانکۆی ڤیرجینیا لەوێ گوزەراندویە. لەوماوەدا چەند موحازەرەیەکی ئازادو چەند کۆنفراسێکی بۆ خوێندکاران رێکخستوەو باسی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیات و بەتایبەتی بەرهەم و شێوەی نوسینی خۆی کردوە. ئەم کتێبەکە ئەودیدارانەی لە خۆگرتوە لەلایەن «فردریك گوین» و «جوزف بلانتر» کۆکراونەتەوە.

١٩٦٢ـ «شیعرە بەراییەکان» کۆمەڵەیەکە لە شیعرە بەراییەکانی فاکنەر زۆربەی ئەو شیعرانە پێشتر لە کۆمەڵە شیعرەکانی دی چاپ کرابون. ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن «کارول کالینز» هەڵبژێردراوە.

١٩٦٢ـ «تالانکەران» ئەم رۆمانە کە دوایین رۆمانی فاکنەرە ماوەیەکی کەم پێش مردنی بڵاوبوەوە. راڤەی غەمی غوربەتێکی جلەوشێشە کە لە بارەی سەردەمی منالیەوە نوسیویەتی. راوی رۆمانەکە شیشێکە بەناوی «لوسیوس» کە هەموو بە «لوش» بانگی دەکەن. لە ساڵی ١٩٦١ دا چیرۆکی ژیانی خۆی، کاتێك کە یازدە ساڵەبوە، بۆ ئەوەکەی تاریف دەکات. پاڵەوانەکانی ئەم رۆمانە چەند ئادەمیزاێکی ئاشنان و زۆر لەوان پێشتر لە کۆمەڵە کورتە چیرۆکی «ئەو سێزدەیە» ناسراون. ئەو رۆمانە لە ساڵی ١٩٦٢ خەلاتی «پولیتزەر»ی بەدەستهێنا.

١٩٦٢ـ «هەڵبژاردەی کورتە چیرۆکەکان» کۆمەڵەی سێزدە چیرۆکی کورتە کە کەمێك پاش مردنی فاکنەر بڵاوبوەوە. تەواوی ئەو چیرۆکانە پێشتر لە کۆمەڵە کورتە چیرۆکەکانیدا بڵاوببونەوە.

١٩٦٢ـ وسەر ئەنجام لە شەشی جولەی ئەو ساڵەدا «ولیام فاکنەر» لە شاری «ئاکسفورد» لەتەمەنی شێست وپێنج ساڵەیی بە هۆی وەستانی دڵەوە کۆچی کردو لە هامان شوێن بەخاك سپێردرا

سەرچاوە
غروب از خورشید مجموعه داستان ویلیام فاکنر ترجمه احمد اخوت

# مەچەك و تەڵەی پێنج پەنجە

عەتا نهایی

سەد ساڵی دیکەش بمرێ بەو خورپەو داچڵەکانە دەمرێ ! لە کۆمی خەیالاتیدا بوو ئەوەی کە لە شاخ و رەقەن و هەڵدێر دەیهاراست. نیگا نەبوو. نیگابەو دیمەنە ئەفسووناویەوە. بەباخی روخساری جوانی وە شەتل بوو تەنانەت گوێچکەشی. سەر سەراپێك بوو کە لە هەندا هاژەی شەماڵ و خورەی قەڵبەزەکەی ئەنیشتی و جورکە جورکی مەلی بچووکی سەر لق و پۆپی دارەکان. دەرکەی کاڵە درابوو. تەنیا زایەڵەی دەنگە ئاسمانیەکەی جوانی بوو کە پێی دا دەهات و دەچوو.

•ـ مادام پێم بکاتە نێو ماڵت. ژیانێکت بۆ سازدەکەم. ساڵی بە سەعاتێك لێت رابری..... بزە شیرینەکەی بەرووی دیمەنە بەهاریەکەی ئەو شیوو دۆڵەوە نەبوو. بابڵێین ئاگای لەو دیمەنەش نەبوو. بەدەم وەڵامەکەی خۆیەوە بۆ جوانی دەخنایەوە. + جاکەواتە بڵێ (٤٠ - ٣٠) سەعات لە گەڵتدا دەژیم.

ـ جا بۆ ٤٠ - ٣٠ سەعات ژیان بە کامەرانی خۆشترە، یان سەدان ساڵ بە نامرادی، لەو چولگەدا. لەسەر سنگی ئەو شیوو دۆڵ و شاخ و داخە، بیرەوەری ئەو گفت خۆشیەو ئاقڵ و بەناوەریەی جوانی دری بەترس و تەبیایی دەدا کوا ترس لە هەندا ئەو بیرەوەریانە توانای سەر بزێوی هەیە؟ پیاوی بە تەما بۆ تەنیایە؟ مەگەر لەمە پێتر جوانی بست بەبستی رێگەکەی لەتەکدا نە پێواوە؟

بۆ تا ئێرە رادەستی نەگرتوە؟ ئاخر ئەو بێ جوانی کوێرە.

سەرمەندمر ناکات. هەرکە بەرێ بوو هەستی بە هاورێیەتی جوانێ کرد. بەگوێی دا چپاندی: «زۆر حەز بەم سەفەرە ناکەم، بەڵام نابێنە دەستت...» ئەوسامە چەکی پێشکەش بە پەنجەکانی جوانێ کرد، ملی ڕێگەی گرت .. تا مەنزڵێکی باش گوێی لە هیچ پرسیارێك نەبوو. لەوە دوا دەنگە ئاسمانیەکە هاتە گوێ (باشە بۆ کوێ؟) بەدەم بزمیەکا کەواپرسی (هیلاك بوو جوانەکەم؟) دیسانەوە دەنگە ئاسمانیەکە گوتی «نا ... بەڵام حەز دەکەم بزانم ئەنجام کوێیە» ئەم شانی لە شانی هەڵسوو، نینیك لە گیانی گەڕا، بەگەشکەدارییەوە گوتی: «ئەنجام بە تۆگەیشتنە»

«- بۆ لە چۆڵگە و شاخ و دۆڵ؟»

ئەم بەدەستەکەی دیکەی هەردوو چاوی هەڵگلۆفت.

«+ کوا چۆڵگە جوانەکەم؟ بڕوانە هەموو شوێنێك، هەرتۆی ... هەموو دەنگێك هەر ئاوازی ئاسمانیتە...» ئیتر جوانێ لەو بابەتە نەدوا، ئەمیش هەڵیکوتایەمەیدانی ئەو دیمەنە شیرینە ... زریکەیەك بازنە زێڕینەکەی پساند، لە هەر چوار لاوە بوو، لە شاخە هەزار بە هەزارەکەی ئەو بەر شیوەکە، لەتەبارەکەی ئەم بەرەوە ... لەزاری دۆڵەکەی بەرامبەری و لە پشتەوە..

هەموویان پێکەوە ئەراندیان «ڕاوەستە زەلام؟» زریکە وەك تۆپەوانەیەك ئاراستەی دڵی کرا. پڕبەپڕی بوو، ڕایتەکاندو جێگیر بوو، ئەوسا بریقەیەك لە پشت بەردێکەوە پرچی نیگای گرت و ڕایکێشا. لەو چنگە گران بۆی دەرباز بوو. هەستی بە هەرەس هێنانی شاخەکە کرد. دۆڵ وەك ئەهەنگ زاری بۆ کردەوە. ئەو ساکشت ئەو دەنگانە کە تا ئێستا هەستی پێ نەکردبوون، لە گوێچکەی یاخی بوون، گوێچکەی پڕبوو لە هاژە هاژوو خورە خور .. نەیزانی چەندەی خایاند کە وە خۆی هاتەوە لەقەفەسی پرسیار دابوو.

-کێی؟

-ڕێبوارم.

-بۆ کوێ دەچی؟ شوێنی چی کەوتووی؟

-شوێنی کاسبی ..

-بۆ بە تەنیا؟ بۆلەم شیوو دۆڵە؟

بە هۆی ئەو پرسیارانەوە .. سیوای لە ڕاوچیەکانی بۆوە پشکۆی پرسیارێك لە کوانوی زاریدا گەشایەوە...

- ئەی ئێوە کێن؟

- وست بە ئەفام ئەوە تۆی کە گومان لێکراوی!

وشەی گومان، بۆ ژووری دیمەنێکی کۆنی ڕاگوێزا، ئەیانهێشت زۆری لێ وەمێنێ. بە قوناغە تفەنگێك لە لاکەلەکەیان کوتا لە ئان و ساتدا لە خۆی پرسی: «بڵێی ئەم دوو تفەنگچیە کێ بن؟ بڵێی بۆ سەر ڕێگەیان لێ گرتبێ؟» جوانێ بەلارە ملیەوە پێی گوت: «زۆر حەز بەم سەفەرە ناکەم ئەم پرسی: «بۆ جوانەکەم؟» جوانێ تنۆکی فرمێسکی گەشی هەڵوەراند: «دنیا شەڕو شۆرە. چاوکە، ئەوەی کە دەبارێ ئاگرو گوللەیە...»

ئەم دڵی دایەوە: «ئاگرو گوللە بۆ شەڕکەرو دوژمن دارە من لە کاسبی دەگەڕێم...»

جوانێ دیسانەوە ملی بەلارەوە ناو هیچی نەگوت. لەو ماوەیەدا دوو تفەنگچیەکە سرتەو چرتەیان بوو. ئەم نە دەیبینین، نە هیچی لێ دەبیستن بەڵام ئەوان چاویان لەم نەدە تروکاند.

دوای ماوەیەك، ئەمریان کرد:

«لەتەکماندا ڕێ کەوە»

-بۆ کوێ؟

-پرسیار مەکە!

-ئاخر بۆ؟

-تۆ گومان لێکراوی، هەر ئەوە ندەو هیچی دیکە....

پێنج پەنجەی سارد توند مەچەکی سوڕاویان گوشیبوو. ئەگەر دەرفەتی چاوپێداخشانێکی بۆ هەڵکەوتبایە، شوێنی پەنجەکانی وەك مارێکی قەف خواردوو، وەك چەند بازنەی ڕەش، بەمەچەکیەوە دەبینی ترس و سەرسامی بەربینگی پێگرتبوو. ڕێگەی پرسیاری بۆ نەهێشتبوو، نسێی شاخە هەزار بە هەزارەکە وەك مۆتەکە هەڵیکوتابوە سەر ڕۆحی تەنیا پرسیارێك کە لە قەفەسی مێشکیدا دەیجریواند ئەوەبوو: «بڵێی بۆ کوێم بەرن؟ بڵێی ئەمانە کێ بن؟»

ئەوان، دوو پیاوی کەلەگەتی پۆشتەو پەرداخ بوون، یەکیان بە تەمەن وەك باوکی ئەوی دیکەیان دەچوو، بەڵام بەتواناو هەڵس و کەوت دوو برابوون، دوو بەرازی بەهێز کە شفرەی نیگایان لەبەر پێیانەوە تا لووتکەی شاخەکانی دەکێلاو سەلا لە نوێ دەگەڕایەوە. یەکێ تفەنگێکی تازەی وەك بووکی سووریان بەشانەوە بوو.

تامـل قەتـار فیشـەکیان لە خۆ پێچابوو، پوزەوانەی مەرەزی سوریان هەڵکێشابوو، کلاشی هەورامی سوکیان لە پێ دابوو.
ئەوەندە کە رازاوەو توندو تۆل بوون، دوو ئەوەندە مرو مۆچ و بێدەنگ بوون، وەک دوو راوچی کە نێچیرێکیان هەبێ لە دالفەی بەشکردنیدا بوون سێ جووت پێ بەرەو پێش دەچوون و شاخ لەبـەریـان دەرەویـەوە، شێخـەڵەکـان چاویان بەو دیمەنەدا داپچڕیبوو، سێ جووت چاو لە سەرەتاتکێی چاوبازی دا بوون، سێ جووت چاوی ترساو جووتێکیان تووشی جوڵەیەکی شاخ و بەردو شێخـەڵ بوو، دوو جووت لە خشپەیەک سڵیان دەکرد. پەنجەی بە هۆی مەچەکی گوشراویەوە کەوتە مێروولە کردن، ئەو ئازارە بەرەو دیمەنێکی منداڵی بردەوە.
«ـ تۆ دەستم بەربدە، بۆ خۆم لەشەقامەکە دەپەڕیمەوە..
بەڵام دایکی بێمل نەدەبوو... تاقانە کوڕ بوو، وەجاخی شێخ و پیرانی ئەوی بەدایکی بەخشیبوو، کەواتە دەبوو وەک گلێنەی چاو پارێـز کاری لێ بکات. منداڵ کە پارێزکاری لێ نەکردری خۆی بە ئاوو ئاگر دەدات،
بەتـایبەتی سوارۆ، ماشەڵلا، دووربێ لە چاوو پیس و نەیار، منداڵێکی چەر بەزەو شەیتانە، مەکە، نازانێ، تازە گوێی دارو بەرد کەربێ شتێکی بەسـەربێ، چی وەڵامی باوکی بداتەوە؟
بەڵام سوارۆ تێدە کۆشا مەچەکی لەو بەندە رزگار بکات.
ـ تۆ دەستم بەربدە، بەخودا هەڵنایەم.
ـ واز بێنە کوڕم دەستت بابە دەستی دایکتەوە بێ.
ـ شەقـام هێنـدەش قەڵەبـالغ نەبوو، تاك و تەرا ئوتومۆبیلێك دەهات و یەکێکی دیکەدەچوو.
سوارۆ دەیزانی کە تا دەگەنەوە ماڵ دەبێ دیلی ئەو پەنجا نەبێ.
ئەوەی لێ روون بوو، بەڵام ئەو راستییە سەری تەسلیم بوونی پێ دانەدەنواند. هێڵی سپی ناوەراستی شەقامەکە نیگای راپێچ کرد، بردی.... تامەیدانەکەی ئەو بەر پردەکە... لەوێوە نیگای قوتار بوو بە تێل دار تەلەکاندا گەرایەوە، داشقەی حەماڵێك لە پانتۆڵەکەی خشکا. حەماڵ کردیە هاوار، پەنجەکان مەچەکیان راکێشا. گشت ئەندامی راپێچ بوو.
ئێشی مەچەکی هاواری لێ بەرزکردەوە..
ـ دەستم بەردە... دەی...
ئێستا توانای ئەو هاوارەشی نەبوو. دەیزانی سوود نابەخشێ.
بەسیلەی چاو لەدوور روانییە راو چییەکە. هیچ دیاردەیەکی خۆشحاڵی بەروخسارایانەوە دیار نەبوو، مرو مۆچ، کرو پێدەنگ.
بۆ هەوڵ چار بوو کە توێشـە بەرەی بە پشتێنیـانەوە دەدی کترییەکی رەش و دوو قروشکەش. ئەمەیان لە شوانە گاران دەچوو.
کەواتـە رەنگـە بۆ شیـوکـردن بۆ هیـچ ئاوەدانیـەک نەچن پرسیارەکەی پێشوو دیسانەوە لە مێشکی سوارۆ دارژایەوە:
«بڵێی کێبن؟ چ کارەبن؟ بۆ کوێیم بەرن؟»
رێگە تەسک دەبۆوە، لای خوارووی هەڵدێرو شیوو دۆڵ. لای ژوو رووی شاخ وەک دیوارێکی بڵند. تا چاو بڕی دەکرد دیوار دیوار لە سنگی ئاسمان چەقی بوو، ئاسمان ئیتر ئەو دەشتە کاکی بەکـاکییە نەبوو کەشین بکاتەوە... هێلێك بوو، هێڵێکی پان و درێژ، وەک شەقام
ـ جوانێ گیان بڵێی ئەو رۆژە بێت کە دوو بە دوو بەو راستە شەقامەدا هەڵگەرێین؟
ـ جا ئەو ئارەزوە بۆ؟
ـ ئاخ نازانی چەند حەزی پێ دەکەم.
جوانێ بە پێکەنینێکی پڕ لە خۆشحاڵیەوە گوتی:
ـ جا شێتە ئەوە بە قازانجت نیە، من پێم بگاتە بازار، چی شتی جوان ببینم، پێت دەکرم
ـ دەی بۆت دەکرم.
جوانێ دیسان تریقایەوە، سوارۆ ئەم رایە مانای قاقاکەی ئاوا لێك دایەوە! «شێتە تۆ جارێ کە پارەت نیە وەمگۆیزی، ئێستا شتی جوانم بۆ دەکری؟
ـ ئەی ماڵی ئەبـوونیم بەقـوڕ گرت، هەر بەرە لایەکی خوێری ئێستـا حیسـابی یەك میلۆنی لە بانك دا هەیە، کەچی منیش دەبێ ئاوا...»
خەیاڵ، بیروکە، بەڵێنی بەخۆ، قسەکەی پێ بڕی «ئیمرۆ پارە لەو سەر سنوورە رژاوە» رووی کردە جوانێو گوتی: هیچی پێناچێ منیش بە هەموو شتێك دەکەم،
ـ چۆن؟
ـ بەهارە
ـ کوا پارە؟
ـ لە شوێنێك رژاوە، هەر کۆکردنەوەی دەوێ، هەربووکیان تریقابوونەوە...

راوچـی پیر نیستیکی کرد، ناوری دایـەوە.. بەسـەر سامی گومانەوە لە سوارۆ روانی. سوارۆ لەبەر قاقاکەی بە خویدا شکایەوە.
تازە زانی کەمەچەکی لەو چنگە ئەستورو رەقە رزگار بوە، رچە تەسك تر لەوە بوو کە دوو کەسی بەیەکەوە پێدا بڕوات. بۆیە ناو بەینی خۆیان گرتبوو.

راوچی پیر لە پێشەوەو راوچی لاو لە دوایەوە.. حەتمەن بیریان کرد بۆوە کەکێ لەم زەندۆڵە هەلاتنی بۆ دەکری؟ هەرکە خراپ جولایەوە شیو دەمی بۆ کردوتەوە، چۆمەکەی بە لرفە لرف لەناو بەینی تەنگە بەری شاخ و بەردەکانەوە وەك مار دەخشی. خلیفی سپی لیدە بۆوەو بە بەردەکانیدا دەسوو، ئەوسا لە بوومە لیلی ئیوارەدا گوم و نادیار دەبوو. شەو دەنگی خورەی ئاوو هاژەی باو خشەی مارو مێروی بەرزتر کردەوە. «شەو قەلای مێدە» راوچی‌یەکان لەوە دەترسان، بۆیە لەکاتیو چانیش دا بستێك لێی جودا نەدەبـوونـەوە. رەنگـە بەهۆی ئەزموونی ژیانی پڕ کارەســاتیان ئەو راستی‌یەیان بۆ دەرکەوتبێ کە دوژمن ئەگەر چی ترساوو تەنگە تاویش بێ، هەر جێگەی مەترسی‌یە... باشە، سوارۆ چ دوژمنایەتیەکی لەگەل ئەواندا هەبوو؟ هەرچەند بیری دەکـردەوە تا ئیمرۆ کەسیانی نەدیتبوو! خراپەی بۆ کەسیش نەبـوو بوو کە ئەمـانـە کرێ گرتەوەوچە خوری بن. ئەی بۆ؟ رەبەیەك دری بەشەوو بێدەنگی دا، دوایی چەند گوللەی دوور هەرسی کەسەکە هەل سلەمینەوە. بەلام درێژەی نەساند، راوچی کەوتنـە مقۆ مقۆو راوویژ. دیار بوو ئەوانیش بەقەدەر سوارۆ دەترسان. لەکێ؟ لەچی؟ سوارۆ ئەمەی بۆ یەکالا نەدەبووەوە. ئەو دەیزانی کە ئەم جووتە لەشار یاخی بوون، ئێستا وا پەی پێدە برد کە لە شاخیش یاخین. باشە ئەی کەواتە سەریان بەکوێ وە بەنـدە. لەدووی چی ویلن؟ بیری لەوە کردەوە کە پیـاو دەبێ لەدووی چی ویل بێ؟ بۆ خۆی شوێن پارە کەوتبوو.

شوێن کاسبی. باشـە ئەگـەر ئەوانیش عەودالی پارەبن، خۆ سوارۆ هیچی پێ نەبوو. باشە بۆ رێگەیەکیان دەبری کە هیچ ئاوەدانیەك نەگرێتەوە؟ بۆ جگە لە خۆیان لە هەموو شتێك سلیان دەکرد؟ بیری بری نەدەکرد. دیسانەوە هەستان. بابۆلەیەکیان دایەو بەنووکە تفەنگ تێیان کوتا.

ئەمیش وەك ئەوان هانای بۆ پێی برد. تاریکە شەوبوو. ئەستـێرە ول و شوێنـە گوم بوون. دنیـا لەخەم هەلکێشرابوو. رەنگاوی بەسەرپشتی چۆمەوە دەدایەوە.



ئەو روونـاکیە کە لە راستی‌دا بەسەر ترۆپکی شاخەکەوە بوو. سوارۆ وەیدەزانی بە ئاسمانەوەیە کەملی رێگەکەیان بەرەو ژوور گرت.
هەستی بەوەکـرد کە ئەنجـام ئەوێیە. باشە بلێی کوێ بێ؟ ئاوەدانی؟ ئازاری پەنجەی پێی، ئیشی مەچەك گوشینەکەی لە بیر بردبـۆوە باوکی کاتێ دەکـەتە بیرەوەری گێرانەوە دەیگوت: «پیاو کە بەشەو رێگەی بەشەوانی زستان کە زۆپاکەی لەباوەش دەگرت، زۆر شتی بۆ دەگێرایەوە..

بەتایبەت ئەو شەوانەی کە لەتەك دایکی سوارۆدا سازبوو، بە دەگمەن رێدەکەوت ئەوان ساز بوونایە...
سوارۆ هەرگیز نەیزانیبوو شەڕو قرەیان لەسەر چی‌یە... کەمتر بیری لێدەکردەوە، تا مندال بوو، پەنجەی هەر دووکیان بۆ مەچـەکی ئەو داو بوو، ئەو دوانـە ئەگـەر لەســەر هیـچ رێ نەکـەوتبـان لەسەر پارێزگاری لە سوارۆ یەك را بوون. بەلام ئێستـا کە لەو دوانـە رزگـار بوو بوو، کەوتبوە تەلەی ئەم راو چیانەوە. بەجوانێی دەگوت: هەمیشەی خودا لەتەلەو داو سلم کردوە، بەلام ئێستا لە دوای تۆدا هەست بە بەختیاری دەکەم.

جوانێ دەیگـوت: ئێستـا لە کوێتـە سوارۆ؟ شەرت بێ وەهـا ئەسپیت کەم، دەرباز بونت نەبێ، ئەوم بۆی دەخنایەوە! جوانێ ئێستاش هەر دەرباز بوونم نیە..
دوای ماوەیـەك کە هەوای کاسـبی کەوتـە مێشکی، جوانێ دەیگوت: ئێستا بڕوا دەهێنم کەلە هیچ داوێك دا ئۆقرە ناگری.
ـ بۆچی جوانەکەم؟
ـ ئەهلوا دەرباز دەبی‌و دەرۆیی؟
ـ جوانەکەم بڕۆم بۆسەر قوللەی قافیش هەر ئێچیری خۆتم.
ـ بەلام من حەز بەم سەفەرە ناکەم
ـ دایك و بابیشم هەروا دەلێن.
ـ دە کەواتە وازی لێ بێنە!
بەلام سوارۆ وازی نەهێنا، پارەیەو رژاوە. دەبوو کۆی بکاتەوە

بگەڕێتەوە. تابۆ هەمیشە لەبەندی جوانیدا بمێنێتەوە. وەک کەوێکی ماڵی، شەرتە ئەگەر دەست بڕوات ژوورەکەش بەجێ نەهێڵێ.
ڕوناکایی سەر شاخەکە نیزیک بۆوە، ئاوەدانی نەبوو. خانوێک بوو دەنگە دەنگ لە دانیشتوەکانی بەرز بۆوە، سوارۆ داچڵەکی. ترسا، ئەنگە تاو بوو، دەنگە دەنگ بە زمانی عارەبی بوو، بۆچی؟ بۆ ئێرە کوێیە؟ ئەکات؟ ئەکات؟...
**- چی‌یە لەتیف نێچیرت پێیە؟**
**- ئا... ئا...**
**- چەند دانە..؟**
**- یەکێک.!**
- پیر بویت لەتیف، لە ڕاوکەوتویت.
ڕاوچی‌و ڕاو لەگەماڕۆی چەند ئەفسەرو سەرباز دابوون، یەکێک لە ئەفسەرەکان کورد بوو، ڕاوچی لەتەک ئەودا دەدوا، ئەوانی دیکە وەک گورگی برسی سوارۆیان لە ئابلوقە دابوو، چاویان زەق بوو.
کەڵبەیان تیژ بوو، لە خۆشیان پێدەکەنین. بەچاو دەیاندوزی... ئاسمان بەردی بەسەر سوارۆدا دەباراند. شاخی دەباراند... خانویەکی سەربازی دەباراند... تیشکی گلۆپ، کۆمەڵێ سەربازی چاوزەق، تفەنگ، قەتارە فیشەک، ورتیە وریتی عارەبی...
هەموو بەسەر دا دەباری.. بەڵام ئازاری یەکێکیان لەهەموان زیاتربوو..
ئاوێک، لەتیف... وەک تیل بەدەمی ئەفسەرە کوردەکەوە هەڵدەسوراو پەستا پەستا لە مێشک و ڕوحی سوارۆی دەسرەواند.
لەتیف... ئەرێ لەتیفە ڕەش. بۆ ئەم ماوە ئەهێنا سیوە؟ بەڵام ئەو ئەوەندە ڕەش نەبوو... بۆلە تیفە ڕەش، دەبێ ڕوخساریشی ڕەش بێ؟ بۆ دڵی ڕەش نەبوو؟ وەک ئەم شەوە ڕەشە..
دەمێک بوو کە بیستبووی لەتیفە ڕەش و براکەی خەریکی پیاو دزینن. هەرکەس بێ گرنگ نیە، دوو پێی بێ‌و دوو دەست و سەرێک، دەیفرۆشن بەعسیەکان، دەڵێن هەرکەسە (٥٠٠...) دینار دەکات. دەربارەی لەتیفە ڕەش زۆر شت دەگوترا... دڵ ڕەق و مونە... وەک ڕێوی فێڵ بازو وەک گورگ بزرە، سێ ساڵە جگە لە نێچیرەکان و موشتەریەکانی کەسی نەدیتوەو نەیهێشتووە کەس بیبینێ.
سوارۆ لە ژوورێکی تاریک دابوو... ئەوەندە تارک کە هەستی بە دیوارەکانیش نە دەکرد، پێنج پەنجەی ڕەق و ڕەش، مەچەکی ڕوحیان دەگوشی. گشت گیانی مێروولەی دەکرد.
- ئەمگۆ سوارۆ حەز بەم سەفەرەناکەم؟
جوانێ بوو، لەو تاریکایی‌یەدا چاوە جوانەکانی بڵێسەیان دەدا. ترسیان لێ نیشتبوو..
- چیت لێ دەکەن سوارۆ؟
سوارۆ نەیدەزانی چی لێ دەکەن... نا... دەیزانی، بیستبووی چی لە نێچیر دەکەن... بەڵام، بەڵام باوکیشی هات.. دایکیشی وە ژوور کەوت. «نابینە مەچەکت سوارۆ..»
مەچەکی بەدەست دایکی‌یەوە بوو، ئاسوودە.. هەموو شوێنێک ڕووناک بوو. تەقەی دەرگا هات! سوارۆ داچڵەکی، چاوی گێڕا... جوانێ‌و باوکی‌و دایکی هەر لەوێ بوون.
- «بۆ دەبێ ئەمانە بە ئاگری منەوە بسوتێن؟ ئێستا دێن...
پرچی جوانێ‌و دایکم هەڵدەکەنن، چاوی باوکم هەڵدە کۆڵن.. ئەوسا نۆرەی خۆم دێ.. نا.. نا.. ئەمە دوورە لە مرۆڤایەتی... بۆ دەبێ وابێ..؟ ئاخ لەتیفە ڕەش.. ئاخ.. چۆن تۆ لە دنیایەک یاخی بویت.. ئەگەر دەمزانی تۆی، شەرتە پربە پری شیوەکان هاوارم دەکرد، وەهاکە شاخ بلەرزایەوە... هەڵتەکایەوە. دەتکوشتم؟ چش... کوشتنێکی بێ ئازار دەبوو... بۆ خۆشت پێوە دەبووی، تەلیسمی سێ ساڵەت دەشکا..»
**- چی‌یە سوارۆ گیان؟**
جوانێ‌و دایکی باوکی پێکەوە پرسیاریان کرد
**چی‌یە سوارۆ گیان؟**
سوارۆ دیسانەوە چاوی پێدا خشاندن، گوتی: «هیچ نیە، بڕۆن وازم لێ بێنن، با دەستیان نەتانگاتێ، بڕۆن بۆ هەمیشە بە جێم بێڵن.. تازە سوارۆ نەماوە، سوارۆ ڕێشت و برایەوە..»
دەرگا کرایەوە. لەتیف بوو، لە ژوورەکەی ڕوانی، نیگای وەک تیر ئاراستەی سوارۆ کرد. ئەفسەرەکە لە ئەدیویەوە پرسی:-
بۆ کوێ لەتیف؟ ئیمشەو بمێنەوە.. لەتیف بە ئارامی دەرگای پێوەدا.. سوارۆ گوێی لێ بوو:
- ناکرێ، تا شەو شۆڕە ڕاو خۆشە...




بەشی یەکەم



هەرچەندە بەرهەمە دراماییەکانی گۆران جێگایەکی تایبەتییان لە دیوانی گۆران، ولە شیعری کوردی تازە بە گشتی، دا هەیە و کەس نیە ئاشنایەتی، نزیك یان دووری، لەگەڵ ئەو بەرهەمانەدا نەبێت و شارەزای ئەو بەرهەمانە نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ووردی ئەدەبی دەربارەی هەستی درامایی گۆران تا ئێستا نەنوسراوە وتەنها کتێبی رەخنەیی دەربارەی بەرهەمەکانی گۆران کە تا ئێستا دەرکەوتووە لە باس ناوەڕۆکی ئەو بەرهەمانەی زیاتر نارەوات [٢].

بەڕای من هۆی ئەو کەم تەرخەمیە لە وانەیە بۆ سەیر کردنی ئەو بەرهەمانە بە شێوەیەکی جیانەك وەکو بەشێکی جیانەکراوە لە هۆنراوەکانی تری گۆران بگەڕێتەوە. چونکە هەرچەندە ئەوپەڕێت و گفت و گۆ شیعرییەکانی گۆران لەوانەیە ڕاستەوخۆ و تا ڕادەیەك ساکارو تەواو نەکراو بنوێنن، بەڵام واتایەك و قووڵییەکی هونەری تر پەیدا دەکەن ئەگەر هاتو شان بەشانی هەڵبەستەکانی تری دیوانەکانی گۆران سەیر کران. هەر لەوەشە ئەوەی من ئێستا لێرەدا دەمەوێ بیکەم و شتێك دەربارەی نەك تەنها ئەو بەرهەمانە بەڵام دەربارەی دراماو درامی بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو بەرهەمەکانی گۆراندا پێشکەش بکەم.

● بۆ نموونە لە دیوانی یەکەمی گۆران، (بەهەشت و یادگار)، زۆر لە نرخی دو بەرهەمە دراماییەکەی (گوڵی خوێناوی!) و (ئاهەنگێك لە ناو ران) کەم ئەبێتەوە ئەگەر جیامانکردنەوە لە هەڵبەستەکانی تری دیوانەکە. هەروەها لە نرخی زۆر لەم هەڵبەستانەی تریش کەم دەکەینەوە ئەگەر هاتو دراماو هەستی درامایی گۆرانمان تەنها لە چوار چێوەی ئەو دو بەر هەمەی پێشوودا بینی. جارێ یەکەم شت، بە ڕای من، لووتکەی هونەری درامایی لەم دیوانەدا لەو دو هەڵبەستەدا نیە، بەڵام لە هەڵبەستی (بووکێکی ناکام!) دایە. ئەم هەڵبەستەی دوایی، هەرچەندە شێوەی گێڕانەوە نەك گفت و گۆی وەرگرتووە، بە ڕێگایەکی قووڵترو دەوڵەمەندتر لە هەموو هەڵبەستەکانی تری دیوانەکەدا هونەرە دراماییەکانی بەکار هێناوە. هەروەها لە ژمارەیەك لە هەڵبەستە لیریکە هەرە ناسراوەکانی ئەم دیوانەدا جۆرە هەستێکی درامی ناسك لە بیناو دار شتنیاندا بەدی دەکرێت.

● من لە جێگایەکی تردا [٣] بە درێژی باسی بیناو دارشتنی هێندێك لەو هەڵبەستانەم کردووە، بە تایبەتی هەڵبەستەکانی (ئافرەت و جوانی!)و (ڕەوتێکی جوان!) و (بۆ جوانی سەرە ڕێ)و (جوانی بێ ناو)و لێرەدا دووبارەی ناکەمەوە. ئەوەی ئێستا دەمەوێ سەرنجی بۆ ڕابکێشم تەنها هەستی درامایی ئەو چەند هەڵبەستەیە.

● هەڵبەستی (ئافرەت و جوانی!) زۆر بە ڕوونی ئەکرێ بە دو بەشی سەرەکی کە بە پێچەوانەی یەکترن. بە شێوەیەکی زۆر درامایی لەناوەڕاستی هەڵبەستەکەداو بەتایبەتی لە کۆپلەی

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێ ڕووناکییە بێ بزەی ئازیز"[1]

جۆرە وەرگێڕانێکی (Inversion) درامایی ڕوو دەدات و هەموو ڕێڕەوی هەڵبەستەکەبە لایەکی تردا دەڕوات، وەکو ئەوەی هەموو دێڕەکانی پێشووی بۆ جوانی سرشت تەرخان کراو ڕەش بکرێنەوەو جوانیەکی تر (جوانی ئافرەت) بە پێچەوانەی ئەوان بەرز بکرێت و وەصف بکرێت و پیایدا هەڵبدرێت.

ئەو کۆپلە حەوتەمەی ناوەڕاستی هەڵبەستەکەی لە سەرەوە تۆمارکراو، کە پتر لە هەموو دێڕەکانی هەڵبەستەکە لە بیری هەموو خوێنەرێکدا دەمێنێت، لووتکەی هەڵبەستەکەیەو، وەکو لە دراماڕا پێی دەوترێ، جێگای تەنگانەو خاڵی وەرگێڕانێتی (نقطة التأزم والتحول).

● هەروەها لە هەڵبەستی (ڕەوتێکی جوان!) کە دەستە خوشکی هەڵبەستەکەی پێشووە و دەربارەی هەمان بەراووردکردنی جوانی سروشت و جوانی مرۆڤە، بە کت و پڕیەکی درامایی هەمان جۆر، چوار کۆپلەی کۆتایی هەڵبەستەکە ڕێرەوەکەی هەموو دەگۆڕن و بەرەو ئەنجامێکی دەبەن کە بە پێچەوانەی هەموو ئەوەی لە بەشی یەکەمی هەڵبەستە خوێنەر بۆی ئامادە کرابوو:

ئەوەنــدە جوان، لەوە جوانــتر،
لەشنــەی بای، شەو ڕەوانــتر،
لە لەرەی پرشــنـگ، ئاوازە،
لەخــوڕەی ئاو، شیــعری تازە،
بەئــاهــەنــگــتر، بە خوروشــتر،
بە گوێــچکــەی دڵ دەنگی خۆشــتر،
پێــی ناز ئەنــێ بەســەر لەرزا:
جوانــێ لە بەژنــێــکــی بەرزا!..[2]

سەیری کە چۆن لێرەدا بەبێ ئەوەی هیچ ڕاستەو خۆیانە وەصفی ئافرەتەکە بکات شاعیر لەو چەند کۆپلەیەداو هەر بە ڕێگای وێنەی شیعری لە سروشت و لە هونەر وەرگیراوەوە ئەو بەراووردکردنە (وئەو پێوەندیە پێچەوانەیە)ی جوانی سروشت و جوانی ئافرەت لە ناو چوار چێوەیەکی دراماییدا پێشکەش دەکات.

● هەمان جۆرە تەکنیك، وبەڵکو ئەمجارە بە شێوەیەکی ناسکتریش، لە هەڵبەستی (بۆ جوانی سەرە ڕێ) بەدی دەکرێت. بەبێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەکی ڕاستەو خۆیانە وەصفی سروشت بکات، کە لێرەدا (دێ) نوێنەریتی، شاعیر هەستێکی بەهێز بە جوانی ئەم دێیە دروست دەکات، وبە ڕێگای دامەزراندنێکی (Juxtaposition) درامایی جوانی دێو جوانی ئافرەت بە تەنیشت یەك، ئەم دو جۆرە جوانییە لە مێشکی خوێنەر بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

● لەناو ئەو چەند هەڵبەستەی لێرەو لە ووتارێکی پێشوودا باسمان کرد، (جوانی بێ ناو) جێگایەکی تایبەتی هەیە، لێرەدا جگە لەوەی وەصفی ئافرەت و وەصفی سروشت و دەربڕینی خودی شاعیر خۆی، بە هاو شانیەکی (Parallelism) درامایی زۆر زیرەکانە، بیناو دارشتنی ئەم هەڵبەستە دروست دەکەن[3]، جۆرە دراماییەتێکی ڕاستەو خۆتر لەوە دایەکە ئەم هەڵبەستە لە بنەڕەتدا گفت و گۆیە لەگەڵ کچێك. یاخود ڕاستتر قسەی شاعیرە کە ئاراستەی کچێك کراوە، هەر چەند ئەو سەرنجە سەرەتایی بێت، کە دبینە سەر زۆر لە هۆنراوەی دیوانەکانی تری گۆران ڕۆڵی درامایی ئەم جۆرە دارشتنەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە سەیری کەچەند لە هەڵبەستە هەرە بەناوبانگەکانی دیوانی دووەمی گۆران، (فرمێسك و هونەر)، ئەو شێوەی گفت و گۆیەیان وەرگرتووە:

لەگەڵ فریشتەی شیعر

ئەی فریشتەی شیعری جوان:
کۆستی کەوتووی هەر دووکمان
(هاوڕێم بێ کەس!)

لەگەڵ هیوای کوڕی،
ڕۆڵەی تاقانەم، هیوای ژیانم،
ئەستێرە گەشەی بەری بەیانم
(لەسەر مەرگی هیوادا!)

لەگەڵ بلبل،
ئەی باڵداری ئێسك سووك،

بلبل دمنووك بچووك
(بۆ بلبل)

لەگەڵ گەورەیەکی شیعر دۆست:
شیعری جوانت ئەوێ، قوربان، شیعری جوان،
شیعرێك گەشەو زەردەخەنە بابە ژیان!
(بۆ گەورەیەکی شیعر دۆست)

لەگەڵ سالم،
بەیادی تۆ ئەگرێ دەستی عاجزم خامە،
دەهایی رۆشن و بەرزت ئەگاتە ئیمدادم
(بۆ سالم)

لەگەڵ دەروێش عەبدوڵلا،
بەرەنگی زەردو شێوەی دەست و شمشاڵی کزا، دەروێش
جەزم کرد بە ستەیەك ببیەم سەراسەر حوزن و ماتەم بێ
(دەروێش عەبدوڵلا)

لەدیوانی سێهەمی (سروشت و دەروون) یشدا ئەو جۆرە گفت و گۆیە یاخود ئەو جۆرە ئاراستە کردنە« قسەکانی شاعیر رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە هێندێك لە هەڵبەستە هەرە سەرکەوتووەکانی گۆران. بۆ نموونە، لەگەڵ پایز،

پایز!پایز!
بووکی پرچ زەرد،
من مات، تۆ زیز
هەر دوو هاو دەرد!

(پایز!)

لەگەڵ کوردستان،
کوردستان: جێگامی، جێی هەزار ساڵەم،
پەروەردەی ئەم دۆڵ و سەر لووتکەو یاڵەم!
(کوردستان)

لەگەڵ هیوای کوری،
هیوا، مەگری، هەنسکی نیوە شەو بەس هەڵدە، بەس بگری.
لە چاوی بێ قەرارم بۆچی دەرمانی وەنەوز ئەبری؟..
(بۆ هیوای کورم)

لەگەڵ قژ زەرد بەر دەرگا،
ئەی قژ زەرد! ئەی بەژن و باڵای کەڵەگەت!

بۆ کز راوستاوی بەرامبەری من؟
(دوا سەرنج...)

بەزمان کچێکی بە دەستی باوکیدا کوژراو،
لەخاکی گلکۆما ئەی گۆرستان گەر
ئاخێك بنێژە،
بە کێلی مەر مەرما فرمێسکێکی تەر
لە چاو برێژە!
(بەردە نووسێك)

لەگەڵ کەون و بەرگریی کردن لە خۆی،
تاوانم کرد.. گەل پێوە نام مۆری ناپاکی،
بۆ زیندانە کۆچی ژینم دنیای رووناکی!
(لە بەندیخانە..)

لەگەڵ دوکتۆر لە سەر تەختی مەرگەوە،
بەڵێ، دوکتۆر! خۆشکان! ماتم،
هەر من نیم (مات)ی وڵاتم
(وەڵامی پرس)

●بێ گومان راستە ئەم هەڵبەستانە لە بنەرەتدا لەگەڵ گفت و گۆ (دیالۆگ)ی دراماییدا جیاوازن چونکە تەنها شاعیر (یاخود یەك کەس) قسە دەکات و هیچ وەڵامێك یاخود دەنگێکی تریان تیادا نیە، بەڵام دامەزراندنی ئەو ژمارە زۆرەی هۆنراوەکانی گۆران لە سەر بناغەی گفت و گۆیەکی پر سۆزی شاعیر، هەرچەند یەك لایەن بێت، لەگەڵ ئەوکەسانە یاخود ئەوشتانەی گەورەترین نرخیان ئەداتێ، هەر وەکو دیار دەیەکی گرنگی سەرنج راکێشەر دەمێنێتەوە، گرنگی ئەم دیاردەیە گەورە تریش دەنوێنێت کاتێ لە هۆنراوەکانی تری گۆران دا، لە دوای ئەم سێ دیوانە، کە زۆربەیان شیعری سیاسین، بە هەمان شێوە سەر هەڵدەدات.
● لە دیوانی چوارەمی (لاوك و پەیام)دا، پەیامەکە هەمووی بۆ کۆتری، رەمزی ئاشتی، ئاراستە کراوە:

ئەی کۆترە سپیەکەی ناو هێلانەی بەرز!
لە کیانی پیکاسۆ ئیلهام ئەکەم قەرز
(دیوانی گزانە، ل ٥٣م)

**هەروەهـا لاوکەکەشی لەزۆر جێگا هەمان شێوەی گفت و گۆی وەرگـرتـووە (٧) کە لە ژمـارەیـەك لە شیـعـرە سیاسیەکانی دواییشدا بەدی دەکرێت.**
**بۆ نمـوونـە، لەگەڵ ئەژدە هاك (زیندانی نەژدەهاك) (ل ٢٦٨)، لەگەڵ مایکل رۆزەنبەرگ (بو یکێ) (ل ٢٧٥)، لەگەڵ پۆڵ رۆپسن (بانگێك... بۆ پۆڵ رۆپسن) (ل ٢٧٨)، لەگەڵ دەنگی دووری ئازادی (لە زینداْنا چواردەی تەممون) (ل ٢٨)، «بە زمان دایکی کوردستانەوە بۆ ‌ برافەیلیەکان» (تاسەی دیدار) (ل ٢٩٦)، لەگەڵ سەربازی کۆماریی (بۆ سەربازی جومهووریمان) (ل ٢٩٩)، لەگەڵ مۆسکۆ وەکو ئافـرەتێکی جوان (مـۆسکـۆی جوان) (ل٣٠٣)، لەگـەڵ میللەتی کورد (نـەورۆز) (ل ٣٠٩)، لەگـەڵ برای عەرەب (چیرۆکێکی برایەتی) (لە ٣٢٠)و لەگەڵ لاوان (بۆ لاوان) (ل ٣٣٠).**

کەواتە، وەکو ئەنجامێکی گشتـی ئاشکرا، یەکێك لە نیشانەکانی هەستیدرامـایی گۆران، نەك تەنها لە دیوانە رۆمانسیەکانی، بەڵکو لە هەموو بەرهەمەکانی بە تێکرا، ئەو جۆرە دارشتنەی هەڵبـەستـەکـانی تی بە شێـوەی گفت و گۆ لەگـەڵ بابـەتـە سەرەکییـەکانیان، بەڵام ئێستا ئەگەر بگەرێینەوە بۆ دیوانی یەکەمی (بە هەشت و یادگار)، لە دوای ووردبوونەوە لە هێندێك لە هەڵبـەستـە لیریکـە هەرە سەرکـەوتووەکانی ئەم دیوانە بۆ شیکردنەوەی **بینـاو دارشتنیان و بۆ تێگەیشتنی**

ناوە رۆکە فیکریەکانیان (کە زۆربەی دەربارەی پێوەندی مرۆڤ و دەوروبەرێتی بەگشتیو دەربارەی دڵداریی بە ئامانج نەگەیشتووە) (٨)، باشتر ئامادە دەبین بۆ سەیرکردنی دو هەڵبەستە هەرە درامایییەکانی ئەم دیوانە: (بووکێکی ناکام)و (گـوڵی خوێنـاوی!) کە دەربـارەی هەمان جۆرە دڵدارییی بێ ئەنجامن.

● لایـەنـە درامـایییەکانی دیالۆگە شیعریە کورتەکەی (گوڵی خوێناوی!) ئاشکران: گفت و گۆ لە نێوان دو کەسی سەرەکی، گیرو گرفت یاخود گرێی درامایی (پەیدا کردنی چەپکە گوڵ بۆ کچەکە) وچارە سەرەکی ئەو گیرو گرفتە یاخود کردنەوەی، ئەم گرێیە بە **شێوەیەکی** کارە ساتاوی (تراژیدی) لە کۆتاییی داو وەرگـێرانی بارو دۆخی کەسانی هەڵبەستەکە بەو شێوەیەکی دژوار (لێرەدا لە خۆشی لە بەشی یەکـەمـدا بۆ ناخۆشیو

**کارەساتەکەی بەشی دووەم لە دوای کردنەوەی** گرێ

درامایییەکە **بەڵام** لە کۆتاییی دا، ئەو بەرهەمە، بەو هەموو لایەنە درامایییانەی باسمان کردن، بێ گومان پیەسیکی شانۆگەریی نیـەو تەنها دیالۆگێکی شیعریە کە لە فۆرم و لە واتاوە زۆر **نزیکە لە**

هەڵبـەستە ئیریکەکانی تری ئەم دیوانە. هەرلەبەر ئەوەشە کە هەڵبـەستـە کە، جگە لەو هەموو لایەنە درامایییانەی باسمان کردن، لەسـەر بنـاغەی ئامرازێکی شیعریی دامەزراوە، هەر چەندە ئەو ئامرازە بێ پێوەندی نیە لەگەڵ ئەو لایەنە درامایییانە.

● لە ناو جەرگـەی هەمو جۆرە درامایێك دژوارییو دولایەنی هەیـە، و هەرچـەندە ئەو دیاردەیە لەوانەیە لەناو هەمو جۆرە بەرهەمێکی ئەدەبی دا بدۆزرێتەوە لە دراما دا رۆڵی گەورەتر و ئاشکراترە. هەمان دژراوارییو دولایەنیش، بە رای من، لێرەدا بەردی بناغەی ئەم هەڵبەستەن، لە ووتارێکی تردا[٩] باسی ئەو نەخشـە **شاراوەیەی** هێنـدێك لە هەڵبەستەکانی شیعری تازەم کردووە کە لە دوای ووردبوونەوە زۆر لە «نهێنییەکانی» فۆرم و واتـای ئەو هەڵبەستانەمان بۆ روون دەکاتەوە و لە وانەیە، بە **شێوەیەکی** سەرەکی، لەناو هەر لایەنێك لە لایەنەکانی هۆنراوە کە شاعیر هەڵیدە بژێرێت خۆی بنوێنێت ـ بیناو دارشتن بێت، یازمـان، یا ئامـرازی شیعـریی، یا واتـای فیکری. لە (گوڵی خوێناوی!) شدا ئەو نەخشە شاراوە یا ئەو کلیلە دەم و دەست نەبینـراوە ناگـەرێتـەوە بۆ توخمـە درامـاییـە ئاشکـراکـانی هەڵبـەستـەکە بەڵام بۆ ئەو دو لایەنیەی کە باسمان کردو کە لێرەدا زیاتر پێوەندی بە زمان و بەرستەو فرێز (عبارة)و وشەوە هەیە.

هەر لە یەکـەمـین پارچـە دیـالۆگی (کور) ئەو نموونانەی خوارەوەمان دێنە بەر چاو: (شاییە، چۆپییە)، (بروانە، گوێ بگرە)، (زەرد و سور)، (ژن و پیاو)، (هەرایە، هەر هارەی) (لە رووی دەنگـەوە)، (بروێن، دەست بگرین). (کچ) یش داوای گوڵ ئەکات (ئاڵ چەپکێ، زەرد چەپکێ)، ئەگینا(نایە (ت) بۆ زەمـاوەن)و (نـایە (ت) بۆ هەڵپەرکێ)، بەڵام کاتێ کە سوور

**ئەبێت لەسەر داواکەی و دووبارە داوای**

هەمان شت ئەکات (کور) ئەکەوێتە دو.

**لایەنێك و گێژاو ێکەوە:**

**(ئەروێم): ڕێگام لێ گیراوە،**

**(ئاروێم): چاوکاڵ لێم تۆراوە![10]**

لە بەشی دووەمی هەڵبەستەکە شدا، بە (کچ)**ئەڵێت** بە باغچەی پاشادا گەڕاوە (خـوارو ژوور)و باسی (گـوڵی زەرد) و (گوڵی سوور) (شـایی و هەڵپـەرکێ)ی بۆ دەکـات. (کچ)یش، کە لە کۆتـاییدا بەکـارە ساتـەکە دەزانێت، کۆتایی بە هەڵبەستەکە دێنێت بە ئامادە بوون بۆ گریان (بۆ دڵێ) کە (بۆ گوڵی) (لێرەدا دولایەنیەکە لە دەنگ و لە واتا دایە) دۆرانی.

لەم هەڵبـەستـەدا چۆن دژواریـەکانی کور وکچ و کوری جوتیـارو پاشـای خاوەن باغچەو خۆشی دڵداریی و کارەساتی مەرگ، بینـا درامـاییـەکـەی دروست دەکـەن، هەروەها ئەو **مۆتیفەی** ڕستەو فرێزو ووشەی دولایەن، هەر لە یەکـەم تا دوا دێـری هەڵبـەستـەکـە، وەکو **دەنگدانەوەیەکی هەمان درامایەتی لە زمانی هۆنراوەکەیدا** سیحرو «نهێنی» تایبەتی بەرهەمەکەمان بۆ روون دەکاتەوە.

هەمان جۆرە دژواری درامایی هۆنراوەتەوە ناو هەڵبەستی (بووکێکی ناکام)، هەر لەیەکەم تا دوا دێری، بە شێوەیەك کە بەرزترین نموونەی درامایەتی لەم دیوانە، و لە بەرهەمی گۆران بە گشتیش دا، پێکـەش بکـات هەڵبەستەکە، وەکو لە پێشدا ووتمـان، هەر چەندە لەسەر بناغەی گێڕانەوە نەك گفت و گۆ دامەزراوە، بە شێوەیەکی قووڵتر سوودی لە ئامرازەکانی دراما وەرگرتوە.

●لە ڕاستیـدا تەکنیکی هونـەریی هەڵبەستەکە، لەبنەڕەتدا، زیـاتـر سینەماییە وەکو درامایی و لەسەر بناغەی ئەوەی لە زاراوەی سینەما پێی دەڵێن (فلاش باك)، کە واتە بەرەو دواوە گەڕانـەوە، دامـەزراوە، هەرچـەندە ئەو تەکنیکـە لە دراما (ولە رۆمانیشدا) سەری هەڵداوە پێش پەیدابوونی هونەری سینەما بە زۆر (دراما نووسی بە ناوبانگ، ئیبسن، بە تایبەتی، وەستای ئەو جۆرە تەکنیکە بو) ئەو مەیدانە هونەریە هاوچەرخەی دوایی رۆڵێکی گرنگی هەبو لە بڵاوبوونەوەی ئەو تەکنیکەی وای لێ هات هەر بەوەوە ببەسترێتەوە.

لێرەش ئەو هەڵبەستەی لە[13]**کۆپلە پێکهاتوو** لە کۆپلەی یەکەم تا کۆپلەی دە هەمیـدا باسی ئاهـەنگی بەبـووك بردنی کچی جووتیـار بۆ ئاغـا دەکـات و لە کۆپلەی یانـزەهەم

تا کۆپلەی ژمارە «٥» ئەگەڕێتەوە بۆ دواوە بە (فلاش باك) بۆ باسکردنی دڵداریی پێشـووی کچی جوتیارو کوری شوان و ڕێگـا گرتنی ئەو دڵدارییـە پاکـە لە لایەن ئاغاوەو ئەنجامی کوشتنی کورەکە بە دەست پیاوەکانی، ولە دوکۆپلەی ژمـارە «٦» و «٧»ی کۆتایی دا ئەگەڕێتەوە دووبارە بۆ ئاهەنگە تاڵەکەی سەرەتای هەڵبەستەکە:

**ئێستـا ئەوا هەرچی بڵێی نیعمـەت و نازە.**
**هەمووی ئەدا بە یەك دڵۆپ فرمێسکی تازە.**
**لەبـەر دەرگـای چاوی ڕەشـا بلەرزێ و بڵێ:**
**دەستی زۆردار سەد سەر ئەگا، ناگاتە دڵێ![12]**

وەك بەرهەمێکی گێڕانەوە (Narrative)

ئەم بیناو دارشتنەی لە سەر تەکنیکی (فلاش باك) دامەزراوە نەخشـەی ئاشکرای هەڵبەستەکەیە، ئەو تەکنیکە لە بنەڕەتدا تەکنیکێکی دراماییە (و لەگەڵ پەیدابوونی دراما دا، بە بەڵگەی (ئـۆدیبی پاشـا)، پەیـدا بووە) و لێرەدا بۆ پێشکەشکردنێکی ناراستەو خۆیانەی ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە شیعرییە بەکار هێندراوە، بەڵام جگە لەو نەخشە دراماییە ئاشکرایەی بیناو دارشتنی ئەم هەڵبەستە، بەهەمەکە وەکو بەرهەمێکی شیعری نەخشەو کلیلی «نهێنی» تایبەتی خۆی هەیە کە لێرەدا لە سەر بنـاغـەی وێنـەی شیعری دژوار دامەزراوە، بە شێوەیەك کە هەروەها خزمەتی بە هێزکردنی درامایەتی هەڵبەستەکە دەکات.

هەر لە یەکەم کۆپلەدا، هەڵبەستەکە بە دو وێنەی دژواری سوار و تفـەنگچی لە لایەك و ژنی جوان و ئارایشت لە لایەك دست پێ دەکات:

هەی سوار سوار بێ! هەی تفـەنگچی دەست باتـە تفـەنگ!
هەی ژنـی جوان ئارایـشـتـی خۆی کا بۆ ئاهـەنـگ.[13]

**لەدوای** ئەوە هەمو هەڵبەستەکە بە ڕێگای وێنەی دژوار یاخود وێنەی دولایەن و بەراوورکراو بەرەو پێشەوە دەڕوات، یەکسەر لە دوای کۆپلەی یەکەم.





# سرڤانتس و کیخۆتێ



وەرگێرانی لە ئیسپانی‌یەوە محمد کاکەیی

(میگێل دێ سرڤانتس سافیدرا) کوری ئەشتەرگەری بەناوبانگی ئیسپانی «رۆدیگۆ دێ سرڤانتس»ە. لە سالی ١٥٤٧ لە «ئەلکالا دێ ئیناریز» هاتوتە دونیا ئەوەی راست بێت تاکو ئیستا نەزانراوە سەردەمی مندالیتی و لاویتی لە کوێ بەسەر بردووە. سەرچاوە سەرەتاکان تەنیا ئاماژەیان بۆ ئەو سەردەمە کردوە کە لە مەدرید خوێندویەتی.

لەسالی ١٥٧١ دا بەشداری شەری «لیپانتۆ»ی کردووەو تێیدا پالەوانیتی خۆی نواندوەو دوو جاریش بریندار بووەو تێیدا پالەوانیتی خۆی نواندوەو لە دوو جێگایشەوە بریندار بووەو تاکو مردنیشی هەر شانازی بەو برینانەیەوە کردووە، وەکو سەربازێکی چاونەترس لە زۆربەی هەرە زۆری شەرەکانی ئەو سەردەمەی سوپای ئیسپانیا بەشداری کردووە. لەکاتی گەرانەوەی لە بەرەکانی جەنگەوە بۆ ئیسپانیا لە رێگادا خۆی و براکەی لەلایەن جەردەکانەوە دەستگیر دەکرێن و بۆ ماوەی پێنج سال لە جەزایێر دەستبەسەر دەبن و ژیانێکی تفت و تال بەسەردەبەن.

پاش ئەو هەموو کوێرەوەری و نەدارییە لە شاری مەدرید جێگیر دەبێت و لە دەوروپشتی ئەو شارە کیژێکی گەنج دەدۆزێتەوەو لە خۆی مارە دەکا. نۆبەرەی بەرهەمی ئەدەبی سرڤانتس/رۆمانێکە بە ناوی لاگالاتیا لە سالی ١٥٨٥ بلاوی دەکاتەوە. سرڤانتس بۆ دابین کردنی بژێوی رۆژانەی خۆی و خێزانەکەی تەواوی شارەکانی ئیسپانیا دەگەرێ.

هەر لەو سەردەمەدا بەتۆمەتی دزی دوو جار زیندانی دەکرێ سرڤانتس وێرای ئەو مەینەتی و نەگبەتی و دەردەسەرییە بێ وچان نووسیویەتی و کۆلی نەداوە تاکو یەکەمین بەشی کیخۆتێی هێناوەتە بەرهەم. دوا بە دوای بلاوکردنەوەی کورتە «رۆمانە نموونەکان» بەشی دووەمی کیخۆتێی بەچاپ گەیاندوە، بەلام بەلێ بوونەوەی لە نووسینی پێشەکی رۆمانی Pealles مردن زەفەری پێ دەباو لە (٢٣)ی نیسانی ١٦١٦ زدا بەخاکی ئیسپانیا دەسپێردرێ.

**کیخۆتێ: EL QUIjote**

**بابەت و پاڵەوانەکان:**

یەکەمین بەشی سوارچاکی ناوەزمەندو ژیر دۆن کیخۆتێ دێ لا مانچا لە ساڵی ١٦٠٥ لە مەدرید بەدیار کەوتووەو پاش دە ساڵ دوایی دووەمین بەشی بە چاپ گەیاندووە.

لێرەدا دەمانەوێ ڕۆشنایی بخەینە سەر چەند ڕووداوێکی گرنگی ئەم ڕۆمانە مەزنە. دەمراستی ناوچەی مانچا، ئەلونسۆ کیخانۆ، بە هۆی خوێندنەوەیەکی زۆری کتێبی سوارچاکی ئەقڵی تێك دەچێت و ناوی (دۆن کیخۆتێ دێ لا مانچا) لە خۆی دەنێت و بڕیار دەدات ئاواییەکەی خۆی بەجێ بهێڵێت و لە پێناوی هەژاران دا وەکو سوارچاکێکی گەڕیدە بجەنگێت.

لە دوتوێی ئەو کتێبانەدا «دۆنیا دولسینیا تۆبۆسۆ» ناوێك دەدۆزێتەوەو لە خەیاڵی خۆی دا وەکو خانمێك دروستی دەکا، بۆ ئەوەی جێگای ئەو «ئەلاونزا لۆرێنزۆ» کچە لادێیە بگرێتەوە کە دڵی پێوەی بوو.

یەکەمین گەڕان و سوڕانی کیخۆتێ پاش دارکارییەکی باش لەلایەن چەند بازرگانێکەوە کۆتایی پێ هات، بەڵام پاش ئەوەی ...ەی گوندەکەی چاوێکی بە نێو کتێبخانەکەی دا خشاندوە، سەرلەنوێ دەستی بە سەرکێشی خۆی کردوەتەوە.

ئەمجارەیان بە هاوڕێیەتی «سانچۆ پانزا» کە بە ڕم هەڵگری خۆی دایدەمەزرێنێ. لەم گەشتەی دا ڕووبەڕووی چەند سەرکێشەیەکی گەورە دەبێت وەکو سەرکێشەیی ئاشەکانی «با» و پێکدادان لەگەڵ شوانکارەکان و سەرکێشەیی کەشتیوانەکان.

دۆن کیخۆتێ لە زنجیرە چیای «سییرە مۆرینا» دەمێنێتەوە چون لاسایی کردنەوەی «ئامادیس» پاکانە بۆ خانمەکەی دەکات، بەڵام کاتێ نامەیەك بە «سانچۆ» یە بۆ «دولسینیا»ی دولبەری ڕەوانە دەکات، مەنزڵگاکەی ئاشکرا دەبێت و قەشەو بەربەری ئاوایییەکی بە فڕوفێڵ ڕازی دەکەن بەڵکو بگەڕێتەوە جێ و شوێنی خۆی.

لەبەشی دووەمی ڕۆمانەکەدا ڕووداوەکانی سێیەمین دەرچوونی پاڵەوانەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە پاش سەرکەوتنی بەسەر هاووڵاتی سوار چاکی ئاوێنەکان، سانسۆن کاراسکۆو دوای ڕووبەڕووبونی لەگەڵ شێرەکان و چوونە ئاوەوەی ئەشکەوتی MOntesinos و دەکاتە کۆشکی دۆقەکان، ئەوانیش بە گردەوە سەیرەکانی دۆن کیخۆتێ یان رادەبوارد لە کاتی ڕێ و ڕەسمی بەخشینی دوورگەی «باراتاریا» بە سانچۆ. وای لێ دەکەن تاکو بەرەو شاری بەرشەلۆنە بڕوات و سەرلەنوێ لەگەڵ «سانسۆن کاراسکۆ» ڕووبەڕوو ببێتەوە بەڵام ئەم جارەیان لە ژێر ناوی «بلانکا لونا» (مانگی سپی). بەهەر حاڵ ئەم سوارچاکە پاش زاڵ بوون بەسەر دۆن کیخۆتێ دا ناچاری دەکا بگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی هەر کە دەگاتە ماڵی خۆی بڕیار دەدات ئەمجارەیان ببێت بە شوان، بەڵام تووشی نەخۆشییەکی سەخت دەبێت.

پاش وەئاگابوونی و ڕەت کردنەوەی هەموو کتێبە سوار چاکیەکان ماڵئاوایی لە جیهان دەکات.

**مەبەستی سرڤانتس:**

ئەگەر بهاتبایا ووشەکانی سرڤانتس دەقاو دەق شی بکرابانەوە ئەوا زۆر بە ساویلکەیی دەهاتە پێش چاو، چونکە بە گوێرەی ئەو وتانە ئەبوایا بمانووتبا «دۆن کیخۆتێ» تەنها بۆ «بێزارکردنی مرۆڤ لە چیرۆك و وڕێنە دروست کراوەکانی نێو کتێبەکانی سوارچاکی» بەولاوە هیچ شتێکی تری ئەنووسیووە لەوەدایە هاندەری سەرەکی بۆ لاسایی کردنەوەی پاڵەوانەکانی سوارچاکی بوو بێت، بەڵام کاتێ کە درێژەی بە نووسینەکەی داو پاڵەوانە سەرەکیکە دروست بوو، سرڤانتس بە پێویستی زانی بە نەرمی لەگەڵی دا بجوڵێ و بەسەر مەبەستە کۆنەکەی دا زاڵ بێت و تەنها بایەخ بە تەواوی کەسایەتی ئەم پاڵەوانە بدات، ئەویش لە پێناوی مەبەستێکی جوامکاری خاوێن.

**خەیاڵ و واقیع**

لەسەرەتادا خوێنەرانی «دۆن کیخۆتێ» تەنیا فاکتەرە گاڵتە جارییەکانی ئەم ڕۆمانەیان پێکاوە وەکو شێتی پاڵەوانەکە، قەڵفانە کۆنەکەی و لایەنە پێکەنیناوێکەی لە زۆر شوێندا... بەڵام پاش ئەوەی کە ماوەیەکی بەسەردا چوو ئاوڕ لە چەند ڕوویەکی تری ڕۆمانەکە درایەوە: زەقی تێنەگەیشتنی دەوروبەرەکەی و بێ ئەوەی بزانن کە سەرچاوەی ئیلهامی ڕەوشتی خێرخوازانەی سوکایەتی کردنە بەوانەی کە تاکو ئەو کاتەی نکوڵییان لەوە دەکرد کە خۆشەویستی مایەی جوڵانەوەی چالاکییەکانی دۆن کیخۆتێیە لە کۆتایی دا هەموو شتێك بێ هودەیی پاڵەوانێتییەکەیەتی.

ئالێرەدا، هەر لە سەردەمی رۆمانتیزمەوە، راهاتووین و دەبینین لە رۆمانی کیخۆتێ دا مرۆڤ تووشی ململانێیەکی تراژیدیانەی سەخت بووە، کە چەند ئیدیالێکی خێرخوازانە بوونەتە ماندەریو بە بەردەوامیش لەگەڵ واقیعدا رووبەروو بۆتەوەو لە راپەراندنی مەبەستە ماقوولەکانی سەرناکەوێت، بەرامبەر بە هەر کارێکی چاکەی تووشی لێدان و ریسوا کردنێکی سەخت دەبێت.

**کاڵتە جاری سرڤانتس.**

ئەگەر مەبەستی سەرەکی سرڤانتس ئاراستەکردنی ئەم کێشەیە بووبێت یان نا، ئەوە پێویستە لەو روانگەیەوە تەماشای بکەین کە چ هەلوێستێك بەرامبەری دەنوێنێ‌و چۆنیش مامەڵەی لەگەڵ پاڵەوانەکەی دەکا. ئایە گاڵتە بە دۆن کیخۆتێ دەکات، یان هاوخەم و هاوشەریکی بۆ چوونەکەیەتی؟. ژیانی تایبەتی سرڤانتس وەلامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە.

سرڤانتس لەسەردەمی لاوێتی‌دا زۆر رەوشتی قارەمانێتی نواندوە، لە شەری (Lepanto) دژی تورکەکان جەنگیوەو بەسەختیش لە دوو جێوە بریندار کراوە. چەندین جاریش لە سەردەمی دیلایەتی ژیانی خۆی خستوتە مەترسی‌یەوە لە پێناوی قورتارکردنی هاورێیەکانی. سرڤانتس خوێنەرێکی چاکی کتێبەکانی سوارچاکی بووەو هەموو مێشکی و ئەندیشەی عەودالی سەرکێشەکانی پاڵەوانە فانتازی‌یەکانی ببوو. پاشان تووشی کوێرەوەری و نەبوونی‌و پیری بووە، بە واتایەکی تر لە هەموو خەونە سەوزەکانی نائومێد بووە. تراژیدیای دۆن کیخۆتێ هەر کت و مت تراژیدیای ژیانی نووسەرەکەیەتی.

وێرای ئەو هەموو کارەسات و نەگبەتی‌یە سرڤانتس گەشبین بووە: سەرەرای چێژتنی تفت و تاڵی نوشستی‌یەکەی هەر بەردەوام بروای بە بەها بەرزەکانی رۆح پتەو بووەو بەلایەوە پەسەند بوو کە بە رویە کی پێکەنینەوەد بروانێتە غەم و پەژارەو نائومێدیەکانی پاڵەوانەکەی هەتاکو بکەوێتە نێو رەشبینی‌یەکی سلبی‌یەوە. جا لەبەر ئەوە، هەرچەندە هەڵسوکەوتی دۆن کیخۆتێ بەراشکاوی زۆر کەرەت گاڵتە ئامێزی‌یە، بەلام وێنەکەی بە تارایەکی ماقوولانە دەپۆشرێت و لەلای ئێمەدا بزووتنەوەیەکی سەرنج راکێشەری پتەو دروست دەکات.

گاڵتە جاری بەلای «سرڤانتس»ەوە یەکسانە بە زەردەخەنەی تێگەیشتنی ئەو کەسەی کە لە بنەرەت دا لەگەڵ رەخنەگر تەبایە. ئا لێرەدا رستەکەی (Menéndez) ی مێژوو-نووسی بەناوبانگی ئیسپانیمان وەبیر دێتەوە کە دەڵێت: «دۆن کیخۆتێ بۆ لە ناوبردنی بیرۆکەیەك دروست نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بۆ گۆڕین و بەرزکردنەوەی پلەی ژیری ئەو بیرۆکەیە دروست بووە».

**کیخۆتێ‌و کەلتوری نەتەوایەتی:**

گرنگی نەتەوایەتی کیخۆتێ لەوەدایە کە ئەو بەرهەمە گەورەیە پێك هاتووە لەو دوو بۆچوونە کە کەلتووری نەتەوایەتی ئیسپانی پێناسە دەکەن: بۆ چوونی یەکەم تەمسیلی بەهای جیهانی خەیالی دەکاو دووەمیشیان ئەو بۆ چوونەیە کە پێشنیاری وژدانێکی زیندووی واقیعیانە دەکا.

«دۆن کیخۆتێ» رەوشتە بەرزەکانی خۆی - وەکو خۆشەویستی، چاکی، پاڵەوانێتی - کردۆتە هۆی مانەوەی، کەچی «سانچۆ»ی برادەرو هاوەڵی زۆر بە ژیری‌و وریایی‌یەوە -مروانێتە واقیعی ماددی. بە ئەمەش هەمان ئاستی ئەو دوو فاقی‌یە لە شاکارە ئەدەبی‌یەکانی تری‌دا بەدی دەکەین، بە تەنیا لە بەرهەمەکانی سرڤانتس دا، ئیدیالیزم و ریالیزم وەکو دوو تەوەری ناتەبا خۆیان وەدیار ناخەن، بەڵکو هەمیشە وەکو خودی ژیان تێك ئالاون و بەم جۆرەش دەبینین «سانچۆ» کەوتۆتە دوای بۆچوونی ئاغاکەی‌و دۆن کیخۆتێش پاش چەشتنی کۆمەڵێ ئاقیکردنەوەی تاڵ واز لە عەقلیەتی سوارچاکی دێنێ.

**بەهای جیهانی‌ی کیخۆتێ:**

هەرچەندە کە کیخۆتێ بە چەندین شێوە شی کراوەتەوە، بەلام هەردوو پاڵەوانەکەی بەلای زۆربەی خوێنەرانەوە، بریتین لە رەمزەکانی هەلوێستی ئایدیالی‌و ماتریالیزم و بروایەکی کوێرانەش بە بەهاکانی رۆح و مانای پراکتیکی ژیان. لەگەل ئەوەشدا، بایەخی جیهانی‌ی یەکەمین رۆمانمان لە ئەوەوە نەهاتوە کە دۆن کیخۆتێ‌و سانچۆ هەندێ هەلوێستی دیاریکراو بەرجەستە دەکەن، بەڵکو لە ئاخی لایەنە مرۆڤایەتیکەیەوە هەڵقولاوە. بەلامانەوە پتر لەوەی لە چەند نموونەیەك کە خوڵقێنرابن بە گوێرەی مەبەستێکی پێشەکی،

چەند گیان لەبەرێکی زیندوون کە سەر بەخۆو بەبێ ویستی نوسەرەکەی دەجولێنەوە، فیگەری رەق وشك نین کە هەمیشە وەکو خودی خۆیان بن، بەڵکو کەسانێکن کە لەژیانی تایبەتیەوە هەڵقولاون و بە پێی ئەو فاکتەرانە پەرە دەسێنن و کەسایەتیان دیاری دەکەن، یان رێچکەی ئەو ئیقاعە دەگرنە بەر کە یاساکانی بوونی مرۆڤایەتی بەسەریانیدا سەپاندووە.
لە دووەمین بەشی ئەم شاکارە دەبینین ئەو پرۆسیسە سایکولۆژییە کامڵ دەبێت کە دۆن کیخۆتێ بەرەو نا ئومێدی دەبات، کەچی «سانچۆ» هەست بەوە دەکات لە ناخیدا سەودایەکی ماقووڵی خێرخوازانە و عەدالەت لە دایك دەبێت، کە بەرهەڵستی خۆ ویستییە نموویەییەکانی دەکا.

ئەوەی شایانی باسە، ئەگەر بێت و هەمووومان بەهایەکی ...مرورنەیی بەرز بە هەردووکیان ببەخشین، بە هەر شێوەیەك بووبێت، ئەوا لە ناویان دا رەنگ دەدەنەوەو ئەو ویستە بۆ ناخی ...نیقەتە مرۆڤایەتییەکە دەگەرێتەوە.

بەشی یەکەم و دووەمی ئەم رۆمانە:

هەردوو بەشەکەی دۆن کیخۆتێ، سەبارەت بە تەکنیکی هونەریی گێرانەوە، کۆمەڵێ جیاوازی دیاریکراو پێشکەش دەکەن.

لەبەشی یەکەم دا چەند کورتە رۆمانێك بە (حبکة)ی سەرەکی رۆمانەکەوە خۆیان دەبەستنەوە، کە سەرجەم دەبنە نموونەیەك لە جۆری گێرانەوە: بەم جۆرە لە چیرۆکی «مارسیدا و کریستۆما» کە کورتە رۆمانێکی (شوان) یەو لەچەندین کورتە رۆمانی تری ئەو لایانە هونەریانە بەدی دەکەین.

بەشی دووەمی رۆمانەکە، لەبەر چەند هۆیەك، لە بەشی یەکەمی کامڵ ترە. شێوازەکەی پەردە لەسەر رووی وریاییەکی ژیرانە لادەدات و کاریگەری هەزەڵ چیدی بە دوای شێوە ناشیرینەکان دا ناگەرێت و توانیویەتی لەمەو پاش شێوەی پاراوتر بەکار بهێنێت و کەسەکانیش مۆرکێکی ئاڵۆزتر وەردەگرن، کاتێ کەشنەبای پێشکەوتن لێییان کار دەکا. لێرەدا وابێ ئەچێ سرڤانتس سۆزو تەبایی لە پاڵەوانەکانیەوە وەرگرت. بێ، چونکە لە هەموو جارێك زیاتر گرنگییەکی زۆری بە بەرهەمی تایبەتی خۆی داوە، ئەوەش رێگا بۆ ئەوە خۆش دەکات کە چیرۆکەکە مۆرکێکی بە پێزتر پێشکەش بکات و جوانکاری و سایکولۆژی ـ رەنگ دانەوەیەکی گەورەشی هەبێت. بەپێی ئەم پێوەدانگە رەنگە ئەوەیان لە هەمووی توندترو تیژتر بێت کە دۆن کیخۆتێی سەودا سەرو نائومێد پاش شکست هێنانی لە بەرشەلۆنە عەقڵ بگەرێتەوە شوێنی خۆیو پاشان بمرێ. کاتێ کە بینی ئاواتەکانی نەهاتنە دی.

وادیارە سرڤانتس لەم بەشەدا کلیل شا[...]کەیمان بەدەستەوە دەدات، چونکە بەمردنی دۆن کیخۆتێ، «ئەلۆنسۆ کیخانۆ» سەر لەنوێ وەدیار دەکەوێت، وەکو پیاو «چاکێك» بۆ ئەوەی پیشانمان بدا کە دڵسۆزترین پاڵەوانی رۆحی و هاندەری جەوهەریی کردەوەکانی ناکەوێتە ناو خانەی شێتی سوارچاکێکی ساکار، بەڵکو لە ناخی سەرچاوەیەکی خێر خوازانەوە هەڵقولاوە

ئەمانە بە تێکرا چەند ساتێکی قەتعین و واتاو مەغزایەکی قووڵ دەبەخشنە تێکرای چیرۆکەکەو تراژیدیا کۆمیدیایە ترسناکەکەی ژیانی پاڵەوانەکەمان بۆ روون دەکەنەوە.

## سەرکەوتن و کاریگەریی دۆن کیخۆتێ

دۆن کیخۆتێ هەر لە یەکەمین رۆژی دەرچوونیەوە، سەرکەوتنێکی چاکی وەدەست هێناوە، هەر لە سەردەمی ژیانی سرڤانتس دا شانزە جار لە چاپ دراوەو پاشانیش وەرگێڕاوەتە سەر زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان، سەرەرای بەردەوامی سەرکەوتنی، بەلام لەهەر سەردەمێك دا بەشێوەیەکی جیاواز شیکراوەتەوە: ئەگەر لەسەدەی هەژدەدا تەنها وەکو کتێبێکی نایابی گاڵتەو گەپ کات بەسەرابردن تەماشا دەکرا، ئەوا لەسەردەمی رۆمانتیزم دا وەکو رەمزی ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ریالیزم لە قەڵەم دەدرا. کاریگەری ئەم رۆمانە لەسەر جیهانی رۆمان نووسین دا زۆر بە گوڕ بووە: تەنیا ئەوەمان بەسەکە چۆن کەڵە رۆمان نووسەکانی سەدەی نۆزدە (فلوبێرت، دیکنز، تۆلستۆی، گالدۆس)، بایەخێکی زۆریان پێ داوەو تەنانەت «سرڤانتس»یان بە دامەزێنەری رۆمانی مۆدێرن ژماردووە.

سەرچاوە

مێژووی ئەدەبی ئیسپانی Historia de la literatura Espanola
نووسینی / خۆسێ گارسیا لۆپێز Jose Garcia Lopez

چیرۆك

# تلانەوە

نووسینی / ئەلبیرتو موراڤیا
رەوەز لە ئینگلیزی‌یەوە وەریگیراوە

لۆرێنزۆ ئۆتۆمبیلەکەی راگرت و رووی کردە لاوەکەو وتی :

ـ دەی ، ئێستا دێیتەسەرێ یا دەتەوێ هەر لێرە بمێنیتەوە ؟ دیتی لاوەکە بەتەمبەڵی‌یەکەوە سانی هەڵتەکاند .

کێ بێتەسەری ؟ من نایەم ، بشمکوژن نایەم.

لۆرێنزۆ، بێئەوەی هیچ بڵێ ، ماوەیەک تێی راما ، لاوێکی جوان ، رەشتاڵە، روخسار شەخراو چاو رەش وتەڕ کەلەشێوەو قەوارەدا هەر لە چاوی ئافرەت دەچوون ، لووت کورت و هەوەس بزوێن ، لێویشی تا بڵێی گەش و گۆشتن بوو .بەڵام ئەمانە بەلای لۆرێنزۆ نەک تەنیا قێزەون بەڵکو سەرسورهێنیش بوو، بۆیە لەدڵی خۆیدا وتی : چۆن دایک وباوکی هەستیان بەهیچ نەکردووە؟ روخسارێک بوو بەئاشکرا هاواری دەکرد.

لۆرێنزۆ بەبێزاری‌یەکەوە وتی :

ـ لێونیلو، گەر ئاوهای وەربگریت ، باشتر وابوو نەهاتبای بۆلام .

ـ ئەی چۆن وەربگرم ، کوێخوای ماڵ ؟

ـ دەزانی گەر لەسەر ئەم رەفتارەت بەردەوام بێت ، ئاقیبەت خۆت لەزینداندا دەبینی‌یەوە؟

کورە تەنیا سەیرێکی کرد، لەسەر کوشنی ئوتومبیلەکە پاڵی دایەوە، نیوەراکشانێک پاڵ کەوتبوو، سەری بەپشتا خستبوو، ملە ئەستورەکەی بەنێو بلوزە هاوینی‌یەکەی دەرپەڕی بوو. بەڵام هیچی نەگوت . هەمیشە لەکاتی رووبەرووبونەوەی پرسیاری ناخۆشدا بەمجۆرە رەفتاری دەکرد. لۆرێنزۆ پێی داگرت

ـ باشە، ها بەلای کەم بزانین بۆچی واتکردووە؟ دیسان بێدەنگی . نیگای نێوچاوانی کوڕەکە لە نێوان برژانگە درێژەکانی‌یەوە دادەرژا لۆرێنزۆی قەلس کرد.

ـ ئەی کەواتە بۆچی هاتی بۆلام ؟

ئەمجارەیان لێونیلو بڕیاریدا قسە بکا، بە هێواشی‌و توڕەی‌یەوە وتی :

ـ بۆیە هاتم بۆلات چونکە وامدەزانی زیاترلێم تێدەگەیت ، بەڵام گەر لەوەزیاتر هەڵمپێچی هەست دەکەم ڕێم گوم کردووەو هەڵەم کردووە.

ـ لەچی هەڵەت کردووە؟

ـ لەوەی کەهاتووم بۆلات

لۆرینزۆ بەهەشت و لەئۆتۆمبیلەکە دابەزی , بە توندی دەرگاکەی پێوەدایەوە .

ـ باشە ، هەرلێرەبە، من دەڕۆمە سەرێ .

بەلام هەرکە لەئوتۆمبیلەکە ڕەت بوو ونەبوو، سەیری کرد کوڕە بەدەستە خاوو خلیچکەکانی لێی دەپاڕێتەوە، بەلام بەئاستەمیش باری دانیشتنەکەی خۆی تێک نەدابوو. بۆیە لۆرینزۆ هەڵوەستەیەکی کردو بەتورەییەوە وتی :
- ئەی ئێستا چیت دەوێ
- جگەرە
پاکەتەکەی بۆ دەموچاوی فڕێدا و خۆی کرد بە هۆڵەکەدا، کاتێ کەلەبەردەم ئەسانسورەکەدا ڕاوەستابوو بەسیلەی چاو سەیری کرد ژنێک لەئۆتۆمبیلەکە نزیک کەوتەوەو لەگەڵ لیۆنیلۆدا دەستی بەقسان کرد. ئەم یەکسەر ناسییەوە. گیگلیۆلای خوشکی کوڕە بوو.
لیۆنیلو بەسەروسیماو ڕەفتاریدا بەزەحمەت لە بەرەڵلایەکی قەراغ شار دەچوو جا چ سەبارەت بەوەی خۆی پەروەردە کردبوو یاهەر خۆرسک وابوو کەچی گیگلیولای لەشرولار شلومل لەسۆنگەی سمت بادان و روخسارە بێ هەینەکەی و دووچاوە زۆر درشتەکانی و دەمە گەورەکەیەوە لەوێنەی کچانی ئەو ناوە دەچوو.
لۆرینزۆ بۆئەوەی گیگلیولا پێی بگاتەوە بە ئانقەست خۆی لای ئەسانسورەکە ماتڵ کرد سەرەنجام دیتی بەرەبەرە نزیک دەبووە. مەرمەرە بریقەدارەکانی هۆڵە گوشادەکەی پەی کرد. نیوەی لەشی رووت بوو. جل وبەرگەکەی دەتگوت لە دەسماڵێک هەڵبڕاوە. شان وقول و سینگوتەنانەت قاچیشی تاژوور ئەژنۆی بەدەرەوە بوون.
لۆرینزو دیقەتیدا شێوەی قژ چاکردنەکەی کە هێلکەیی بوو، نێوچاوانە نزمەکەی کە هەر دوو پەنجە بەرز دەبوو، بچووک تر کردبووە.
گیگلیولا خۆی بەئەسانسورەکەدا کردو بێ چاک و خۆشی کردن لە لۆرینزۆی پرسی :
- لیونیلۆ چ خێریەتی ؟ بۆ نایەتەسەرێ ؟ بۆ لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا خۆی شاردۆتەوە؟

لۆرینزۆ، بەدووایدا چووە ناو ئەسانسورەکەو بەدەم دەرگا داخستنەوە وتی :
- لیونیلۆ تووش هاتووە.
- تووشی بەڵلایەک هاتووە، نا ؟
- بەلایەکی خراپیش
- چی کردووە ؟
- کچی چاک، نەتبیستووە: قسە بکەوێتە زارێکی دەکەوێتە شارێکی بەتۆی بڵێم دەسبەجێ سەرلەبەری شاری ڕۆما دەیزانێتەوە.
- بەهەرحاڵ، وێڕای ئەمەش وابزانم کەمێ سەری لێ دەردەکەم. لیۆنیلۆو کوڕەکانی دی هەمیشە دەیانگوت: بۆشکاندنی دەقی یەک ئاهەنگی ژیان شتێکمان بەدەستەوەیە.
گیگلیولا ئەم قسانەی بەجۆرێ کردن دەتگوت لەبەری کردوون، زرینگیو جدیەتێکی ئەوتۆشی لەگەڵدا ئاوێتەدەکرد کەلۆرینزۆی پێ ویستی خۆی هێنایە پێکەنین.
- کچی وانەلێی ؟
- بەگیانت قەسەم، دەشیانگوت کارێکی وادەکەین هەموو ڕۆژنامەکان لەسەرمان بنووسن. منیش حەزمدەکرد بەگەڵیان بکەوم، بەلام قەبوولیان نەکردم گوتیان ئەو شتانە کاری ئافرەت نین.
ئەسانسورەکە وێستا و ئیدی ئەوانیش چوونەدەرێ پێش ئەپارتمانەکەش وەک هۆڵەکەی خوارێ مەڕمەڕ بوو. لۆرینزۆ رووی کردە کچەو قۆڵی گرت و وتی:
- گوێ بگرە بزانە چیت پێ دەڵێم. ئەگەر براکەی خۆت خۆشدەوێ نابێ هیچ کەسی ئەو قسانەی کەتازە پێت گوتم لەتۆی ببیستێتەوە
- گەر پێم بلێی لیۆنیلۆ چیکردووە، مەرج بێ لای کەس نەیاندرکێنم، ئەگینا قسەکەی بۆ تەواو نەکرا، چونکە لۆرینزۆ هەردوو قۆڵی گرت و وتی :
- گەوج مەبە، نابێ ورتەت لەدەم دەربێتەواو

ـۆرینزۆ توند توند قۆڵی گرتبوو، سەیری کرد ـەحۆریٚ تێی دەڕوانی کە بەئاستەمیش تووڕەبوونی ـنوە دیارنەبوو.

ـا ش چەند، گیگلیولا بەدەنگێکی نیمچە لەخۆ ـا بیانەوە وتی:

- ئەمە چ جۆرە ڕەفتارێکە

گیگلیولا بەدەم ئەم قسانەوە زگێکی لە ـۆرینزۆدا. بۆیە لۆرینزۆ دەسبەجێ قۆڵی بەرداو حێرا وتی:

- وێڕای هەموو ئەمانەش، لیونێلۆ جارێ وەک ـەوانی دی تێوەنەگلاوە بۆیە گەر قسان نەکەی ـەنگە بەسەلامەتیش رزگاری بێ. تۆیش دەست لەم ـەوجێتییە هەڵگرە.

کچە بەگاڵتە پێ هاتێکەوە وتی:

- چاوچاو لەم قسەزلانە.. بزانە چۆن خۆی ـردوە بەکوێخوای هەمووماں ئیدی دەرگاکە ـرایەوەو خزمەتکارێکی چاکەت سپی لەبەر بۆ ـێش هۆڵەکە رێنوێنی کردن.

گیگلیولا لێرەدا خواحافیزی لێ‌کردو بەدەم نارە ـ زو سەماکردنەوە خۆی بەنێو تاریکایی ـارەوەکەدا کرد.

خزمەتکارەکەش لۆرینزۆی بۆ ژووری وێنەکێشان ـرد.

دایکی لیونیلو، گیولیا، لەگەڵ پیاوێکی چکۆلانەی ـەرتاشدا کەشریتێکی پێوانەی بەدەستەوەبوو ـەنێو ژوورەکەدا دەسورایەوە، بێئەوەی بوەستێ دەستی لۆرینزۆی گوشی و وتی:

- بمبورە، جارێ دەبێ مەسەلەی بەرگی ئەم کورسییە هاوینیانە لەگەڵ کاکی کوشنچیدا ـرێنمەوە. هەرئێستا دێمەوە خزمەتتان.

لۆرینزۆ دوودڵ بوو لەوەی ئاخۆ کە کارێکی جوانە پێش دیتنی مێردەکەی قسە لەگەڵ خۆی بکا. سەرەنجام بریاریدا کە ڕەنگە کارێکی خراپ نەبێ چونکە هەموو شتێ لەومالەدا بەدەست گیولیابوو. دوای ئەم راوێژکردنە لەسەر کورسیەک دانیشت و چاوی بڕییە گیولیا کەلەگەڵ کابرای کوشنچیدا مەسەلەکانیان تاوتوێ دەکرد.

گیولیا، ژنێکی بالابەرزی لاوازی، بارکەلەبوو وەک زۆربەی ئافرەتە خواپێداوو خانەدانەکان جلوبەرگێکی ڕەش وخۆڵەمێشی پۆشی بوو. قژە قاوەیییە جوان داهێنراوەکەی تاڵ تاڵە مووی سپی تێکەوتبوو. چاوەشینو بچووک و بەقوولا چووەکانی بێ ئۆقرەییان لێ دەتکایەوە روخسارە هێلکە ئاسایییەکەی وەک کەمێ هەڵپەنمابێ وادەهاتە بەرچاو خۆرەنگیشە لەبەر بچووکی لووتی بووبێ.

گیولیا، پاش ماوەیەک کابرای کوشنچی بەڕێ کردوهات لەتەنیشت لۆرینزۆوە دانیشت و دەستی بەقسان کرد. وەک هەمیشە باسی خێزانەکەی خۆی بۆکرد.

گیولیا هەژدەر هەژدەر قسەی دەکرد، ڕستەیەکی تەواو نەدەکرد کەیەکێکی دی تێهەلکێش‌دەکرد. تەنانەت زۆرجار ڕستەکانی بەیەکترشیان نەدەخوارد. ڕێک وەک ئەو جگەرەکێشەنا قولایانەی کە جگەرە بەقونچکی جگەرەی پێشوویان پێ‌دەکەنەوە دەتگوت لەوەدەترسی لۆرینزۆ قسەکەی پێ ببرێ و هەوالێکی ناخۆشی پێ بلێ. لۆرینزۆ چەند جارێک هەوڵیدا ئەم قسەیە

- گوێ بگرە، گیولیا، بۆ مەسەلەی ڕەفتاری منالەکانت هاتووم. دەمەوێ لەبارەی لیونیلووە هەندێ قسانت بۆ بکەم.

تێهەلکێشی قسەکانی بکات کەچی هەموو جارێ دیوارێکی ئەستوری لەبڕین نەهاتووی قسە بەرەنگاری دەبووەوە.

لۆرینزۆ لەدڵی خۆیدا وتی: سەیرە لەقسە کردندا لەکەسێکی ویژدان ئاسودەو خەیاڵ ڕەحەت

# کەلاوەکەی گوڵچین..

محمد نوری توفیق

سێ کۆشکی باڵا بەرزو رازاوە کەلاوەیەکی کۆن و پەککەوتەیان دابووە ناو، بەچەشنێ راست و چەپ و دیوی پیشتەوەیان لێگرتبوو تەنگیان بەکەلاوە داماوەکە هەڵچنی بوو، کەلاوەی بەسەزمان دەست خرابووە بینی ها ئەم زستانەیان زستانێکی تر هاتوو ئەتاسێو بەسەر یانا هەرەس دێنێ..

رۆژ نەبوو خاوەنی سێ کۆشکە باڵا بەرزو رازاوەکان جیا، جیا دەرگا بەپوورە گوڵچین نەگرن.. تەماعی زۆریان ئەخستە بەر بەنیازی ئەوەی ئەو (دووەڵە) لەناو دڵی خانووەکانیانا ریشەکێش کەن، ئەو ناوە لەو وەناقە پاك کەنەوە!

باڵا بەرزی دەستەراست:

- پوورە گوڵچین! پارەیەکی مۆڵم بۆ هەڵرشتووی!! بۆ خواپێت ئەڵێم ئەکەی ئەم هەلە لەدەست ئەو هەتیوانە بدەی! مانەوەی ئەم کەلاوە کۆنەیە لەبەر ناوەرۆی مندا خوانەخواستە ئەبێتە کارەساتێکی خراپ بۆتان.. پارەیەکی زۆرە هەتا مردن بەستانە!...

- وەك چەند جارێکی تر داوەیە بە پەنا گوێتدا.. ئەمن و ئەکورەزا، ئەم کەلاوەیە بەکلووری ئەم دونیایە چوڵ ناکەین.. نەك بەو پارەیە.. بگرەبە هەموو پارەی ئەو کۆشك و تەلارەتی نادەم کەبەتەمایە بمانکا بە پاروویەکی چەورو قووتمان بدا!.. ئەوەش چاك بخەرە ژوور سەرت کە مەگەر لاشەکانمانی تیا جێ بهێڵین.

باڵابەرزی دیوی پشتەوە.

- پوورە گوڵچین! بەزەییت بەخۆت و ئەو هەتیوانەدا بێتەوە!!و لەگەڵ شەیتان وەرە خوارەوە.. پارەیەکی ئەوتۆم بەکەلاوەکەت داوە هەرکەسێ بیبیستێ شێت ئەبێ!!.. کچێ بۆ خواپێت ئەڵێم کەلاوەکەت لەبەر ئاوەرۆی باخەکەمدا خۆی ناگرێو بەسەر خۆت و ئەو هەتیوە داماوانەدا ئەتلیسێتەوەو بەناخی زەویدا ئەتانباتە خوارێ!!.. ئەوسا ئۆباڵی ئەو بێ گوناهانە ئەکەوێتە ئەستۆی تۆ! بڕواشم نییە تۆیەکی خواناس و نوێژکەر گوناهی واگەورە هەڵگری!

گوڵچین لێی سوور بووەوە:

- چۆڵ کردنی نزرگەی باو با پیران لەئاین و زاتی خواپەرستاندا کوفرێکە هەر پاك بوونەوەی بۆنییە.. پاشەرۆژی خۆم و ئەم هەتیوانەش بە پاشەرۆژی ئەم خانووەوە بەندە، نەك بەفرۆشتن و چۆڵ کردنی..

باڵابەرزی دەستە چەپ:

- گوڵچین خان! هەر ئەم جارەیەو جارێکیتر نایەمەوە بەلاتدا.. پارەیەکم داوە بەکەلاوەکەت بەخەو نەتبینی بێت، گەر بۆمی چۆڵ نەکەی، ئەم زستانە چڵکاوی حەمام و ئاودەستەکەمان تەنگتان پێ هەڵئەچنێو بەسەر خۆت و کورەزاکانتا وێران ئەبێ ئەوسا هەر ئەبێ تۆ ئەو گوناهە گەورەیە هەڵگری!..

کوورەی مێشکی بەقسەکانی ئەم زیاتر وروژا:

- ئەرێ تۆ خەڵەتاوی.. یان خۆت ئەخەڵەتێنێ؟ رازی نابم هەموو رۆژێ ئەم هەرەشەیەم بەگوێدادەی!.. وا بۆ جاری هەزار ئەیڵێمەوە کە مەرگی خۆم و کورەزاکانم لەگەڵ مەرگی ئەم خانووەدایە کە ئێوە بە کەلاوەی ناو ئەبەن.. ژیانی ئێمەش بە ژیانی ئەم کەلاوەیەوەیەکە بە هەموو کۆشکەکانی ئێوەی ناگۆڕمەوە.

هەرسێ کۆشکە باڵا بەرزەکە یەکە، یەکە بەناچاری و مل شۆری پاشەو پاش گەڕانەوە دواوە، هەتا ئێستاش زوو خاوی گوڵچین بە گەروویاندا ئەچێتە خوارەوە.. وەڵامەکانی گوێیان کەڕ ئەکا..

ماڵکی ١١/١٩٨٨




# تارمایی

صلاح عمر

چەنــدین ساڵ پێش ئەمــڕۆ بووم بە تارمــایی و لە شەوێکی ئـەنگوستە چاودا خواوەند نەفرەتی لێ کردم. خواوەند نەفرەتی هەمیشەیی لێ کردم و لە بەر دیدی هاوەڵ و دایك و باوك و خوشکەکانم دیار نەمام. چوومە ژێر زەوی و لە سوچی تەنیاو کەلاوەی ڕوخاو و گۆڕستانەکاندا خۆم حەشاردا. لە نێو تاریکی دا ون بووم و ئەوێ بووە شوێن مەنزلگای هەمیشەیم.

وا دیارە شێوەو ڕوخســارم لە شێوەو ڕوخساری ئادەمیزادی ئاسایی ناچێ و وەك یەکەمین ناشیرینی ئەم سەر زەمینەیەم خەڵك خیــەم لێ دەکەن. سەرو کەللەم سەرو کەللەی دێوو درنجێکی زەبە للاحەو منداڵ و ئافرەت لە زەبەلاحیم دەترسن. هەر یەکێ چاوی پێم بکـەوێ. لە زڵی و زەبەلاحیم دەڕەوێتەوە. خەڵك بە ڕقەوە سەیرم دەکەن هەر لە دوورەوە هەست دەکەم ڕقیان لێمە بۆیە منیش ناچارم ڕقم لێیان بێتەوە. جارێك و دوان نی یە تا بڵێم شتێکی ئاسایی یەو ڕۆژێکەو دەبڕێتەوە. ڕۆژێ و دوان و سێیان بوایە قەی نـاکـا. زۆرم چاوەڕێ کرد. وابێت هەم من ڕزگارم دەبێ و هەم ئەوانیش، کەچی وانـەبوو: ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت. نەمن هەستم کرد گۆڕانی لە تێڕوانینی خەڵك بەرانبەرم هەیەو نەئەوانیش وایان نیشان دا کە نیازێکی وایان هەیە. بۆیە بڕیارم دا منیش ڕقم لێیان بێتەوە، کە ئەوان دوژمنایەتیم بکەن بۆ منیش وانەبم، کە ئەوان لچ ولێوم بۆ هەڵێنن و بە شێت و جنۆکەو ملۆزم ناوبێن.

بۆ من وانەبم. وام لێ هات و دوژمنایەتی کردنی خەڵك بووە کردەوەیەکی هەمیشەیم. مەحاڵە بتوانم دەست بەرداری بم. بە تایبـەتی لە گەڵ کەسێکی دیار کراو. ناتوانم وانەبم. تا پێشم بکرێ هەوڵی لە ناوبردنی دەدەم.

تونـدتـرو کاریگەرتر دەچمە ویژەی و پتر ئەزیەتی دەدەم وەك چۆن ئەو لە نیوەشەوە شوومە کە لە دواوە باسکی تێ وە ڕێنام و زەبرێکی وای لێ دام و کردمی بە تارمایی و بەم دەردەی گەیاندم. لەو ساوەش تا ئێستە وەك سێبەر بە دواوەیم و لە دەرفەتێ دەگەڕێم زەبرێکی کاریگەر تری پێ بگەیەنم، بەڵکو ئەمیش وەك من دەبێتە تارمایی و لە ژێر ئەم زەبرەشدا وەك من ساڵانێکی دوورو درێژ بەژن و باڵای بنـوو‌شێتـەوە. یەکی بکەوێ و وەك من لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دا وە دەربنرێ. وەك ئاژەڵ بم و هاتبم پایەو مەنزلی ئەو داگیر بکەم. نیوەشەو لە پشتەوە پەلی گرتم بە پاڵە سوور لە کۆشك و تەلاری مرۆڤایەتی فڕێ دامە دەرەوە.

دەرگـاکـەشی خر لە سەر داخستم و بۆم نی یە جارێکی تر

بچمە ناوی. ساڵانێکی دوورو درێژە سەگ ئاسا تێ هەڵدراوم مامەڵەم لەگەڵ دەکرێ. گوڕەك و ژێرخانەکان وزێراب و تونێل نەبێ بۆم نی‌یە بەلایدا بڕۆم.

منیش لە بری ئەم کارەدا بڕیارێکی وام داوە و هەرگیز لێی پەشیمان نابمەوە. تاپێم بکرێ ئێش و ئازاری پێ دەگەیەنم. لەدەرفەتێکی واش دەگەڕێم لە دواوە دەست و مەچەکی توند شەتەك دەم. وەك چۆن ئەو بەخەنجەر کەوتە گیانم و پارچەی کردم. سەری بڕێم و لووت و گوێچکەی لێ کردمەوە. هەوەڵ جاریش ئەندامی نێرینەی لێ کردمەوە ئەنجا پەنجەو نینوك و قوڵ و باسك و قاچ و پرچ و لێوم لە پاشدا گۆشتی لەش و جەستەی سەرتاپا هەڵپاچیم و تەنیا ئێسقانی هێشتمەوە، دوا جاریش پارچەکانی کۆکردمەوە و لە نێو ئەو گۆڕەی بۆ ئافرەتێ هەڵکەنرابوو و من شەو هەڵمدایەوە، شاردمیەوە و خۆڵی بە سەر پارچەکانم داکرد. ئەو گۆڕەی بەیانی ئەو ڕۆژە بۆ ئافرەتێکی جوان و کەلەگەت و بەژن و باڵا زراق هەڵکەنرابوو و ئافرەتەکەش بەیانی زوو گیانی بە خاك سپاردبوو. ئەو ئافرەتەی تا لە ژیاندا بوو هیچ هەوڵێ نەما لە گەڵی نەدەم بۆم دەستەمۆ نەبوو و بە مردووی ویستم لەگەڵی جووت بم. ئەوشۆخەی بە مردوویش پەلکێشی نێو گۆڕستانی کردم و ئێوارە رایکێشامە ژووری گۆڕستانەکە.

ئالوودەی کردبووم و چەندین ساڵ خەوو خوارکی لێ حەرام کردم وەك لە ئەزەلەوە بۆم نووسرابێ گێچەڵێکی وا بێتە سەر ڕێم و نەتوانم بە سەریدا زاڵ بم. یا پیلانێکەو دیار کراوە لە نێو بازنەیەکی تەسکدا پتر نەتوانم بجوڵێمەوە. لە نێو دوو دیواربووم. دیوارێ لە ئاگرد دیوارێ لە عەشق و شێت و شەیدا بوونی ئەو. لە ژیاندا نەمتوانی نە بەرەو ئاگرەکە بڕۆم و نەلەو نزیك بمەوە. کە زیندوو بووم پێی نەگەیشتم، کە گیانی سپار عەشق بووە گوریسێك و خرایەملم.

لەویش یەکێ خۆی بۆ لە بۆسەنام و پەیتا پەیتا لە پشت کێلە بەردێ چاودێری دەکردم و هەر کە کاریش گەیشتە سەر بە ئەنجام گەیاندن، شالاوی بۆ هێنام بە دوای ئەمیشەوە خواوەند لە ئاسمان دابەزیو نەفرەتی لێ کردم. کردمی بە تارمایی. لە چارەم نووسرابوو ببمە تارمایی و هەربەم دەردەوە سەر بنێمەوە. شەوو ڕۆژ هەر تاری بم. نان و خۆراك بخۆم هەر تارمایی بم. ئەی ئەگەر وانەبێ بۆ وا لە ناکاو یەکێ لێم پەیدا بێ و پەلم بگرێ بەو شێوە ئاژەلانەیە پارچەم بکات و بەم خاتە نێو گۆڕو چۆنی زانی من هاتوومەتە نێو گۆڕستان و مەبەستم چی‌یەو دەمەوێ چی بکەم. بۆ گیانم. ببێتە ڕۆحێکی هەمیشە ئازار چەشتوو. کۆڵی ئازار بخرێتە سەر شانم و سیزیفانە بڕیار دراوە بەرەو سەرەوەی بەرم. لە سەرەوە دابەزم و سەرکەومەوە. دراندانە لەگەڵم جولایەوە، ئەگەر چی گوناحەکەی من گوناحێکی بچووك نەبوو بەڵام تۆڵەی هێندە بهێنێ لە تۆڵەی ئەم کارەدا بکرێمە تارمایی و وەك سێبەر بە دوای بکوژەکەمدابم ؟

کە ئەم بزربوو ڕۆحم لە گۆڕەکە هاتە دەرەوەو بە پەلە بەرەو ماڵ بوومەوە. لە ماڵەوەش وەك مرۆڤی زیندوویم واجولامەوە باوکم ئاگادار کردەوە کە تووشی چ گۆ بەندێ بووم و چیم بە سەر هاتووە و کێش وای لێ کردم. نیوە شەو باوکم بە دوای خۆم داو لە دوای ئێمەش چەند زەلامێ هاتن. گۆڕەکەیان هەڵدایەوە و پارچەکانی لە شەمیان کۆکردەوە و لە نێو تورگەیەکدا دایانام. باوکم خستمیە کوڵ زەلامەکان بە دوامانەوە بوون جار جار لە باوکم وەریان دەگرتم و بە نۆرە تا نزیك ماڵەوە هەڵیان گرتم. هێشتا فەرسەخێ مابوو بگەینە بەر دەرگا. دەنگی دایکم و خوشکەکانم گوێ لێ بوو هاوار هاوارو نوزە نوز کۆڵانی پر کردبوو. لەگەڵ دنگی ڕۆڵە ڕۆو سنگ کوتان و قژ ڕنینەوەی دایکم خۆشم گریام. خۆشم بۆ خۆم گریام. دانیشتوانی نێو کۆڵان سەرتاپا لە بەر دەرگای ماڵە کەمان کۆبوونەوە. لە بەر قەرەباڵغی دەرگا دیارنەبوو، مقۆ مقۆیێ بوو نەبێتەوە گەورەو بچووك. ئافرەت و پیاو واتێك قژ قژا بوون، دەرزێشت بهاویشتایە نە دەکەوتە سەر زەوی. هەندی بە دەنگی نزم دەدوان و هەندی هاواریان دەکرد. لێرەو لە وێ لە مەسەلەی کوشتن و جۆری کوشتنەکەم دەدوان، هەندێ دەیانزانی بۆ کوژراوم و ئافەرینیان بۆ بکوژەکەم دەرنارد و دەیانگوت:

دەستی خۆش بێ. کوڵ کوڵانی کردەوە. هەندێکی دیکە پێیان خۆش بوو کوژراوم بەڵام لە جۆری کوشتنەکەم ڕازی نەبوون و بکوژەکەمیان بە درندە لە قەلەم دەدا، گوایە نابێ مرۆڤ وەك ئاژەڵ سەر ببرێ.

هەر چوونی بوو باوکم دری بە خەڵکەکەی بەردەرگا داو بردمیە ژوورەوە. لە ژوورەوە بە زەحمەت توانی دامنێتە سەر زەوی، دایکم کە چاوی بە تورەگەکەی سەر شانی باوکم کەوت،

لە هۆرژنی گریانێکی وای دا حەوشەکە لەگەڵی هەژا یەوە، لەگەڵ گریانە کەشدا خۆی هەڵدایە بەر دەست و پێی باوکم و کەوتە رنینەوەی قژ و سەرو چاوی. تا دایکم بەخۆ هاتەوە خوشکەکانم لە نێو خۆیاندا شاردمیانەوە هاوارو فیخانێ بوو نەیێتەوە.

هێندەی دایکیشم کردی خەڵك نەیانهێشت لە نێو تورگەکە دەرم بێنن جۆری شۆردنەکەشم لەگەڵ مردووی ئاسایی جیاوازی هەبوو. هەر لە نێو تورگەکەوە ئاویان بە سەر پارچەکانم دا کرد. کەس زاتی ئەوەی نەکرد هەر جارەی پارچەیەکم دەربێنێ و بەشوات مردوو شۆر بانگ کرابوو بەڵام ئەمیش نەیدەوێرا دەرم بێنێ. نەك هەر نەیدەوێرا ئەمە بکات، بەڵکو ئەشیدە توانی تەماشام بکات. یەك دوانێ بە چاوی نوقاوەوە سەری تورەگەکەیان گرتبوو ئەمیش لە دوورەوە ئاوی بە سەردا دەکردم کە بەناو شۆردراوم. لە نێو دارەبازێ دانرام و هەربە تورەگەوەش کفن کرام پارچە پارچە لە ناو تورەگەکە ڕێکیان خستم و لە نێو کفنەکە بە درێژی ڕیزکرام. بە مەزەندەش سەروپێچیان لە شوێنی خۆیان دانا. ئەوسا لە سەر شێوەی مردوونێکی ئاسایی خرامە سەر شانی چەند کەسێك و بەرەو مزگەوت بەرێ کەوتن، لەوێ مەلایەك لە سەری خوێندم. ئینجا هەمدیسان هەڵیان گرتمەوە، کە گەیشتینە ناو گۆرستان، گۆڕگەم ئامادە کرابوو، هێندەی پێ نەچوو خستیانە نێو گۆڕەکەو خۆڵیان بە سەردا کردم. پاش هەموو شتێکیش باوکم تێر تێر لە سەر گۆڕەکەم گریا، هەتا یەك دوانێ نەهاتن و لە دواوە دەستیان نەخستە بن هەنگڵی هەڵنەستایەوە بە زۆر هەڵیان ستانەوە و بە زۆریش بە گەڵ خۆیانداو بردیانەوە ماڵەوە. لە ماڵەوەی پرسەی سێ ڕۆژیان بۆ دام زراندم. کە پرسەکە برایەوە من بوومە تارمایی و ڕۆحم لە نێو گۆڕەکە هاتە دەردوە. هەمدیسان گەڕامەوە ماڵەوە چەند ڕۆژی بێ ئەوەی دایکم و باوکم بمبینن لە کەلێنێ لە ماڵەوە خۆم مت کرد. لە ژێر سایتەی ژووری کرکەوتم. ئاگام لە هەموو هەڵس و کەوتێ بوو. گوێم لە هەموو قسەیەك بوو. لە نێو دڵیان دابووم. شەوان دەچوومە خەونی هەر دووکیان. دوای یەك دوو مانگ چووم خەبەرم لە بکوژەکەم داو بە گرتنم دا. بکوژەکەمیان گرت و لە بەندیخانەدا توندیان کرد. کە حوکمیش بە سەردا درا ئیتر منیش بە یەکجاری بارگەم پێچایەوە و دەرەوەم لە خۆم حەرام کرد. وەك ئەو چوومە نێو بەندیخانەو لە شێوەی تارمایی کەوتمە دوای.

لەوساوە ڕۆژێکم نەبواردوەو هەمیشە لە دەورو بەری بووم و بەپێی توانا چوومەتە وێزەی. شەو ونێو شەو خەوو خەونم لێ حەرام کردوە. لەوەخت و ناوەختا ئەزیەتم داوە لە نێو بازنەی بیرکردنەوەو دڵ و دەروونی دا بووم. لە بەر چاوی دابووم. لە پشت و لە پێشەوەی. لەتەنیشتەکانی، لە سەرەوەی. لە نێو مێشکی. لە جەستەی، لە بەر قاچی، لە بەر دەم و چاوی دا بووم. خەوو خۆراکم لێ کردۆتە زەهری مار.

لەوانەیە ئەو لە بیری ئەمابێ کەی هێنراوەتە ئێرە، بەڵام من لە بیرم ماوەو کەی بوو و بۆچی ولەبەرچێ. لە بیرم ماوە چ شەوێکی کپ و تاریك و بێ دەنگ بوو. چ شەوێکی ترسناك بوو. کاتێ لە گۆڕەکە نزیك کەوتمەوە، سەگیش بە دەرەوە نەبوو. دنیاکش و مات و چرپە چرپ نەدەهات. من ئەوسا مرۆڤ بووم و بە فرمانی شەیتان بەرێوە دەچووم. ئاگام لەوە نەبوو ئەوەی دەیکەم گوناهێکی گەورەیە. شەیتان بۆ گەیشتن بە مەرامی منی کردبووە پردو ڕێگاو بە سەرمدا تێدەپەڕی. زاتی خۆم مردوو لە نێو زاتی شەیتان دەژیام. کە شتێکم دەکرد تەنیا بە ناو من بووم لە ڕاستی دا شەیتان بوو دەیکرد بێ ئەوەی هەست بە بەزەیی بکەم و ویژدانم بجووڵێ، مەبەستەکانم بە جێ دەگەیاند.

ئەوەی دوا جاریش بە ئەنجامم گەیاند لە هەموو مەبەستەکانی تر گلاو تر بوو نامرۆڤانە تر بوو. لەوانەیە لە شوێنی تریشدا کرابێ، بەڵام بە دەگمەن پێ زانراوە و گوناهباریش تووشی گۆیەندێکی لەو جۆرەیەو منی تێ ئالاوم بووە. گوناهکار نەناسراوەو خواوەندیش دەم و دەست نەفرەتی لێ نەکردوە و نەبوە بە تارمایی و جنۆکە. بەم شێوەیەش ڕیسوا نەکراوە.

نەفرەتی هەمیشەییم لێ کراو بوومە ملۆزم و چوومە سەر سنگی بکوژەکەم لەو ساوە یەخە گیری بوویم و ئەوەتا بەم ڕۆژەم گەیاند. زنجیرەیەك مل ملانێو گرفتی سەخت بەو ڕۆژەی گەیاندین. هەر جارەی یەکێکیشمان دەبزین وئەوەی شەکەت و ماندووش بوایە لە مەیدان بۆ ماوەیەك دەکشایەوە کە دەشحەسایەوە دەهاتەوە مەیدان و دەکەوتەوە مل ملانێ و زۆرانبازی ئەو بە جۆرەها شێوە هەوڵی داوە لە خۆیم دوور خاتەوە جارێ بە نووشتەو جارێ بە دوعاو بسم اللەو ناو شێوە سوتاندنم، تابۆی کراوە بەرگری لە خۆی کردوە. من تا مرۆڤ بووم لە بسم اللە و ناو شێوە سوتاندن نە دەترسام بەڵام لەوەتەی بوومەتە

تارمایی زەندەقم لەم کارانە دەچێ و پەرێشان دەبم ماوەیەکی چاك ناوێرم توخنی کەوم هەر کاتێ نووشتەی لە مل کات ماوەیەك لێی دوور دەکەومەوە تەنیا لە دوورەوە بەرامبەری وەك چاودێری لە سووچی چاودێری دەکەم.

بە ناچاری بۆ ماوەیەك مەیدانی دژایەتی کردنیم چۆڵ دەکرد هەرچ کاتێکیش بەزانیبایە نووشتەکەی فڕێ دایە، دەستم بە ئەزیەت دانی دەکردەوە.

کە ئەو دڵنیادە بوو دیار نەماوم نووشتەکەی فڕێ دە داو منیش دەهاتمەوە مەیدان و شاڵاوم بۆ دەبردەوە.

ئەمشەویش کە زانیم بڕیاری ئازاد کردنی ڕاستەو هێندەی نەماوە ئیرە جێ بێلێ، ناچار بووم تەونەکەی سەر لەشم هەڵدڕم و دابەزم. کەداشبەزیم هەوەڵ جار هەر بۆ گاڵتە پێ کردن لە شێوەی تارمایی یەکەی جاران خۆم نیشان دایەوە جەزرەبەدان و ئەزیەت دانیم بۆ ئەو دیو هەڵگرت چوومە بەر دیدەی. چەند مەترێ دوور لەو هەڵتروشکام. بەرەبەرە هەست و بیرو هۆشیم بۆ خۆم بەکێش کرد. تروسکایی چاوەکانیم لە سەر جەستەی خۆمدا جێگیر کرد. چاوی لە سەر بەژن و باڵام دا چەسپ بوو. کە سەیریشی کردم قاقا بەرووەوە پێ کەنیم و زمانم لێ دەرهێنا لە پاشدا لچو لێوم لێ هەڵێناو لێی مۆر بوومەوە. دواجار بۆ ئەوەی دڵنیای کەم کە ماوم و وازم لێ نەهێناوە پتر خۆم لێ نزیك خستەوەو بە تووڕەیی یەوە تەماشایەکم کرد. بە دەستیش هەڕەشەم لێ کرد بە پەنجەڕاوەشاندن ترسێکم لە دڵدا ڕواند. بەڵام نەمزانی بۆ بایەخێکی وای پێ نەداوم و دەرکردوتن و هەڕەشە کردنەکەی بە هەند هەڵنەگرتوو بە هیچی نەزانیم. لە داخا تووڕە بووم و بڕیارم دا ڕێگە چاوەری جیا جیای لەگەڵ بە کاربێنم، هەر لە فروفێل و ئەزیەت دانی جەستەیی یەوە تا سیحرلێ کردنی. هەوەڵ جار بڕیارم دا لە شێوەی درندەیەك خۆی نیشان دەم. دەمزانی پیاوێکی جەر بەزەو چاوقایمە و بە ئاسانی بۆم دانا هێنی. گوتم ڕەنگە خۆم بکەم بە دەیناسۆر و ماموس لێم بترسێ و هەترشی لە زەبلاحی و ناشیرینم بچێ. نەمزانی بە دە دەنیا سۆرش لە شوێن خۆی نابزوێ و هەڕەشەشم لێ دەکا. تاقی کردنەوەکانی پێشو ترم بۆی دەرخستبووم بە چی وەڕس و بێزار دەبێ، بۆیە بە شێوەی دیکە خۆم گۆڕی. لە بوونەوەری بچووکەوە پێداهاتم،

خۆم کردە زەنگە سوورەیەك و چووم بلا ڕوو مەتێکم وەدا. دوایی وەك مارو دووشك لێ چوومە پێش و دەوریم تەنی، لە هەرچوار لاوە بە قاچی هەڵگەڕام خۆم لە ناوقەدی وەرێنا، سەرم بەرز کردەوە پێی وەبدەم نووشتەیەکی نیشان دام نەمزانی چۆن لە پەلە پەلیا لە ناوقەدی بوومەوە و شرپەم لێو دەهات. بوومەوە تارمایی ماوەیەکیش چاوەڕێم کرد ئەوسا توانیم لێی نزیك بمەوە. ئەمجارە وەك بزن مشك و سەگ و گورگ و شێرو پڵنگ، ئەوانەی ماون و ئەوانەی نەش ماون خۆم نیشان دا هەرچی ئاژەڵی ورشکانی و ئاوی هەیە تێم بەردا لە هەر چوار لاوە دەوریم دا بەڵام ئەو وەك پاڵەوانێکی ئەفسانەیی پێ لە یەك کاتدازەبری کاریگەری لە هەر هەموویان وەشاند و بەرسەر یەکیدا دوا جاریش وەك ئاژەڵێکی ئەفسانەیی سەر دەمی کۆن خۆم خستە بەر دیدەکانی، ڕووبەری ژوورەکەم کردە ئۆقینا نۆسی و لە نێو ئۆقیانووسەکەدا سەرم بەرز کردەوە، نیوەم ئادەمزادو نیوەکەی ترم ئاژەڵ. هەمدیسان گوێ پێی نەدام بۆیە ناچار خۆم کردەوە تارمایی لە نێو بازنەی بە تارمایی تەنراو تەنگە تارم کرد. هەر لە ناو بازنەکەشدا دادگایێکی کاتیم بۆ دامەزراند دادوەروشایەدو دانیشتوان هەر خۆم بووم بەحوکمی هەمیشەیی وسەر پەراندنی دڵم ئاوی نەخواردەوە، بڕیاری بوون بە تارمایی بوونیم دەرکرد وەك چۆن لە نیوە شەوە شومەکەدا بڕیارم دا ئەویش وەك من ببێ بە تارمایی و لە ژێر چاودێری و ئەمری منیشدا بجوڵێتەوە. وەك شاگردی هەرچی بڵێم نابێ سەرپێچیم بکات بڕیارەکەم بە دەنگی بەرز خوێندەوە بەڵام لە کاتی خوێندەویدا نەمزانی لە کوێ وەشاڵاوی بۆ هێناوم، کەوتمە بەر زەبری هێزێکی توند وەك کەرتە شاخێ بکەوێتە سەرم، خۆی هەڵدایە سەرم. خۆم لە بن دیوارێ دۆزیەوە. کە بەرەو ڕووشم هات خۆم هەڵدایە ژێر بن میچی ژوورەکە، دەستی درێژ کرد دامبەزێنێ، دەستی پێم نەگەیشت تووڕە بوو کە وام بینی قاقا پێ کەنیم وەك جار جاران بەرانبەر یەك هەڵتروشکاین هێندەشی پێ نەچوو ئەم کشایەوە وچوو بەرانبەر ڕێرەوەکە چاوی بڕیەوە سوچە تاریکەکەی لە وێوە یاساوڵەکان دەردەکەون منیش کەوتمەوە چودێر کردنی.

هەمەدیسان کردمیەوە چاو دێرو حەسحەسەکەی جاران و هەمدیسان کارو کردەوەم بووە چاودێری کردنی هەڵسی و کەوت و جوڵانەوەی، ئەوەتا وەك پشیلەیەك بەرانبەری دانووساوم، لە بەژن و باڵای دەڕوانم و هیچم پێ ناکرێ، بە دیاریەوە هەناسەی سارد هەڵدەکێشم. خەواڵە و ماندوو، لەش داهێزراو وەشك

جەنجاڵ چاوەڕێی دەرفەتێکی ترم شاڵاوی بۆ بەرم، ئەمجارەش بۆی دانەهێنام و ناچاری کردم لە مەیدانی دژایەتی کردنی بکشێمەوە، لە کاتی کشانەوە شمدا، وەك سەربازێکی بەزیوبم، لە دواوە شاڵاوی بۆ هێنام، نەمزانی لە کوێوە خۆی هەڵدایە سەرم، چاپوك نەبوومایە زەبرێکی کاریگەری لێ دەدام. کە خۆشم هەڵدایە ژێر بنمیچەکە بووە دیوارێکی پۆلاین و لە ناوەندی ژوورەکەدا چەقی، ڕەگ وریشەی بە ناخی زەویدا داکوتا، وەك دار گوێزێ دێتە بەرچاوم رەشابەی هاریش نەتوانێ هەڵیتەکێنێ، بڕیارە نا ئاسایی یەکەی دوێنێ ئێوارە بۆی بوویە ئاوی زیندوو بوونەوە بوژاندیەوە. قەدو باڵای چرووی دەرکرد و گەڵاکانی کەوتنە بەرتیشکی هەتاو هەتاوێکی سیحراوی گەرمایی خستەوە نێو لەشی و جۆش و خرۆشی سەردەمی گەنجێتی پێ بەخشرایەوە. دارێکیش تێر ئاو بێ ووشك بوونەوە و هەڵتەکاندنی دژوارو زەحمەتە،

نەك هەر ئەمە بەڵکو نە بەر دانەشە بەرگری لە بوون و مانەوەی خۆی دەکا. جار جارەش ڕەنگە هێرشی توندیشم بۆبێنی لە وەنەی لێرەین، هیچ کاتێ ئازایەتی وورەبەرزی دا پێوە دیارنەبووە بەم شێوەیەش ڕەنگ و ڕووی خۆش نەبوومو هەستی بە گەورەیی نەکردوە، سەرکەوتنیش بەم جۆرە بەرووخساریەوە دەرنەکەوتووە، بەلام خەیاڵی خاوە، ڕەنگە واش هەست بکا ئیتر ناتوانم بچمە وێژەی وبەیەکجاری لە مەیدان بکشێمەوە، ئەگەر چی ئەمشەو هەست بە ماندوو بوون وبێزاری دەکەم، بەلام نەژیوم وسرەوتیشم بۆنی یە، تا بۆم دانەهێنی.

بەردەوام هێرشی بۆ دەبەم و هەڕەشەی نەمانی لێ دەکەم. لە نێو تەونی جاڵجاڵۆکەو کونی دارو ئاسمانیش بم لە ئان و ساتی خۆیدا دێمەوە مەیدان، لە دەرەوە بە خۆشی نەوێرم زەفەر بە هاوسەر و خزم و ئاسیاوەکانی دەبەم. زەفەر بەمان بیم یانێ ژەفەرم بەو بردوە. ئێستە باوابێ.

ئێمەشەو لە دوو جیهانی جیاوازدا دەژیم، بارو دۆخەکە گۆڕاوە من لەشم داهێزراوەو ئەو چوست و چالاك، ئەو وورەبەرزو من وورەنزم. من هەست بەداتەپین دەکەم و ئەو بەرزە پێ وەستاوە و چاوە ڕێی یاساو لێ کە بێتە دوای، ئەو لە ساتی لە دایك بوون نزیك دەبێتەوە، وەك منداڵێك لە نێوزگی ڕۆژگاردا لە دایك دەبێ و من پەیژمێکی دیکە دادە بەزم. هەست دەکەم جەستەم وورودوخاش بوومو و ناتوانم بە پێوە بوەستم، هەرکە مژەی ئازار بوونی پێ بگات وەك ئاسك و سەر خاکەوە هەنگاو دەنێ منیش خاوخلیسك دەبمە سێبەرێکی هەمیشەیی بەژن و باڵای. نازانم بەم ناوە ختە ئەم بڕیارە نەگریسە چی بوو، لە ناکاو وەك تۆپێکی قورس کەوتە سەر سنگم، لێرە بمایە ڕەنگ بوو بتوانم ڕۆژێ لە ڕۆژان نهێنی و تەڵسمەکە بدۆزمەوە، لە ماوەی چاوچوقانێکدا بە سەر پەیژەی بووندا سەرکەومەوە، هەوەڵ جار لە شێوەی بنچگە گیایێ شین دەبووم و دەبوومە زیندەوەر، پاشان تەیرو ئەوسا ئاژەڵ. دوا جاریش،

وەك ئادەمیزادێ دەکەوتمەوە سەر زەوی و بە نێو دار و دەوەن و دەشتاییو. . . .

لە نێو ئافرەت و منداڵ و. . . . لە نێو. . . . دەچوومەوە ماڵەوە، دەچومەوە باوەشی دایکم، وەك جاری جاران لە ژوورێکدا دەخەوتم، خەونی ئادەمیزادا ئەم دەبینی، وەك ئادەمیزادێ دەکەنیم و دەگریام، خواردنی ئادەمیزادیشم دەخوارد. . .

ئەی خواوەندی هەمیشە زیندوو، ئەی پەروەر دگار، بمکەوە ئادەمیزاد، پەشیمانم لەو کردەوەیەی کردومەوە، ئەوەی کردم بە دەست خۆم نەبوو، شەیتان پێی کردم، دەبووایە شەیتانت دروست نەکردایە، هەبوونی شەیتان یانێ، تەڵەکە بازی وگوناح کردن و چڵیسی، کە دروستیشت کردوە مەهێڵە وەك داشی دامە یاریان پێ بکا، یا هێزێکی وامان پێ ببەخشە نەتوانێ زەفەرمان پێ ببات. کە ئەم هێزە شت پێ ڕەوا نەبینن، خەتای ئێمەنی یە، پیان بەخشە ئەمشەو هەست دەکەم بەژن و باڵای ئەم وەك کەرتە شاخێکی لێ هاتووە وترۆپکی سپی دەچێتەوە، بە سەر زەویدا داکوتراوە، ڕمانی دژوارو ئەستەمە. نارمێ. گەنج دێتە بەر چاو. مەگەر لە دەرەوە بتوانم زەفەری پێ ببەم، ئەگەر بارودۆخێکی تایبەتیم بۆ بڕەخسێ بارو دۆخ بگۆڕی، وورە بەر نادەم و نابەزم، لە دەرەوە سەرلە نوێ دەست پێ دەکەمەوە مەسەلەکە وا کەوتمە مەیدانی زۆررانبازیان بۆ دەرەوە بگوازێتەوە، زۆرانبازیش بە زیوو سەرکەوتووی تێدایە، هەڵبەزو دابەزی تێدایە، هەمیشە هەروابووە،

لە زۆرانبازیدا یەکێ دەبەزێ ویەکێ سەر دەکەوێ. بۆ من و ئەویش هەروایە، یەکێکیان دەبێ سەر بکەوێ و ئەوی دیکەش ببەزێ. یەکێکیان دەبێ وەك ئادەمیزاد بژی و ئەوی دیکەش وەك

تارمایی و جنۆکە لە تاریکی دا بژی یەکیان تارمایی بێ و یەکیان ئادەمیزاد یەکیان لە نێو تاریکی و یەکیان لە نێو ڕووناکی ڕەنگە جێگاکانیان بگۆڕی بە هەواڵدانێك و دووان و سێیان من ببمەوە ئادەمیزاد و ئەویش تارمایی، من خۆم نەمویستوە ببم بە تارمایی و لە قوژبن و بن دەرگان بکەوم، مۆرێشم نەکردوە تا ،دنیا ماوە، تارمایی بم، ڕەوای حەق نی‌یە بۆ هەمیشە لەو نێو تاریکی‌دا بم.

بۆ لە ڕووناکی بێ بەری بم بە دەست خۆم بێ لە ئێستە درەنگە تر نی‌یە خۆم دەکەمەوە ئینسان و دەچمەوە، نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، ئەگەر مەسەلە بووجەش بێ، ئەوا بووجەش داوە، بارمتەیەك بوو وتەواو، نیو سەدە بارمتەبووم، هەر چی ئازارو دەردەسەری هەیە بینیوە، ماندوویووم و شەونخونیم بینیوە، کوێرای چاوم داهاتووە، تێ هەڵدراوم، قامچی ڕۆژگار مەستەی کوتاومەتەوە و زامداری کردم، نیوە سەدەیە فرێ دراومەتە نێو کەلاوەو لەبن کێلە قەبرو گۆڕستان و کون و قوژبنی ژێر زەوی، هاوار دەکەم و دەپاڕێمەوە، سوجدە بۆ خواوەندبەم و دەنوزێمەوە، بمکاتەوە مرۆڤی جاران، گوێم بۆ ناگری، وەك ئەو بڕیارێکی تایبەتیم بۆ دەرنەچوو، ئەوەتا ئەو ئازاد دەکرێ، هەر چەند سەعاتێکی دیکەو ئێرە جێ دێڵێ. زۆری نەماوە بە ئاواتە هەمیشەیەگەی بگات،

ئەوەتا خواوەند گەنجێتی پێ دەبەخشێتەوە، بۆ منیش بفە باسی.... دەبێ هەرتارمایی و ملۆزم و مۆتەکەبم، ئەی خواوەندی گەورەو میهرەبان ئەمەکەی ڕەوای حەقە،

بۆ ئەو ئادەمیزادبێ و من جنۆکە، ئەوپاك بێ و من چڵێس، ئەو خۆشەویست ودڵ ئارام و دڵوڤان من ڕق هەڵگر و دڵ ڕەق، ئەو ئاسایی و من نا ئاسایی، ئەو قسەنەرم ودەم بە پێ کەنین و من نا، ئەو چەند سەعاتێکی دیکە ئادەمیزادێ دێتە دوای و لێرەی دوور دەخاتەوە لە دەرەوە سۆزو عەشق و پاکیش باوەشی بۆ دەکەنەوە، منیش ڕق و توڕەیی، نەك هەر ئادەمیزاد بەڵکو هەرچی بوونەوەری سەر زەمین هەیە نایەوێ سەرو کەڵلەو چارەم ببینێ، ناشیرینێکی ڕەزا قورسێکی وەك من، بە بەردو باران کردن و پەلکە شوتی پێشوازی دەکرێت. خەڵك حەقیانە لێم بترسن نازانم چی بکەم،

ناچار کراوم ڕقم لە خەڵك بێتەوە و ئەزیەتیان بدەم. کە ئادەمیزاد لەگەڵم وابێ ناچارم منیش وابم، لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر خۆم بگۆڕم. جارێ زیندەوەرو جارێ ئاژەل. گازل وگاه بچووك. گاه پەڕو باڵم هەبێ وگارووت و قوت بە سەر زەویدا بڕۆم، جارێ تووك و خوری لەشم داپۆشێ و جارێ پێستی ئاژەڵ. هەندێ جار لەرولاواز و هەندێ جاریش قەڵەو گۆشتن، زەبەلاح وگەورە وەك کەرکەدەن بچووك وەك مێرووله و مارمیلۆك، وەك ڕەنگە سوورومارو گوێسك و پشیلەو سەگ، وەك دێوو درنج و گوندە پەپوو و قەلەڕەشی گۆشت خۆر، خراومەتە لیستەی زیندەوەرو ئاژەڵ و باڵندە و لەگەڵ ئەوان پۆلێن کراوم، شوێنم زبڵ خانە و زۆنگاو گۆماوی بۆ گەنە. لە ژێرەوە دەژیم، نادیارم، لەوەخت و ناوە ختدا دێمە دەرو بەگژ جەستەی هەرچی ناوی ئادەمیزادە دا دەچم، بە تایبەتی ئەو. ساڵانێکی دوورو درێژە وەك مۆتەکە بە سەر سنگیەوەم، لە خەون و بێداریدا لە نێو جل و بەرگە و لەش و سەر ڕوومەت و وژێرنێنوك و خوێنەرو خوێنی دا بووم، لە نێو دڵ و دەروون و مێشکی‌دا بووم لە نێو گوێ و کونە لووتی دابووم، لە نێو قاپی خواردن پیاڵەو پەرداخی چاو ئاو خواردنەوەیدا بووم، ژەهری مارم دەرخوارداوە، برین و تێزابم خستوتە لەشی وزامدارم کردوە. نەمهێشتووە تێر بخەوێ، و قونجرکەم لە پێستی گرتوە، وەك کێچ و ئەسپێ بە پێستی هەڵگە ڕاوم خوێنم هەڵمژتوە، بەرەو مێشك و نارەوەی هەڵکشاوم. دەیەها جاریش لە شێوەی شەیتان و ڕێوی، باز خۆم نیشان داوە و بۆ ترساندن و تۆقاندنی شاڵاوم بۆ بردەوە و گەمارۆم داوە، بە حەقە و ناحەقە چوومەتە وێزەی و لە مەودواش هەروادەبم. لە دەرەوەش دەرفەتم بۆ ڕێك بکەوێ وازی لێ ناهێنم. زەبری کوشندە تری لێ دەوەشێنم، خۆ ئەگەر لە دەرەوە بمتوانیایە کۆشك و تەلاری تێشکی بەسەردا بڕوخێنم. دەیەها چاك تر، خۆ ئەگەر بمتوانیایە مێشکی بۆرمەرە بە هەزارەها باشتر، کە نەبمەوە ئەوەی جاران و کەسێ نەبێ خۆشی بوێم و چاوی بەژیم تێ ببڕێ، کە خواوەند پەشیمانیم قبول نەکات. ناچارم منیش وەك شەیتانێ بوونی خۆم بچەسپێنم، لێرە دوورکەوێتەوە ماندووبوونی ئەو هەموساڵەی نێرم بە فیرۆدەچێ. کەواتە دەبێ وەك کوچ کوچە بە دوایدا بکەوم وبۆ هەرکوێ بڕوا لەگەڵی بڕۆم. پێم بکرێ ناهێڵم بە کەس و کاری بکەوێتەوە: ناهێڵم وەك مرۆڤێکی ئاسایی بژی، شەوو ڕۆژ، لە خەون و خەیالی دا ئامەوە دەبم تا لە بیری نەچێ هەم. پێم بکرێ توشی نەخۆشی ومرم و ئیفلیج بوونی دەکەم. تانە توانی

ـە ـوسوێن هەلستێتـەوە زمـانی نەگەری، کەرولاڵ بی، کوێر ـــت و گەخووبێ ی چارە بی. دەست و پەنچەی فوی لێ بێ. گـت و پێوەند مەچەکی شەنەك بدا، تەنیا بژی. کەس و کاری ـەـ. نە کەسێ هەبێ گوێی بۆ بگرێ نە کەس ببینێ وهاوری‌و ـەـ. دوژمنی زۆربن خەلـك قێزی لێ بکەنەوە، بوگەن بێ، حمـەی مێرولەی تێ بئالێ، هێندەی چنگێکی لێ بێتەوە، سالٚ تـ ـەی مانگە لە نێو چوار دیواردا بژی و کەس سەردانی نەکات گـوڕ وپلنـگە دەوری بگـرن، لە نێو ئەشکـەوتی. دوور لە تـومدانی. لە نێورنوە بەخردا رێ بزرکا، بەفر جەستەی داپۆشێ، ـە زێر سەرمـاو سۆلـەی زستان رەق بێتەوە. هاوینانیش لە ژێر قرچـەی گەرمـادا لەشی ئارەقـە دەربکـا، رەنگە زەرد و مێـشك چەمجاڵ و ئالۆز، گرانەتێ بگرێ. ورێتەبکا. کرمێ بێ و کرم ـمەشیا هەلبگەرێ، پێش و پۆخلٚ وجل و وبەرگە دراوو فرێژاوی ـ پیخـاوس و رووت رەجـال، وەك گەلای دارێکـی رزیو ئەـدامـەکانی، پرچی، برۆی، سمێل، هەلومرن. ئاوات بە مردن بخوازێ و نەمرێت بێز لە خوی بکاتەوە و نەمرێ، ئاوات ـەـە بخـوازێ بێ بە تارمـایی و ئاژەل نەمرێت. بە زنجیرەیەك گـۆڕانکاری بەردەوامد بروات و نەمرێت، لە بوونەوە رێکی بالاوە ـیـە بوونەوە رێکی سەیرو عەنتیکە، بەژن و بالای نەگونجاو سەر ـرج وروخـاری ناتەبا دەربچن. گوێچکەی قیت و سەرو کە سەرێ و کەچەلٚ، لچ شۆڕ، دوو شاخ لە نێو چەوانی هەبن رورتە ـەر لاوازبێ. قاچی چل گەز درێژ نێوکـەکانی هێندەی بەژنی درێژ بن تە بەشی حەوت مەتـرپـان بێ، وەك من لە پەیژەی ـلابـووندا دابەزی و لەژێر زەوشدا درنجێ بالٚ بەستی کات، حەوت تەبەقە بە ژێر زەویدا بیباتە خوارێ، حەتا سالٚ، بەندی کـت، حەوت دێو پاسەوانی بن. وەك چۆن من بوم نی‌یە سەر کەومەوە، ئەویش وابێ، هەولدانەکانی بە فیرۆ بچن وبەردەوام لە یەکـەم پەیژەدا بمێنێتـەوە، وەك من نەتـوانی لە شوێنی خوی ـروێ، هەمیشـەش زەوی قتاتیز ئاسا بەرەو خوی بیکێشێ، لە من حرابتری لێ بێ، وەك چۆن مر لە جیاتی بەرەو سەرەوە بروم بەرە خوارەوە پتر دادەبەزم. لە زەوی دەچمە خوارێ بچووك دەبمەوە، شێوەم ناله بار ترو ناشیرین تر دەبێ، ئەویش هەروەدا، هەرچیش بکەم لە تارمایی پترنیم، لە جنۆکەو و ملۆزم پترنیم، لە شەیتان و گوناهکار پترنیم، لە تاشە بەردو ئاسن پترنیم، لە روخێنەروتێك دەرپترنیم، لە کێچ و ئەسپێ و جالجالۆکەو ودوو پشك و مارو وورچ و درنـدە پترنیم، لە رێوی و چەقـەلٚ و کونـدە پەپـوو و قەلەرەش پترنیم، هەستم مردوە، زمانی ئادەمیزادم لە بیرچوتەوە، دەنگم وەك لورانـدن وایە حەپـەحـەپی سەگ و میاوە، میاوی پشیلەو قفـە قفی قەلـە رەشـە. ئەوکار و کردەوەم هی گورك و درندەیە، بۆ گوێەند و گیچەلٚ نانەوە خولقاوم، لە پیلان و نەخشە نانـەوە پتر نازانم لە ئازاردان و قەپ گرتن پتر نازانم، جەستەم نادیارەو هەم، بێ بایەخـەم کەچی هەم ئەو گوێـەندانەیش کە نامنەتەوە پتر بالای بۆ من ناوەتەوە، تووشی گیرەوکێشەی سەختی بوون و نەبوونی کردوم. بوونم بووە بە هیچ،

به سفرێکی گەورە، بەرەو عەوەم گەراوەمەتەوە یانێ بوونم بۆتە نەبوون، کورە لە نەبوونیش کەمتر لە بەردو داریش کەمترە، لە هیچ هیچ ترە هەولـدان و مانـدوو بوونیشم لە پێناو گەرانەوە و بالابـوونـدا هەر هیچ و هەر هیچ بورە، بوونم بۆتـە یارێکی منـدلانـە، یاری راکێشـانی کوریە، یاری مشـك و پشیلەیە گرەوپێکە بێ ئەنجام هەر چەند دەزانم بێ ئەنجامیشە بەلام دەبێ بیگـەنمـە سەر، بریارێکـە پاش گەزبـونـەوەی بۆنیە دەبێ یەکێکـیان سەرکـەوێ، سلانێکی دوورو درێژەنوسەدەیە، هەردووکیان راکیش راکێشیانە، ئەو سەرێکی گوریسەکەی گرتوە و منیش سەرەکـەی تر ئەو دەیەوێ بەرەو دەرەوە راکێشێ منیش بەرەو ژوورەوە ئەو بەرەو رووناکی و منیش بەرەو تارێکی، گوایە خەریکـە من ببـەزم و ئەو سەرکـەوێ، کە چی لە راستی‌دا هەردووکیان نەسەر کەوتووین و نەبەزیویشین. ئەوا وا دەزانێ ئیتر تەواوو جارێکی دیکە چارەی من نابینێ، و ئیمشەو دوا شەوی مل ملانێ و کێشـەکەمانە، کەچی وانی‌یە، چونکە من ناتوانم دەست بەرداری بم، بە دەست خۆم نی‌یە، ناتـوانم بە گژیدا نەچم، مل کەچی یاسایێکم و بۆم نی‌یە لابدەم. هێزی پەلکێشـم دەکـا، تەلـە سمێکـە و شکـانـدنی زەحمـەتـە کە نەبمەوە ئادەمیزادەکەی جاران هەمونیم، بەزیوو سـەرکەوتووم، تا ئەویش وەك منی لێ نێ هەروا دەبێن و کێشەو مل ملانێیان نابرێتەوە.

**بەشی (١)ی لە گۆڤاری نووسەری کورد**
**ژمارە (٤٣) خولی سێیەم**
**بلاو کراوەتەوە**

# کەوتنی ژمارەکان

چیرۆکی: شنۆزاد حەسەن

رەنگە ئەوەیان بیستەمین جار بێ، زیاترو کەمتر نا.. بیستەمین جار.. دڕاندنی بیستەمین دەفتەری تەلەفون، کەوتنی.. لەناو چوونی سەدەها ژمارە، دڕین و سڕینەوەو کاڵ بوونەوەو مردنی سەدەها ژمارە، مردنی سەدەها مەردووم، نەمانی ژمارەی تەلەفونی ئەو خۆشەویست و خزم و دۆست و هاورێو هاودەم و یاوەرانەی وان لەم شارەو شارەکانی دی.. ئەوانەی خۆشت دەویستن.. خۆشیان دەویستی.. هەندێ لەوانەی مردن، نەمان، کۆچیان کرد، تۆیان لەیاد کرد، جاران هەر ساڵەو یەك دووانێك، ئەمێستا هەر مانگەو بگرە هەر هەفتەیەك و... نا.. بگرە هەر ڕۆژەو یەکێك لەژیانتا، سیمای لە ڕۆحتا، وێنەی لەمێشك و... دڵتا دەسڕێتەوە، سەردەمی بەرژەوەندییەو تۆ نیتە، هاورێیانی سەردەمی منداڵی، ڕۆژانی نەهامەتیو برسیەتی، برادەرانی عومری جحێڵی ئەوسای هەرزەیی، جاران هەر سێ ساڵ جارێك دەفتەرەکەت تازە دەکردەوە، لەدەفتەری تازەدا کۆمەڵێ ژمارەی کۆن دەمردن، ژمارەو ناوی تازەش هیچ.. ئەمێستا پەریشانیت، لەم شەش ساڵەی دواییدا هەر چوار پێنج مانگ جارێك دەفتەرەکەت دەدڕێت و کۆمەڵێ ژمارەو کۆمەڵی ناو دەخەیت، ناوی هاورێ و ئازیزان لە ناو دەچن، کەوتنی هەر ژمارەیەك مردن و کۆچ و ماڵئاواییو لێك دابڕان و غەدرو خیانەت و لەدەست دانی دۆستێکە، خزمێکە، برادەرێکە، ئافرەتێکە.. لەوە دەچێ بۆ لەمەو دوا هەر مانگەو دەفتەرێك بگۆڕیت، ڕەنگە ئەمساڵ دوا دەفتەر بدڕێت و چونکێ دوا ژمارەی کە بێویستت پێی نابێ ژمارەی تەلەفونی خۆت بێ، زۆر دەترسیت دوا کەس خۆت لەگەڵ خۆت دا پەیوەندی بپچڕێنیت، ئەو پەیوەندییە شیرینەی خۆت لەگەڵ خودی خۆت دا هەتبوو.. وەی لە مەینەتی عومری تەنیایی.. وەی لە دونیای بێ مروەتی..!

ئەمساڵ ژمارەیەکی زۆرترت سڕییەوە، ژمارەی خاڵە هەباس ـ پشت هیچ.. بۆ چیتە کە ئەتناسیتەوە..؟ هەلاو خاڵە گیان.. هەلاو.. هەلاو.. دەنگم کزە.. ئا لێتەوە دوورم، سەدان کیلۆ مەتر، دەمێکە دەنگت نییەو بیست دەکەم.. قەرزارتم.. ئا قەرزار.. قەرزی دوکانی چی..؟ من قەرزاری جەژنانەو ماچەکانتم، لاوانەوەی جاران، قەرزاری حەڵواو نوقڵ و نوکتەو ئەو کەمانچە شکاوەی کە هیچ ئاوازێکی شیرینی لێوە دەرنەدەهات.. نا.. نا.. من «کەماڵ» م... کەماڵ بەگی چی..؟ من خوشکەزا ناشیرینەکەی خۆتم.. پرۆژەو پارەی زیرابەکان؟.. تێت ناگەم قەرزو قازانج چاك سەریان لێ تێك داوی.. نامناسیتەوە.. چۆن..؟ خاڵە گوێ بگرە من باسی قەرزی ئەو میهرەی جارانت لەگەڵ دەکەم.. هی سەردەمی منداڵی.. نیشم پێتە..؟ نە بە وەڵڵا.. وتم من کەماڵ بەگ نیم.. کەماڵ چڵمنم.. نا.. کەما..... بوەستە.. دایمەخەرەوە.. با بڕوا.. تف لە دەفتەری ژمارە نەفرینەکان.. هەروا مامەکانیشت، پوورەکانت.. خاڵۆزاو پوورزاو ئامۆزاو خوشکەزاو برازاکانیشت.. ناوی تۆ، دەنگی تۆ، ڕەنگی تۆ تێکەڵ بە ناوو دەنگ و ڕەنگی قۆنتەراتچیو قاچاخچیو بازرگان و سووخۆرو قەرزارو لوتیو دەییوسەکان دەکەن خزمانت یەکە یەکە لە بیرت دەکەن، ناتناسنەوە، بوویت بە کەوڵەکۆن کەوتنی ژمارەکان، کەوتنی.. دۆڕانی ئادەمزادەکان، سڕینەوە، کاڵ بوونەوە، مەرگ.. مەرگی جەستە، مەرگی ڕوح.. بەچی دەچێ کە خۆشەویستی نەمێنێ..؟ کەوتنی ژمارەی ئەو کچانەی لەبری شەهوەت لە شیعر دەدوای، لەبری مەمکدان لە ڕۆمان، ژمارەی تەلەفونی هەموو ئەو شۆخانەی بەناوی خۆشەویستییەوە لەگەڵتا دەدوان، وەی لەبریسکەی چاوانی پڕ عیشقت، وەی لە لەرەی دەنگی پڕ میهرت..!، هەر ساڵەو یەکێکیان دەیفرۆشتیت، لەسەر تەلەفونەکان بۆیان دەگریایت، دەتناڵاند.. دوا جار بێ شەرمانە دەتبۆڕاند، لەهەموو شوێنێك، لەماڵی ئەو برادەرانەی بەدەست و پەنجەیەکی لەرزۆکەوە ژمارەکانیت دەچەرخاند، لەتکای تۆ.. ئامی گەرمت تەلەکان دەتوانەوە، لەنێو سندووقی سەرجادەکان، لەژێر بەفرو باران، گڕەو هەتاوی هاوین.. یەکە یەکە پێت دەوتن مناخر خوا هەڵناگرێ هەر ساڵەو یەکێك بمخاتە داوی خۆیو پاشان ئەشقەقەی باڵی دڵو بفڕێ... نازەنین، هەلالە، پەری، نازدار، بەفرین، ئاورنگ، گەلاوێژ، مریەم... دەتۆ گوێ بگرە. دەبا من دوا عاشقی ئەفام و یاغیش ئەم دونیایە بم، بەجێم مەهێڵە.. بەجێم مەهێڵن.. کە بۆت دەگریم بەسووك و لاوازم مەزانە.. ئاخر ئاوا غەدرم لێ دەکەن.. ئاخر وانییە.. تەنها ڕۆحە بێ گەردەکان.. چاوە پاکەکان دەتوانن بگرین.....

دوا جار زانیت ەتۆ چەندە ئەحمەقیت..!، وایان پێوتیت.. لەم سەردەمە سپڵەیە وەها کەرییەتیو عیشقیش مل

کەچی‌یە.. لەم سەردەمە سپڵەیە وەفا کەرییەتی‌و عیشقیش مل کەچی‌یە.. بابمرێ ژمارەی زۆری خۆشەویستەکانت، چەندە بێ ئاگاو بەستەزمانیت.. کێ ماوە ئیمرۆ باسی شیعرو زەردەپەڕو خورەی چەم و خەمی خەزان و نرکەی دەریاو جریوەی ئەستێرەو مۆســیــقــاو هەنــاســـەی ساردی سەردەمـــی منــاڵی بۆ خۆشــەویستەکانی خۆی بکا.. کێ ماوە نەگیەت.. کێ..؟ نا.. ڕۆژانی تۆ بەسەرچوو.. گوزەشت.. ماڵئاوا لەتۆ لە خەونەکانت.. لە تراویلکەی بەر بەیان و ئیوارانت، ماڵئاوا ئەی عاشقە ڕووتەی هیچ نەزان.. ئەی بێ ئاگا لە ژمارەی پیلان و پیرۆزەکان، ئەی ئەو ڕۆمانسی‌یەی وات دەزانی مانگ کچێکی ڕەنگ زەردەو بە دوای عاشقەکەی‌دا وێڵە.. هەتەرو دەربەدەرە.

وەرەوە هۆش خۆت ، ئەو کچانەی تۆ باسی سەدای ڕۆحی خۆت بۆ دەکردن، مروەت و پاکی.. تەلی تەلەفونەکە گوێی دەگرتی.. وەلێ ئەوان نا.. ڕۆحی کارەبا گوێی دەگرت و ڕۆحی ئەوان نا، هەر ئەو شەوە دوای تۆ بازرگانێك، قونتەراتچی، سووخۆرێك باسی سوخمەو سووتیانی بۆ دەکرد.. ژێر کراس و.... کەوش و... دەرپێ... چ ڕەنگەو گوڵەکەی وا لە کوێ.. دوا جاریش بە خشـــەی دینـــار، زرنگـــەی لیرەکـــانی داپیرەی.. لیرەی میراتی ماڵئاوایی لێ دەکردن.. با بمرن ژمارەکان مادامەکێ بریسکەی چاوانی تۆ بە بریسکەی ئالتوون دەگۆڕنەوە بگری بۆ خۆت، با کەمتــر بێتـــەوە ژمـــارەی حەزەکانت، دۆستەکانت ژمارەی ئەو ژنانەی لە مێردەکانیان دەتۆران و خۆیان داوێشتە ئامێزی تۆ.. کۆنە یارو کۆنە دۆست.. تۆش لەبری ئەوەی لەگەڵیان بخزێیتە ژێر لێفەیەك فرۆید ـ یانە لە پەیوەندی نارێکی نێرو مێ دەدوای، نوشـــوستی توخمی ژنـــان، سروشتی ناجـــۆر.. گرێی ئۆدیب، ئەلیکتـــرا.. هەڵەی هەڵبـــژاردن، داڕوخـــانی بەهـــا پیرۆزەکان، دەستـــووری دەستکـــردەکـــانی توخمی نێرینـــە، کەڵ خوێن، تەقینەوەی گڕکانی شەهوەتە کپ کراوەکان، ئەو ژنانەی سکالای باوك و براو مێردو دەستگیرانەکانیان لای تۆ دەدرکاند، سەریان دەخستە سەر شانت و دەگریان... وەك بڵێی شانی تۆ هی ئەوە بێ ئافرەتە ڕووخاوەکان بەسەریا بگرین.. ئەوە شانی تۆ یان دیواری خووساوی بەر بارانی فرمێسکی ئافرەتە دۆڕاوەکان..؟ دەتـــوت ـ هێـــم ئەوتن پیـــاو ترسنـــاکە.. پێم ئەوتن..؟» پێیان دەوتیت مبرواتان نەدەکرد ماموستا وامان دەزانی غیرەت هەیەو

بەغیـــل بە توخمی پیـــاوان دەبـــەیت..!» دە بیخـــۆ.. جێ‌یـــان هێشتیت.. هەموو ئەو کچانەی دەیانوت «هاوڕێ‌یەتی پیرۆزە ماموستا.. بێ تۆ هەڵناکەین شوو دەکەین و بە وەڵلا لە بیرت ناکەین، حەز لە کوری تر دەکەین و لە یادت ناکەین.. چۆن لە بیرت بکەین..؟ قسە خۆشەکانت وێنەکانت، ئەو شیعرانەی هی تۆ بوون و کوران بەناوی خۆیانەوە بۆیان دەناردین.. چۆن لە یادت بکەین ماموستا گیان.. بە ساقەی نوکتەکانت.. وەی لە تۆ.. لە فریوەکانت..!» بۆ خۆیان وت.. لەبیریان کردیت.. ئەوان کچـــانی سەردەمێکن.. سەردەمی سڕینـــەوەی سیحـــری یادە شیرینـــەکـــان.. ژمارەیەك، دوو دە.. زرنگەی زەنگی تەلەفونەو پیاوێکی دەنگ کڕ هەڵیدەگری، دەبێ کێ بێ.. باوك یان برا، مێرد یا دەستگیران، دۆست یا خیانەتکار، پوورزا یان هەتیوێکی لابـــەلا.....؟! هەلاو قوربان.. شیرین ئەگەر لەوێ‌یە، هەلاو... نازدار.. بەڵێ گوڵاڵە ـ م دەویـــســـــت... شووی کردووە.. نا.. ڕانابوێرم.. فاتیمە.. پاکیزە، گوڵزار.. پەری.. مەهاباد.. تکایە.. قوربـــان.. پێی بڵێ ماموستا «کەمال» بانگت دەکا.. کەمال نا قوربـــان.. کەمال.. ببورە جنێو مەدە.. دایدەخەمەوە.. کلاشی چی.. براکەم خۆی ئەم ژمارەی داوەتێ.. بیری دەکەم.. ئاخۆ لە ماڵەوەش هەروا زیـــت و زیـــرەکـــە.. ئا.. هەمیشـــە خۆی تەختەکەی بۆ دەسڕیمەوە بەلاقرتێ‌وە پێم دەوت ـ دەمبا تۆز لە بالاکەت بنیشێ..» من دڵنیام ئەوانیش حەز دەکەن گوێیان لە دەنگم بێ، من دەزانم.. بەســـەری هەردووکمـــان ڕانابوێرم.. شووی کردووە..؟ بەخـــێرو خۆشی.. چاکە.. هەلاو.. هەلالە ـ م دەویست.. بۆ نامەردم کاکی من..؟ باشە.. دایدەخەمەوە.. هاوار مەکـــە هەڵبەت خوشك و دایکم هەن.. ئا.. نەخێر.. من کابرایەکی زۆر شارستانیم.. جرت مەکێشە.. جوان نی‌یە.. بەڵێ من دڵنیام و دەزانم چۆن هاوڕێی خۆیان هەڵدەبژێرن.. من بێ ئەخلاق بم..؟ خوا کارت ڕاست بێنێ.. بەهەر حاڵ من ئەوەنیم کە تۆ تێی گەیشتی.. لە تیاترۆخانەش نیم دەمبا ناوو نیشانی خۆمت بدەمێ.. هەقتـــە.. ڕاستە جوان نی‌یە.. بمبورە پاریس نی‌یە.. وایە جوان نی‌یە... پیاو داوای ئافرەت بکا. تۆش... هیچ......

بابمرێ ژمارەکان.. ژمارەی ئەو کچ و کاڵانەی تۆ ڕۆحی خۆت.. خۆشـــەویستیت پێ بەخشین.. لەوەیە تۆ کالیسکەیەك

بیت.. هەریەکەو لە شوێنێک دا.. هەر یەکەو قۆناغێک و دابەزێ.. چاوەڕێبە.. چاوە ڕێ.. ڕۆژێ دێ کۆشتی لەشت هەلا هەلا هەڵوەرێو.. «با» بەنێو پەراسووەکانت دا بێت و بچێ، مێروولەش هێلانە لەنێو چاڵی چاوانت خۆش بکەن.. ماڵئاوا ئەی خاڵە خاوێنەکەم.. جاران ئەمێستا نا.. جارانی پاکی و جوامێری.. ئەمێستاش بوون بە قاچاغچی‌و سووخۆرو بازرگانی پاردە کورت و بەقاڵی تەرازوو خوارو لاسەنگ.. مامەکانم ماڵئاوا.. مامانی ڕۆژانی مەردیی.. کە ئێستا ناوی من لەگەڵ ناوی قەرزارەکان تێکەڵ دەکەن براو خوشکانی خۆم ماڵئاوا.. ئێوەش گیرۆدەن.. گیرۆدەن بەدەست کوڕەکانتانەوە.. ئەو کوڕانەی دەرگای قوتابخانەکان دەشکێنن تا فلیمێکی ڕووت ببینن.. گیرۆدەن بەدەست ئەو کچانەی لە دە ساڵییەوە هەموو دەستووریکی دڵداریان ئەزبەرە.. ماڵئاوا لە هەمووتان.. من دوا کەسێکم، دوا دەبەنگێک، گەلحۆیەک.. ئەفامێک کە هێشتا وا تێ دەگەم بەکێفانی بەتاڵەوە دەتوانین یەکدیمان خۆش بوێ.. چ سەردەمێکە کە هەموو شتێک بۆتە ژمارە.. ژمارە.. ژمارە.. ژمارەی پرۆژە.. پیلان.. پایەو پلەو پارە.. ژمارەی مێردەکان.. ژمارەی ژنەکان، ژمارەی پێک.. کاغەزەکانی قومار.. قومار.. جۆرەها قوماری سەرزەمین و ژێر زەمینەکان، هەڵبەت تا ژمارەکانی دونیای دەرەوە زیاتر بن... ژمارەکانی نێو دەفتەری تەلەفونەکەی تۆ کەمتر... کەمتر دەبنەوە.. تا دوا جار دەفتەرێکی سپی.. سپی دەخەیتە بەر باخەڵت و جارو بار بێ ئاگا لە خۆت و لە دونیای سپڵە دەری دەهێنیت.. تا لە دوورەوە.. لە شارانەوە.. لەسەر شۆستەو لەژێر چەترو نێو کابینەکانەوە، لەنێو سندوقی ژێر پردەکانەوە، لەبەردەمی پۆستەخانەو لە ئوتێلەکانەوە دەفتەرەکە دەردێنی تا تەلەفون بۆ کەسێک بکەیت، نێرێک، مێیەک، خزمێک دراوسێیەک، کۆنە حەزێک، قوتابییەک، دوورە دۆستێک... دەفتەر سپییەو ژمارەی تیا نەماوە، لە دەفتەری سپی وەک دڵت.. پاک وەک ڕۆحت بێزار دەبیت، بێزار دەبیت و پڕی دەکەی لە ژمارەی درۆ، هاوڕێی درۆزن، دۆستی ساختە.. ئەوانەی هەرگیز تۆیان نەدیوە.. تۆش نەتدیون.. زرنگەی زەنگی تەلەفونەو ماچیان بۆ دەنێریت، خۆت دەکەی بە برادەر، خزم و خوێ، دەستگیران، مێردی مێخاس، برای بەوەفا کوڕی هەڵەتەو دوورە وڵات.. کەچی ئەوان بە ڕووت دا دایدەخەنەوە، ماچ ڕەوانە دەکەی، قسەی شیرین، شیعری ناسک، مۆسیقای سیحر ئامێز.. کەچی ئەوان بێ مرووەتانە تف بۆ دەنێرن، جنێو، قسەی ساردو سووک، گڕێ تووڕە، هاواری گومان.. دواجار دەفتەرەکەت دەدڕێنی.. چی لە دەفتەرێک بکەیت کە کەسێک.. خۆشەویستێکت پێ نەناسێنێ.. هەناسەیەکی گەرم، ئۆخژنێک، گلتێکی شیرین، وادەی ژوانێک، دڵێکی پڕ میهر، سڵاوێکی دڵتەزێن، ماچی ماڵئاوایی.. دەفتەر دەکەیت و دەفتەر دەدڕێنیت، دوا جار، ناچار، دەخوازی ژمارەی تەلەفونی هاوڕێ مردووەکانت بێنەوە یاد.. ئا.. هی «مچە»ت لە یادە.. مچە کە زێی «ئاسکی کەلەک» خنکاندی، ئەو زێیەی بە منداڵی فێری مەلەی کردو بەگەورەیی خنکاندی، وای لێ هات.. چ سەردەمێکە..؟ هەتا زێو چەم و جۆگەلەو دەریاو ڕووبارەکانیش سپڵەن.. دەیوت «کاموٚ» من ئەو زێیەم خۆش دەوێ چونکێ فێری مەلەی کردم.

دەتوت ـ «مچە ئەو زێیە بێ مرووەت بووە، هەر ساڵەو یەکێک دەخنکێنێ.» دەیوت «من.. نا.. منی خۆش دەوێ، من بەقەد پەنجە تووتەیەک بووم فێری مەلەی کردم ئێستا کە پیاوم چۆن خیانەتم لێ دەکا.. منێک کە خۆمی بۆ ڕووت دەکەمەوەو مەلە لەنێو دڵیا دەکەم....»

مچە.. هەلاو.. مچە.. لەژێر ئاوەوەیت.. پێم بڵێ تۆ ماسی دەخۆیت یان ماسییەکان تۆ دەخۆن..؟ مچە من بۆیە تەلەفونم بۆ کردیت چونکێ لەم شارە.. نا.. بگرە لەسەر ئەرز کەسم نەماوە.. چار نییەو دەبێ تەلەفون بۆ هاوڕێ خنکاوەکانم.. بۆ دۆستە مردووەکانم بکەم، مچە.حەیاتم ئەگەر خۆت حەوسەڵەت نییە تەلەفونەکە بدەرە ماسییەک.. هەر ماسییەک هەتیو.. دەمەوێ قسە بکەم.. قسە.. هەر قسەیەک.. بۆ دەنگت نییە مچە.. مچە هەلاو.. هەلاو درەختەکانی لاڕێو سەرشەقام.. هەلاو ئەستێرەکانی ئاسمان.. هەلاو گەڵای مردووی بەرپێی پیادەڕۆکان.. پاسارییە ئەسرەوتەکانی سەر گوێسە بانەو درەختەکان.. بۆ دنگتان نییە.. هەلاو.. هەلاو.. هە... هەلاو ئەمین.. نا ببورە.. ئەوسا کە من و تۆ منداڵ بووین ئەو گەرمکە دارتەلێکی تیا نەبوو.. نا.. ببورە.. تۆش زوو مردیت، کوکە ڕەشە تۆی خنکاند، مچە زێی ئاسکی کەلەک خنکاندی.. تۆش کوکە ڕەشە، منیش لەوە دەچێ وەکو ئێوە بخنکێم.. بەڵام من لە تەنیایی.. لە بێخۆشەویستیدا خەریکە دەخنکێم.. لەقەهری

هەڵاتنی هاوڕێیان، دۆڕانی دۆستان، خیانەتی خزمان، خەمی خاڵوان، مردنی مروەتی مامەکـان، دابـڕانی دایکان، ڕمانی ڕۆڵەکـان، خەفـەتی خوشکان، بێ بەزەیی باوکان.. منیش وا دەخنکێم.. دەخنکێم.. نامهـێـ.. ئا ئەمـێن.. عوسـه ماوەو.. نەمردووە، بەڵام ئەویشم لە دەست چوو، ڕەوی کرد، کێی تر.. هەواڵی کێ دەپرسیت..؟ ئۆ هێو زۆریانم دۆڕاند.. ئا.. ئەوان منیان دۆڕاند، لێکدی تۆراین.. لەسەر شتی گەورە.. ئا.. درۆ دەکـەم.. لەسەر شتی زۆر تڕو هات.. کێ..؟ عەلی، سەمەد، حەمـە، سمکۆ، فرياد، خالید، جەمیل، سیامند.... ئا.. ئا.. ئەوانــە نەمــردوون. نەخـنکـاون، بەڵام هەم خنکـاوو هەم مردووشن، ژمـارەی تەلەفونەکانی ئەوانیش هیچ.. سڕیمەوە.. ئاخـر لێرە نەماون، ڕەویان کرد، پۆل پۆل، ڕەوە ڕەوە، قەتار.. قەتـار، تاك و جووت.. منیـان بەتەنیا جێ هێشت.. ئا کۆچ.. کۆچ.. کۆچی بێوادە، کۆچی سوور، کۆچی بێگەڕانەوە.. بێ ئاوڕدانەوە، عەلی وا لە لەندەن، حەمەش ستۆکهۆڵم، عوسە.. عوسەی نامەرد ژنێك و دوو منداڵی بەجێ هێشتووە، باوکە کوێت و کوێرەکەی چەرخەکەی جارانی هەر ماوە، ئێستاش وا دەزانێ بە پارەی چەقۆ تیژ کردنەوە منداڵەکانی عوسە بە خێو دەکرێن... ئەم چو زانێ بازار بەسەر چەقۆی ستیل دا وێران دەبێ.. من پێم وت چەنـد گەزۆیـەك بخـاتە سەر سینی یەك و بیفرۆشێ ئەوەیـان چاکترە، ئەکرەم وا لە «بەرلین» ڕۆژئاواو ڕۆژ هەڵاتی چی..؟ مردوو مراو دوای تۆ دونیـا سەرەو ژێـر بوو.. هەتیـو دیـوارەکە ڕماو هەردوو بەرەکە لێکی دا.. ڕەنگە هیتلەر ـ یش بگـەڕێتـەوە.. ئا .ئـا دوور مەبینـە، سەمەد لە دانیمارکەوە تەلاقنـامـەی بۆ ژنـەکەی ناردۆتەوە. ژنەکەشی لە تۆڵەی ئەوە دەستی داوەتێ.. ئا خەریکـە.. خەریکی چی..؟ مردوو مرا، قسـەمـەکـە.. تۆ بۆ دەتەوێ ئابڕووی زیندووەکان بەرین..؟ جەمیل...؟ جەمیل وا لە سیدنی، فریادوا لە پاریس.. گوایە لە سینـەما دەخوێنێ بەو نیازەی بێتەوەو فلیمی کوردی دەرکا.. ئا.. فلیم.. فلیم.. فلیمی شەڕە گەڕەکی جارانمـان، بەڵام ئەو بزن مشکە هێشتا سوورە لەسەر ئەوەی وەکی جاران هەر خۆی کوڕە ئازابێو من و تۆش.. هەموو منداڵانی گەڕەك ببینەوە ئەو پیاوە ترسنۆکانەی کە کوڕە ئازا دەیانکوژێ، ئەم نازانێ من و تۆ مردین.. دەمێکە.. مردین و کەسیش پێی نەزانی..

دوا جار رادەچڵەکیت، لەو دیو تەلەکەوە دەنگێکی گر ـدنەوە تێکچـووی.. فلیمی چیو کوڕە ئازای چی...؟ بە ناموسم لە هەمـوو ژیانما وڕێنەی وا خۆشم نەبیستووە.. دایخەرەوە بێ عەقڵ.. بەڵام ئا.. دایمەخەرەوە.. خۆشی بۆ ڕابواردن...»

تف لە دەفتـەری تەلەفـۆنە درۆزنەکان، ژمارە ساختەکان: چۆن سووکت دەکا.. چیت پێ دەکا..؟ خوا هاوار قسە لەگەڵ کێ بکـەی...؟ وا دەمـریت لە حەسرەتی ئەو وەحشـەتـە.. دەخنکێی لە قەهری ئەو غوربەتە.. وەی بۆ دەفتەرێکی پڕ لە ژمـارەی تەلەفـۆنی خۆشـەویست و دۆستـان، ئەمـەیان دوا دەفتەرەو دوا ژمارەی تیا ئەسراوەتەوە، ژمارەی تەلەفۆنی خۆت.. چی لێ دەکەی..؟ مەگەر خۆت قسە لەگەڵ خۆت دا بکەی، گوێ لە زەنگی زویریت بگریت، هەر خۆت ئەحواڵێکی خۆت بپرسیت بزانیت ئاخۆ ساغیت یا نەخۆش...؟ مردوو یان ماویت..؟ بەڵام قەت ناکرێ ببیت بە دوو کەس، دوو لەت، یەکێکیان لەم سەری دونیاو ئەوی دیکەیان لەو سەر، ئەم ماڵ و ئەو ماڵ، ئەم شارو ئەو شار، ئەم شەقام و ئەو شەقام... مەحاڵە بە دوو کەس بیت.. مەحاڵە.. دەبا دەفتەرەکە فڕێ بدەی، فڕێی دە لەلاکۆڵانێك، یا بەردەمی سینەمایەك مزگەوتێك، یان بازاری کوتەفرۆشەکان.. مەزاتخانە چۆنە...؟ نێو چایخانەیان مەیخانەیەك...؟ یا نێو ئەو بازارو کۆگـایـانـەی دەمەو ئێواران بەنیازی چاوباری پڕن.. سیخناخن لە کوڕو کچی جحێڵ، قەیرەو بێوەژن، ڕەبەن و بێو مێرد، هەرزەو پیری کەنەفت.. فڕێی دە.. وەلێ تۆ بڵێی لە ژێر پێی پیادەڕەو ڕێبوارانی کەمتەرخەم و ژن و پیاوانی بێ ئاگا ژمـارەی تەلەفونەکەت کاڵ نەبێتەوە.. تۆ بڵێی نەسڕێتەوە...؟ دەبـا فڕێی دەی.. بەڵکـو خواو ڕاسـتـان یەکـێـك لەوان هەڵیبگرێتەوە.. ژنێك پیاوێك، هەر کەسێك.. تەنها ژمارەیەك و لە دەفتـەرێك دا سەرنجی ڕابکێشێو قسەت لەگەڵدا بکا... هیچ نەبێ حەز بە گاڵتەو مەزاق بکا، بێ ڕابواردن هەر خۆشە... هەر خۆشـە یەکێـك هەبێ و بێت ڕابـوێرێ.. هەر خۆشە... دوای نەمـانی هەمـوو ژمـارە خۆشـەویستەکان.. کەوتنی، کۆچی، مەرگی، بێ مروەتی هەموو دۆستان، دۆڕانی خزمان.. یاوەران ئازیـزان.. دە فڕێی دەو دوو دڵ مەبـە.. دەفتـەری ژمـارە نەفرینەکان... دە فڕێی دە.. فڕێی دە...

٢٨ـ٥ـ١٩٩٠ هەولێر



# ئەو سوارەی لە بیابان وون بوو

بۆ گیانی پاکی سوارێکی چلەکانی کوردایەتی پێشکەشە

کاکە مەم بوتانی

منیش وەم دەزانی بیری مرۆڤی مردوو دادەتەپێ هەست دیشکەم لەکۆچ کردوو دەکا . وشەو ڕستەو ڕووداوە کۆنو نوێیەکان .. وەک تابلۆی بەر باران ، ڕەنگ و وێنەکان دەژاکێن،نانا سرێنەوە.. ڕەش ، تەنیا ڕەش ، بینایی چاو دەگرێ . سەیرم بەخۆمان دەهات ، کەوەک مەرەگێژە ، لەپشت دارەمەیتەوە ڕێزمان دەبەست .. تا ئێستاش ، هەفتەی جارو دووجار ، ژنان ، سەر لەگۆڕی خۆشەویستەکانیان دەدەن . وەمدەزانی ئەم کردەوانە بێ هودەیەو بۆ دڵنیایی خۆیاند ، بە وەفایان نیشانی زیندووان دەدەن ... بەڵام من ، لەبوولێڵەوە هەستم بەمردنی خۆم کردووە . بەڕووناکی شوورام . سەرتاپا کفنی خامیان بە باڵام هەڵکێشا . بەچواردەستەکی خستمیانە دارە مەیتێکەوە . چێشتەنگاو هەڵیان گرتم ،لە پاسێکیان ئاخنیم ، راستە ، بۆ ماوەیەک سۆماییم داهات ، دنیا تاریک و نووتەک بوو... ئێستا دیدەم روونە.. هەندێ زرەگوڵی سەر لێ شێواو دەبینم ، لەژێر ستەمی زستانی سەختا ، لە لاپاڵی ئاوەو شاخەدا سەری دەرهێناوە ، دەمی خونچەی کردۆتەوە ، مژدەی نێرگزو گوڵاڵەوبەیبوون بەئێوە دەدەن .. گژوگیای ئەم لاپاڵەت دیووە؟

بەپەلەن فەرشی سەوز بۆ نەورۆزی خاوەن شکۆ ڕاخەن .. نەورۆز ؟ ا .. ئای نەورۆز؟..چێژنێکی؟ نەکۆن دەبی .. نەپیر دەبی .. وەختی خۆی بە دزیەوە یادمان دەکردیەوە . دەوڵەت پێی بزانیایا شێتگیردەبوو.. دووجار لەیادتا زیندانی کرام ، بەشێ بووی لەخەباتی ڕامیاریمانا لەودنیا بیستم ، ئێستاش بۆهەمان مەبەس ، بە دزیەوە یادت دەکەنەوە.. بەڵام بۆ نەورۆزی تێرو پڕی شایی‌و زەماوەندی دەوڵەت ناچن .. لەورۆژەوە ئەم قەوارەیە ڕەنگی رژاوە ، دەولەت هەردەوڵەتە سەرەنجامی کاری تەواوکردنی ڕێبازی پێش خۆیەتی کورتانەکانیان دەگۆڕێ . پاش نیوسەدە ، دیسان ئەوەی لەنەورۆزی دزی دا دەگیرێ ، لەجاران توندتر سزا دەدرێ .. ئەورۆژە دێ کەس بەدزیەوە نەورۆز نەکا ؟... من نەم دی ..

ئەوە ( دەربەندی گۆمەسپان ) دەمی دەریالووش کردۆتەوە ، بەحەپەساوییەوە سەیری مێزەری سپی ( سەری ڕەش ) دەکا ؟! یان حەپەساوی منە لەوا ەدی دەکەم؟! .. ئای چەندم ئارەزوو دەکرد ، پێش ئەوەی هەناسەم لەگۆمی لەناوچووندا بخنکێ دیدەم بەبەفری کوێستان ڕوون بێتەوە . خۆم لەدەوری شێرەبەفرینە بگێڕابایەوە ، بەچنک ،

ـەرم لەدەمم بئاخنیبایەوە.. سەیرتان پێ نەبێ
ـحەسوودی بەو سەگانەش دەبەم کە لەناو بەفرا
ـکەوزن ا.. لە (دیوانیە) خەونم بەسەرەتای
ـی مامۆستایم دەدیتەوە .. تولەرێی باریکە.
ـدرِی عاسێ ... هاوارودەنگ و ئارەزووم لە
ـدکاندا دەنگیان دەدایەوە .. ناوباخان
ـردەبازی رووبارەکان ، بۆنی گوڵەکێویەکان
ـو ، سوێسکە.. خولیامن .. هەرکەسێ وەک من
ـت وهەشت ساڵ دەربەدەری بیابانی ئەو خوارە
ـووبێ ، تامی ئەو خەونە خۆشانە ناکێژێ ا ...
ـمردوویش خەونیان پێوە دەبینم..ئەوەدیسان
ـ ـەکە بۆ وەستا ؟! .. لەجیاتی من سەیری دەرەوە
ـکەن ا.. بەراست ؟.. ئەوە چوارەم جارە ئۆتۆمۆ
ـلەکە دەپشکنن ا.. حەقم نەبوو، خەونی سوورم
ـتەقەی تفەنگی برنەوەوە دەدی ؟ .. بێ ئەوەی
ەست بکەم، بەخەیاڵی ئەوانەوە، پەلاپیێکەم
ـزواند.. هەرکە کورد دەستی دەدایەوە چەک
ـمم دەکردەوە میکرۆفۆن و چالاکیم بۆ هەڵدەبە
ـن ، بۆ دۆست ودوژمنم دەگێرایەوە. دۆستە
ـ زەزاکانم ، لەدوورەوە دەنگوباسی هەڵسۆی
ـتوانیان لەرووما دەخوێندەوە.. جا عەبدوڵلاسامی
ـکەی تۆ جەلەوی خەیاڵت لەمەکەمتر رۆیووە ؟ چ
ـاتی یادی ئێرە، ووردەوردە، دڵ وجگەرو ژیانتی
ـخواردووە؟.. منیش حەزم دەکرد، هەک چوار
ـتکنین ، لەم ئوردووگاگەورەیەی دروستیان کردوە
ـدجار رایان گرتبام، وەک ئێوە چەوساوەبومایا
ـۆستاڵی داگیرکەر دەمولوتمی بکووتابایەوە ...
ـەلام لێتان دوورنەکەوتبامایەوە.. کێ بەقەد
من نامۆیی دیووە؟ غەریبی کێشتووە؟! بیست و
هەشت ساڵ نامۆیی ، بەدەمیش خۆش نییە..راوەستە
ـا ... (دێگەڵە)یەو رێگاکەی سەرخراوە.. چونکە
کە لە (هەولێر) پارەمان وەردەگرت و دەگەراینەوە
ئۆتۆمۆبیلەکە بەناودێدا بەنەفەرەوە سەرنە
دەکەوت ... بەپێ دەمان کوتا ... ئەورۆژانەشیان

لێبریم، هەرچەندساڵی بیرە شاددەبوومەوە....
ئیتر ئەم ناوەم لێ قەدەغەکرا. بەزی و عاگول
تەڵبەند کرام.. لەبەندیخانەی بێ دیوارازیندانی
کرام.. بەڵام هیچ کاتی وازم نەدەهێنا .. هەر
هەلێکم وەدەست کەوتبێ لەدەرگای میریمداوە،ئەم
سکالایەمیان دەدراند، یەکێکی تری بەدوایا
دەچوو، ئەمیان دەشاردەوە، ئەوی تر لەبەر
دەمیاناقووت دەبووە... بەرێوەبەر وەرس بوو.

لەناوەراستی ژوورەکەی تاوانبار ئاسا، راێگرتم
(ـ بۆ بەرۆکمان بەرنادەی ؟.. ساڵی پێنج
ساڵ ، دەساڵ .. ماندوونەبوی ؟!
ـنەخێر .. کەس لەداوای گەرانەوە وەرس ـ
دەبێ ؟! .. دەمەوێ بچمەوەلای ..
ـ پیاوی دڵسۆز، هەموولایی شاری خۆیەتی،
ئەگەر مەکتەبەکەت ناخۆشە...کوێت دەوێ..
ـ بگەرێمەوە ا
ـ نابێ ا
ـ بۆ ؟
ـ چونکە نابێ ا
ـ خەڵکی تر لەگەڵ من هاتن ، گەرانەوەدوای
من مامۆستا هاتن ، نێرانەوە
ـ ئەوان جیابوون
ـ دۆست وناسیاوی خۆمی تێدابوو
ـ باخزمیشت بووبن .. تو مامۆستا عەبدوڵلای
و ئەوان جیان ا
ـ وتم .. هەمووی هەریەک تاوانە، یەک
سزایە
ـ ئەوان خاوەنیان هەبوو، یان ژیر بوونو
خاوەنیان بۆخۆیان پەیداکرد
ـ چارە... دەمەوێ بگەرێمەوە ناو خزموکەس
وکارم ... چارە
ـ ئاسایشی گشتی ا
ـ وا بەئاسانی ؟! )

ئیتر بەکاری خۆشم ـ سەرم بەبەرێوەبەرایەتیەکە نەکرد.. کەپیربوومو گورم تێدانەما ، بێ ئەوەی سکالاّ بنوسم . داوایان کردم.. خۆم دواخست ....

ناردیانەوە شوێنم .. لەسەرهەمان مێزوکورسی هەمان کابرای ڕەشتالەی لاوازی باریکەلە دانیشتبوو . زۆرم لێ راما ، سەیری سەری سپیو لۆچی ڕووم، لەناو بیلبیلەی چاوم چەقی..لەبەر هەڵسا ، دەستی گۆشیم ، لەنزیک خۆیەوە دانام قاوەیەکی تاڵ ، بەڕێزی سەرزارەکی پڕ فیعزو لەخۆبایی بوو، دەی دواندم... تف ونەعلەتی سالانی پێشووی دەکرد، نەبای پیاهاتبوو نەباران

( ـجا .. کەس ماوە سێبەری پیرۆزی چواردەی تەمووزی نەگرتبێتەوە؟! .. یانی چی تائێستا لێرەماوی ؟! .. کەهاتنە گەڕەک ، من منداڵ بووم. لەسەرەتای خوێندن دەرست پێ وتم.. ئەوە چەند ساڵیشە لێرە خزمەت دەکەم.وآنەی شۆرش بەگوێی خەڵک دادەدەم... وانییە؟

ـ ....

ـ .. وەختی خۆی ، دوو ـ سێیەکیان فێری خوێندن بکردایا ، ئازادومەرەخەس دەکرا ... تۆ سەدەهات ڕاهێناوە.. لەپاداشتی ئەوە بێئەوەی پرس بکەم، کوێت دەوێ ئامادەم ..ج شارێکت گەرەکە بۆت دەنووسم...

ـ بەڕاستێتە ؟! ... یانی

ـ ئەمرکە ؟

ـ دەگەڕێمەوە شارە خنجیلانەکەی خۆم.. بەڵکو لەدوا تەمەنما ، شنەی ئێواران و سایەی سبەینان ...

ـ ئەوە ئەلێی چی ؟.. مامۆستایەکی وەکو تۆ لە ( لیواوە ) دەچێتە ( قەزا ) یان بە پێچەوانەوە؟! .. وامن دەنووسم لەپایتەختت دانێن !

ـ بەڵام خۆ تۆ وتت

ـ .. خوات لەگەڵ ، بەخێر بێی چاوەڕوان بە) کەبیرم دەکردەوە ، خوێواوک ناودەمی ساردوسرم پڕدەکا . بەسکم لەسوێری دەنرێ... دەگریام. وەک ساوادەگەریام، بێ فێل دەگریام.. شەوەها خێزانەکەم لەهەنسکم بەخەبەر هاتووە، خەو لەچاوم تۆراوە.. لەغەریبیەکەوە چوومە غەریبیەکی تر.. ڕۆڵەکانم لەدەوری خۆم کۆدەکردنەوە.وەک داپیرەی بەر ئاگردانی زستان ، سەرگوزشتەی ڕۆژانی لاویەتیم بۆ دەگێرانەوە.. مێژوی نەنووسراوم لە بیریانا تۆمار دەکرد، درۆکانی قوتابخانەم پوچەڵ دەکردەوە ، بەئاوی ساخی حەمامۆک مێشکیانم دەشووشتەوە. بەنیمچە پارانەوەیەکیش پێم دەوتن

( ئەم ڕاستیانە ، لای مامۆستاکان نەدرکێنن، ئەگینا تاپاتری پۆتمان گیر ناکەن ! )

ئەمەم خەبات بوو یان پەلەقاژەی سەرەمەرگ؟! .. ئەم گۆشەگیریە ـ دەربەدەریەم ڕاستربوو ، یان لەسەر چەند پەتی ياريم بکردايا ؟! .. لەگەل گورگ بمخواردایەو لەتەک مەر شیوەن ا .. کێ دەتوانێ ، کێ حەقی هەیە.. هەڵی سەنگێنێ؟

وامەزانن گێڕانەوە ، ئێوەی لەبیر بردومەتەوە. ئەوە دوو ڕیانی کۆیەوتەقتەقەو دوا پشکنین ... ئەوەچونە تائێستا سەریان هەڵنەداومەتنەوەو کفنەکەیان نەپشکنیووە؟ ئەبێ لەبەر حورمەتی مردووبێ یان لەترسا ؟! .. ئەوە گوڵە ( میلاقە )یە بەدەستی ئەو سەربازەوە؟ دەتۆزێ دەستت بەرز کەوە. لەودەچێ .. خۆزگە بمتوانیبا تۆزێ سەرم بەرزبکردایەوەو گوڵەکەم بدیایا .. هات ..هات پاسەکە بەرێ کەوت .. هەرنەمدی ؟! .. من بە زیندووی شتم نەدەدی ، جابەمردوویی ؟! .. شۆرش هەڵسا ، هەرگوێم دەبیست . ڕێک دەکەوتن ، هەر بیستن بوو.. کە نوچەگەورەکەی دا .. گوێم کەر بوو، چاوم کوێر بوو، زمان لاڵ .. لەپەل وپۆ کەوتم، لەنەخۆشخانەی دڵی خستم .. من سەیرم

ـەئێوەدێ ، پاشئەوە چۆن ماون ؟! چۆن دەژین؟!
ـۆلای ئێوە :

(.. ئەو تاکە کوڕە نەبوو کەپاش چل ساڵ ـەزۆکی ، لەدایک ببێ .. لەتافی لاویەتیدا لەوکاتەی ژنی بۆ دێنن .. بکوژرێ ؟! )

کەستان ، هەستان ، بەو ئازارە جەرگ بڕە نەکرد؟

دیسان وەستا .. دوو قەمەرەکەش هاتەریز ..ئەوە گۆرستانی ( عارەبیان)ەو بێدەنگ کێلەکانی لە ـوەش گرتووەو گوڵکۆی تازەی لەبل بۆ هاوڕێ مردووەکانم لێدەدا .. ئێوە .. هەموو .. دەکەسی ـەبن .. دە ؟! .. یانزدە کەسی .. ها .. کەسی تر ـەدی ناکەم .. کەوە ڕۆژەو کەسی تر بەدی ناکەم ـن شایەنی ئەوەم دەکەسی بمنێژێ ؟! .. یان هەر ـەماڵەو نوێنەری خۆیان ناردووە؟! .. ئەگەر وابێ ، لەمنیشەوە دەست پێ بکەن ، کارێکی حوانە ا .. بۆ ئەم هەموو خەلکە بەدەشت کەوێ، ـەکاروکاسبی دابرێ ...

( هەندێ دەیان وت ، کۆییە دەست ڕۆیشتووەکان شارۆچکەکەیان جێ دێڵن .. لەسەرەمەرگا نەبێ کۆییان وەبیر نایەتەوە .. کەمردیشن ، لاشەیان دێتەوە کۆیێ ، سێ ڕۆژە لەپرسەیان دادەنیشین و ( سفرە ) شیان بۆ دەبەینەوە !! )

بەڵام من ، دەربەدەری خەباتیانم ئەی بۆ ـەهاتوون ؟! .. دەبێ حیسابی پاشەڕۆژیان ـەکردبێ ؟! .. کەی ئەم شارە بەهاری بەخۆیەوە دیوە ؟! .. هەر پایزەوخەزانە .. وتم پرسەم بۆ دامەنێن ، بەڵام نەدەبوو بەمجۆرە فەرامۆشم ـکەن ! .. بۆ ڕوالەتیش بوایا بەدوای تەرمەکەما ـهاتابان ! .. کەس ئاگاداری کردوون ؟.. کێ دەڵێ مردنی منیان بیستووە ؟! .. نا ..نا .. کێ دەڵێ عبدالله سامیان لەبیرە ؟! .. گۆشەگیرێکی دوور وڵاتی کەللەرەق .. من گۆشەگیر بووم ؟! .یان ئامادەنەبووم تۆسقاڵێ لەشەرەفی نەتەوایەتیم ـدۆڕێنم .. ڕامیاری هونەری مومکینە ؟! .. نا ..نا

دەبوایا بێن .. هونەربێ .. هونەرنەبێ .. مومکین بێ، مومکین نەبێ .. دەبوایا بێن .. ئەی بۆ نەهاتوون ؟.. نەبایە ، نەبارانە ..کەوەڕۆژێکی خۆشە .. بۆنەهاتن ؟! .. ئەبێ لەدوورەوە . کەس دیار نەبێ .. لەڕووی وەستاوەکانیدا هیچ ناخوێندرێتەوە .. یان من ڕووی زیندوانم پێ ناخوێندرێتەوە ! .. ئەوە بۆ جوورم .. برازاو خوشکەزاو هوردوو کوڕم .. بەلاقی دارەمەیتەکەدا نووسان ، هەڵیان گرتم . لەپاس داگیرام . لاشەی ساردەوەبووم ، وەک بێشکەی سەرگوێدرێژی؛ کۆچەریان هات وچوو ، تەنیشت وقەپرغەم بەر دارەمەیتەکە کەوت . لەترسی ئازار ، خەریک بوو ، پر بەدەم هاوار بکەم . نەلێوەکانم لێک ترازان نەئازار میوانم بوو .. دیارە لەبەر ئازاری زیندوو ، هەست بەئازاری مردوویمان ناکەین ..یان ئازار ، پێش خۆمان گوڕەوشار دەدرێ ا ..

ـ بەقوربانتان بم ، لەسەرەخۆ .. با نەشلەقی ... ئەوەندەی بەسەرمانەوە هەیە .. خێرەکەی لەوە دایە . ئەوە ، بۆ وا ، بەسۆزەوە کوڕەکەم هاوار دەکا ؟.. دەبێ ئازارەکەم چوبێتە گیانی ئەو ؟.. خوا دەست بەباڵیەوە بگرێ .. وەک شوێنەوارم بزربوو ، ناوم بزر نەبێ .. دەبێ مێژووی ئەم شارە من فەرامۆش کا ؟.. لەتەنیشت ناوەکەمەوە چ دەنووسرێ ا .. کۆتایی بەچ وشەیەک دێ ؟.. بۆ دایان نام ؟.. حەقیانە ، هەناسە بڕکە بوون .. شەش ـ حەوتێکن و شوێنەکەش ڕک .. ئێرە ؟ چی .. ڕێکەوتە ؟.. من بڕوام بەڕێکەوت هەبوو ، نەک بە شانس .. لەسەرەمەرگیشا ، بەدوودڵیەوە شایەتمانم هێنا .. بۆ لێرە وەستان ؟! .. دەزانن جێ نزرگەیەکی پیروزە ؟! .. یەکەم چالاکیم لەسەر ئەم تاشەبەردە شین باوە بوو .. ئای ژیان پاش نیوسەدە چۆن یەک دەگرینەوە

(.. وەک جوتیار ، بەدەوری خۆما ، بیری نوێم

تۆو دەکرد. لەدەرگای شێخ ومەلاشـــــم دەدا ئێوا ریەکی هاوین ، مامۆستا یەکم وەگیرهێنا .. پیاسە. قسەی خۆش.. مەبەسم هێنا وبـــرد ... ئەوەی دەمویست ئاگای لێبێ، ڕستەکانـــــم دووبارە دەکردەوە. دانم بەهەنـــدێ وشـــە دادەنا .. دڵەکوتیش بەری نەدەدام.. دەبێ لـە تاقی کردنەوە ناخۆشتر هەبێ؟.. بەجووتـــــە لەسەر ئەم تاتەدادەنیشتین .. بانگـــەوازی ڕێکخستن بەگوێی دادا ... بەڵام سەیـری بـــە قسەکەم نەهات ... چونکە ناوم وا زرابـــوو.. قایمەقامو قومیسەریش ، دەیان زانی ..)

تاتە بەردەشینەکە، لەناو دەروونی خۆتـا ئـەم ڕاستیە تۆمار بکە.. ئەوە کێیە.. لـــەوناچـی؟ هەرچەندە ناویم بیرچۆتەوە، بەڵام لـەودەچێ .. بۆ دوورەپەرێز وەستاوە.. پیری پێوە دیـارە.. قورسایی خۆی ختۆتە سەر گۆپاڵەکەی دەستـــی، لەژێر عەینەکی زەڕەبینی ئەستورەوە ، سەیــری بەردو دارەمەیتەکەم دەکا .. ئەگەر ئەوبـــێ، وەک من یادی ئەو ڕۆژە پیرۆزە دەکاتــەوە؟! ... خۆزگە، مردوو کەشەرەفی ژیانی لێدەسێنرایـــەوە شەرەفی ئەوەی پێدەبەخشرا کەبیـــری زینـــدوان بخوێنێتەوە.. چاک لێی د دەرەوە.. هـــەوە؟... دڵۆپە فرمێسکی ژێر دینەکەی ، خۆشەویستـــیو وەفاداریە یان پەشیمانی ؟! .. نـــەء ... نەء . بێگومان .. خۆشەویستی .. هەمان فرمێسکـــــی شانۆگەری ( بووکی کوردستان)ە.. لەومانگانەشدا ( زامدار) ناوی هەمان برینی کولاندمەوە .. دوو پۆلیسی دونکی بەدەست .. مۆرکردنـــی هۆلـــی قوتابخانە.. بەخۆنیشان دان ، ڕوومان کـــردە سەرا.. قومیسەرودونکی و نەڕاندنی .

(ـ بۆ ئێمە نازانین ، بووکـــی کوردستـــان نەوتەکدی بابەگوڕگـــوڕەا ؟ .

ـ جەناب ، لەعەرەبیەوە کردوومەتـە کـــوردی ناوی خۆی ( بووکی لوبنان ) بوو.

لەوێ نەنەوت هەیە، نەئینگلیز .

ـ جەنابی عەبدوڵلا سامی ، ئەمەش ( یانە)ی خەلکی واتێدەگەن ، دیارە مەبەستتان ئەوە ئەو هەموو چەپلەیەتان بۆ لێدەدرێ.. دەبـ
ئەو هەموو چەپلەیەتان بۆ لێدەدرێ .. دەبـ
هەلگیـــرێ .

ـ ئێوە ڕێی چالاکی هونەریمان لێ دەگرن .

ـ چاکە.. گەورەوبچوکتان لەزیندان ناناخن ئەمسەرە سەری خۆت نییە..

بۆ قوتابی و خەلکە نەفامەکە هـــار دەکـــەی هەر ڕۆژە گۆبەندێ دەبینیتەوە.

ـ ئێ .. دەوابلێ .. لەشانۆگەری قوڵترە..

ـ تۆ یاری بەئاگر دەکەی .. )

بەڵام وازمان نەهێنا . لەهەر شارۆچکەیەک ڕێما لێ دەگیرا ، لەناوچەیەکی تر سەرمان هەڵـــدەدا چاوشارکێی مشک وپشیلەبوو.. لەتۆڵەی ئـــەوە هەرشەوە یەکێکمان ترشکین دەکرد. جگـــە لـە قایمەقام، ئەوانی تر یانەی موچە خۆرانیان لێ حەرام کرابوو.. نەشیان دەوێرا زۆرمان لێ تونـ کەن وەیان دەزانی ئاغاکان لەسەرمان دەکەنەوە تائەو ڕۆژەی ( تەموین ) یان دا ... لێک ئاشکرا بووین و بەرووی یەکا تەقینەوە:

( ـ ئازووقەی کەم وەرناگرین ا .. ئەوشتانـــە پاک نین نامانەوێ .. برنجوگەنمی بێ خـــۆڵ بەردمان دەوێ.. ئەوشتانەی بۆئێمە داندراوە لەمە پترە.. )

هەتادەهات خەڵکی زۆرتر دەبوو، وەک کورەی هەنـ مونجەمان هات ، چاڵاکانە کەوتینە ناویـــان داوای نارەزایی دەربرینمان لێ دەکردن، هـــە یەکە بەجۆرێ ، یاخی دەبوو :

(ـ لەتەمووین خواردنمان بێدەنگ نابین .

ـ لیستەی ئەوشتانەی هاتووە ، کوا ؟

ـ مەزبەتە دەکەین ، باقایمەقام بزانێ !

ـ بەینی خۆمان بێو لەناومان دەرنەچێ تایمەقامیش شەریکیان نەبێ ، دەمی چەورکراوە
ـ دژی ئەویش دەنووسین ا
ـ وابەئاسانی ؟! .. ئاغاوپۆلیس و شاریان ـەگەڵایە .

ـ مەزبەتە لە ( شا )ش دەکەین
ـ ئەو ( خەفیە )یە گوێی لێیە ا
ـ باشتر ، بۆ تەموینی ئەویش ناخۆن ؟!
ـ بەدەو بیست قات دەیفرۆشنەوە .
ـ ئەوا من مەزبەتەکەم هێناوە ، لەپێش هەمووشتان مۆری دەکەم ، دەبا بزانم چ لە عەبدوڵلا سامی دەکەن .
ـ مامۆستا ، من خۆم بەشاگردی تۆ دەزانم ، شەرەفە لەخوار ناوی تۆبم ...
ـ ئەوا منیش مۆرم کرد
ـ منیش ... ئەی تۆ کاکی پۆلیس ؟
ـناوێرم .. تەموینم کەمبێ ، بەس مانگانەم نەبڕێ .
ـ دەڕێی من کە .. ناوم بنووسن .. پەنجەی پێوەنێم .
ـ کوڕە بەخوا ، هەر دەپەنجەی دەستم ببڕن بەپەنجەی پێ مۆری دەکەم .. پیاوی برسی هیچ ناپرسی ...)
هەر مەزبەتەکە گەیشتە هەولێر ، پاش چەند رۆژێ ـرای بچووکم بۆ ( هەڵتەر ) زاوام بۆ (بێتواتە) ـمیش تا (عەفەک ) ی نزیک ( دیوانیە ) خۆم ـەگرتەوە .. مامۆستاکانی تریش هەریەکەو بۆ ـەناوپەسیۆێکی ئەم کوردستانە ...
واخەریکە نیوەڕۆ دابێ ، کەس بەدەنگمەوە ـەهات ، هەر ئەو دوانزدە ـ سێنزدە کەسەن .... دەبێ لەناو ( کۆیێ ) هاتوچۆ قەدەغە نەکرابێ ا ؟ یانی چی .. خۆزگە دووجاری تر بمردابامو وابێ کەس نەنێژرابام .. ئەویش هەر سەیرم دەکا .

تۆزێ لێم نزیک بێتەوە ، ڕووی جارانی دەخوێندمەوە .. نا .. هەرئەوە .. چەند ساڵێ لەمەوبەر دەنگوباسی شەهیدبوونی دوو کوڕی ( هەڵـۆ ) یم بیست .. ئەو لەمن باشترە .. پاش ئەوەی کەنفت بوو ، ئاڵاکەی دایە دەست جەرگەکانی ... چاک نییە شوێن پێی ون نەبووە .. بەڵام من .. وابەم دەردە چووم .. کەس ئاوڕم لێ ناداتەوە .. لێرەش شوێن سەرم هەرایەتی .. لەتەنیشت گوڕەکەشم ، ناوەوەی نابینم .. بەڵام هەر بەرد بەردیانە .. ئەوبەردە بۆ مانی گرتووە . سەرم پان دەکاتەوە یان دەیەوێ ببێتە سەرینی هەتاهەتایم .. گوێم لێیە :
ـ وابەئاسانی دەرناچی ، بنی بدەنەوە
ـ تۆزێ خێراکەن ، باران دایکا ، هەر دڵۆپەی کوندە ئاوێکە
ئەمە هەوری باران نییە
ـ تا .. خێرا بنێژرێ ، خێرەی زۆرترە ..
ـ ئا .. نەموت .. وانەبوایا ، دەرنەچوو ... جێگاکەشی خۆشتربوو ..

خۆشتربوو ..
ـ ئەوە ، مەلاو حەوت ـ هەشتێکی تر هاتن .. . بەڵکو تەواو تەختی کەین ..
بێ ئەوەی بزانم ، دەمویست تەکان بدەمو تازە هاتووەکان ببینم .. بەڵام سەری ساردەوە بووم ، نەبزوت ، ئەوانیش لێم نزیک نەکەوتنەوە ، ئەم مقۆمقۆیە چییە .. کەسیان منیان لەبیرنییە . دوو ـ دوو ، سێ ـ سێ ، وەک مار تەپکەیان بەستووە ، قسەی بەتیکوڵ لەیەک دەگرن . تەنیا گۆپال بەدەستی هاوڕێم نەبێ ، دەنگوباسی خەباتم بۆ برازاکەم دەگێڕێتەوە .. بەشانازیەوە باسم دەکا .
ـ حەزدەکەم ، ئەو شەرەفەم پێ ببەخشن . هەرسێ ڕۆژ لەماڵی من بۆی دانیشن .

ـ وەسیەتی کردووە ، تازیەی بۆ دانەنێین .... چەندجارێ لای هەمووما ن دووپاتی کردۆتەوە .

ـ دیارە ، پیری ودەربەدەری ، ساردوهیواش نەکردۆتەوە .. بەرەحمەت بێ، بەلاوی ئەوەندە سەرکێش بوو ، کاربەدەستانی کۆیێی هێنابووە زەلالەت .

ـ سەرخۆش دەبوو ؟

ـ چەندی بخواردایەوە ، هەروەک خۆی بوو ، بەلام بەقەستی خۆی لە ( قومیسەر )و ( مودیری تەموین ) و ( قولچی ) سەرخۆش دەکرد ، بە ( کاریکاتێر ) ڕەسمی دەکردن و بەشاگردی یانە بۆی دەناردن ناچار مێزیان جێدەهێشت .. تاوایان پێوەدا دەربەدەری شارانیان کرد .. باشتر نەبوو ،بە وردی بیجنیایە .. دوور بڕۆو سەلامەت وەرەوە ، چاک نییە ئێستاش هێشتیان تەرمەکەی بێتەوە کۆیێ ؟...

ـ بەمردویش لێی دەترسن ؟!

ـ ئەی چۆن ؟! .. ئاو خواردنەوەش لەسوراحی داگیرکەر ، لای ئەو تاوان بوو ، لای ئەو شتێ نەبوو پێی بلێین ( تەکنیک ) .. ئەوەی گەرەکی بوو ، ڕەپ وڕووت دەیووت ا .

ئەوە ڕای برادەرەکەمە ، ڕەنگە هەندێ خراپتریش بلێین .. بادەستی بەکلاوی خۆیەوە بگرتایا بانەی با .. وادەزانن لەدەربەدەری بەولاوە هیچی ترم پێ نەبڕا .. تەنیا یەک ڕۆژ ڕێیان دام لە پرسەی برام دانیشم .. ها .. وانییە ؟! .. باشە خۆتۆ ، هەموو ئەوشتانەی لە فەرهەنگی رامیاریدا هەیە ، بەکارت هێنا .. ئەنجامەکەی دوو کوڕی شەهیدو هەرەسێکی تاڵ بوو . . ناخەڵکینە ، ئەم مەسەلەیە واسەیر ناکرێ.. من ئەوەندەم بەسە ، تادەساڵیش ، خەڵکی دەیان وت :

( لەکێ بترسێن ، عەبدوڵلا فەندی عەیب و عاری دەرخستن ، چیان پێ کرا .. هەرئەوەندە نەبوو ناردیانە عەفەک .. ئەی ئەوان چیان بەسەرهات .. پاش دوو مانگ هەموویان لابردن دووانیان دەرکران ، ئەوی تریان تا ( بەسرە ) خۆی نەگرتەوە!! )

بەڵام ، ئەم لەبیرکردنەشم تاڵە .. من بایی ئەوەم بیست کەسێ بەڕێم لکا ؟.. کێ دەڵێ قسەی ماموستا ڕاست نییە ؟.. ئەم لەجێی من بوایا ، چەندی بەدەورەوە دەبوو .. دارەمەیتەکە جولا ، هەموو سەرەکان سێبەریان لەکفنەکەم کرد ، ئەوە دەڵێن چی ؟...

ـ دەی ، هەڵی گرن .. ئاگاتان لێبێ زۆرنەشەقێ

ـ ئامادەبن .. سەبر داینێن ..

ـ دووکەس بچێتە ناوەوە ، تەرمەکە وەرگرێ

ـ دەتۆش بەردەکانی سەرسنگی نزیک کەرەوە .

ـ باوکەڕۆ ... باوکەڕۆ ..

کوڕی خۆم مەگری .. واخەریکە لێتان جیاببمەوە بەڵام بەکارت ، بەکردەوەت .. ناوم بزرمەکە .. ڕێ بەرمەدە .. مەگری .. گریان بۆ بێدەسەڵاتە ... تۆ هەی .. ماوی .. ماوبەتی خۆت دەرخە .. ئەم ساتانەم بۆ بنووسە .. واڵە دارەمەیتەکە دەریان هێنام ، هەموو بەیەک دەنگ هاواری گەورەیی خۆیان کرد . ئەوە لەناو گۆڕەکە درێژیان کردم .. گۆڕهەڵکەنەکان کفت وهیلاک بوون ، هەناسەیان کفنەکەم دەشەکێنێ .. هەموو .. لەسەر گۆڕەکەم وەستاون ، سەیری لاشەی ( سووک سەنگ)م دەکەن . چەند دلۆپە فرمێسکی ڕووی ژێرکفنی تەڕکردم جوانترین مرواری بوو پێشکەشتان کردم .. تەقەی بەردی ئەلحەدی سەرسینگم ، سرودی کۆڵنەدانمە .. لەدرزی بەردەکانەوە چاوم لەگۆڕ هەڵکەنەکانە در بەخەڵکەکە دەدەن ... بەپەلە خۆڵیان بەسەرا کردم ... لێک دابڕاین .

هەولێر ـ مایس ١٩٨٥



کورتە چیرۆک

# ژەهراوی بوونی هاوڕێکان

ئیسماعیل محمد ئەمین

-بۆ دلاوەر... کەنمە ژەهراوییەکان... هاوڕێی چوارەم... هەر چواریان بوون.... نا هەرسێکیان... نەخێر تەنها هەر سێ کەس ملنەوە بەرامبەر ئاسمانێکی بێ دڵ، بەساردییەوە لە هەنگاوەکانی خۆیــان دەڕوانی بیریان لە هیچ نەدەکردەوە تەنانەت لە هەنگـاوەکانیش چاوەکانیان لەهیچ شتێکی نەدەکرد لە خەمی نەدەکـرد تەنهـا لەکـۆمـەڵی هەڵاتی ڕاکردووی کەنار ڕەشەبا نەبێت... بایەك هات.. کف.. کف ف... ف تۆزو خۆڵێکی زەردی بەسەردا باراندن... بەڵام ئەوان هەرسێکیان نەجوڵان خۆیان لەهـاڵـتـوی بێـدەنگی دانقووم کرد... سـەیری درەختە دوورەکانیـان کرد ئاوازێکی سـەیـری قەدەری لەنێـو دڵە پڕ گۆشەگیەکەیان دا وورژاند، تەنها هەرسیان مابوونەوەو بەماتییەوە لەتـەمـومـژی ئەم عەسرە ئاڤـارەیان دەڕوانی. کۆمەڵێ باڵندە دەهاتن... زیك... زاق... جرك... جیو جیو... جیك ئاوەها هاتن و بەنـزمـیـیـەوە باڵە ئاسکـەکـانیان هەناره بەسـەر چووەکانی خۆشەوویستییان شەق پێ دەبرد، بەنێو پاکیزەیی ئاسمانە بێ سنوورەکەدا تێپەڕین بەسەر سێ هاوڕێکەدا تێپەڕین، کە ئەو ئاوەیان جێ هێشت زیاتر هەستیان بە تەنیای کرد بەوون بوونی هاوڕێکـەیــان، کەسی چوارەمــیــان، باڵنــدەکــان لە نێــو ڕووناییەکانی دەمەو عەسران دا وون بوون، وزیاتر بێزاری و بۆشایییەکی گەورەی بازنەیی لاجێهێشتن.

یەکێکیـان هەسـتـاو بەردێکی بەتوندییەوە کێشا بەڕووبەری ئاسمان دا.

- کراش.. ش.. ش.. ش.. بەڵام ئاسمـان نەشکا بۆیە چەند هەنگاوێك دوور کەوتەوە هەستی بەگەورەبوونی ئەمامەتییەکە کرد.

- تەنانەت باڵندە کانیش!!!

ئەوەی ووت و هەردوو دەستی خستە گیرفانیەوە، ڕاوەستاوێکی پێـڵاوە قاوەیـیـەکـەی لە خۆڵەکـە چەقاندو دەیوویست شتێك بدۆزێتەوە لەوانەیە بوونی خۆی بێت. دوای مردنی هاوڕێی چوارەمیان نەیدەوویست بیر لەوە بکاتەوە، بەڵکو تەنها بیری لەو ئاسمـانــە نزمــەو خۆڵەکـە نەبێت، چارنییـە... هاوڕێی چوارەمیان بەساردییەوە خۆی ڕاکێشابوو ... بێ جووڵە وبێ هەست، بێ لەرزینە سەیرەکانی ژیان، بەچاوە ساردەکەیەوە لە ئاسمـانی دەڕوانی، چەنـد هەنگـاوێـك لە دوو هاوڕێکەیەو خۆییەوە دوور بوون، دوو هاوڕێ کەشی وەك ئەوەی لە قوڵایی دەریـادا بێ ئاوا بەغـەمباریییەوە سەیری خۆڵە زەردەکەیان

دەکرد، بۆ چەند ساتێك نەبێت نەیان دەوویست بیر لەوە بکەنەوە کە دەبێت دوای ماوەیەك چوارەمیان بنێژن و خۆڵە زەردو بێ رەنگە کەی بەسەردا بکەن، نەیان دەتوانی بیر لەوە بکەنەوە کە ئاشتتی ئەو ئازیزە چوارەمیان، زۆر چرای ئەوتینەی دڵیان دەکوژێنێتەوە، هەر بۆیە تەنها لە نێو ئاسمانە نزمەکەدا گوێت لە هەناسە برکێی رابەوە درێژو پەنیکوتینەکانیان بوو، هەرسێکیان دەیان زانی گەر چوارەمیان بنێژن لە نێو دوورگە نامۆکانی بێداریەو بێ هوودەییدا دەخنکێن، بۆیە سەیری خۆڵەکەیان دەکرد و بیریان نەدەکردەوەو بێدەنگیان دەژمارد..

هاورێکەی تریان لە درەختە دوورەکانی روانی، لە کۆمەڵ پیاوی رووتی گەراوە لە زۆنگاوە کانی تەمومژیان دەکرد، سێبەرێکی درێژکۆڵە وەك جۆگەلەیەکی رەش لەسەرچاوە رەشە ئاوو سیوەکە، خۆی درێژ دەکردەوە، ئاسمانێکی نزم وەك ئەوەی لەسەر ئەو درەختانە راگیر بووبێت، چەند درەختێکی کزۆڵەی دوور لەنێو ئەماەتی خۆیان گۆشە گیر بوون

- ئای لەو درەختانە!!!

ئەمەی لەبەر خۆیەوە ووت و بێدەنگی هەناسەکانی دا بە دوورایی یە سەیرەکەی عەسرە رەنگ پەریوەکانی نێوان درەختەکان، پاشان سەیری هاورێی چوارەمی کرد بەساردیەو بێ ترپەی ژیان، بێ جوڵە، لەئاسمانە نزمەکەی دەروانی سەیری هاورێکەی کردو بریاریدا خۆی لەنێو تۆرە نهێنی یەکانی بێباکی و جگەرەدا نقووم کات، جگەرەیەکی گرداو سەیری زەویەکەی دەکرد هەوڵ دەدا بیر لەهیچ شتێك نەکاتەوە، ئەمیشیان سەیری کاتژمێرەکەی دەستی کرد. پاشان روانی یە ئاسمانە لێل و خامۆشەکە. خۆر لە دوورەوە لە پارچە نیسفەنجێکی ئاوسی یە رۆشنای دەکرد یا لە پارچە پەرۆیەکی رەشی نانەواخانەی دەکرد، بەتەنال ئاسمانەوە هەڵواسرابێ سەیری خۆری کردو کاتژمێرەکە کۆنینەکەی دەستی دڵە راوکێکەی لێ کردە سەگێکی هارو جەنجاڵ کرد، گوێی بۆ هەناسەکانی زەوی راگرت.. هیچ نەبوو.. پاشان هەوڵیدا گوێ بۆ دەنگە نەبیستراوەکانی ئاسمان بگرێ... هیچ نەبوو... لە دوورەوە زۆر دوور ماشینەکانی سەرجادە قیرەکە بەنێویەکدیدا دەچوون، وەك کۆمەڵ مێشی ئاوەراستی مانگی گەلاوێژ لێنج بوون بەڵام گوێی لە دەنگی هیچیان نەبوو.

- کوامێشەکان... کوا دەنگی باڵەکانیان..؟!!

ئەمەی لەبەر خۆیەوە ووت و سەرنجی ئەو کێڵە لۆکە چکۆلانەیەی دا کە. لە نێوان درەختەکان سەمای دەکرد و هێلێکی زەردی لەتەپوتۆز دروست کردبوو گوێی لە دەنگی ئەوانیش نەبوو، بە غەمبارییەوە سەیری هاورێ بێ گیانەکەی خۆی کرد لە ئاسمانی دەروانی بەچاوێکی گەورەی ساردەوە چارنەبوو ... نە ... ئەویش خۆی دا بەدەمی قاڵاووە نهێنی یەکانی کاتەوە..

سەیرێکی کاتژمێرەکەی کرد .. چك .. چیك .. چك .. تەنها دەنگی کاتژمێرەکە ژمارەکان لە کۆمەڵ مێشی مردوویان دەکرد هەستی بە بێزار کرد بێزار یەك لە بێزاری پەیە دەریاو کانیلە ژیرەکانی قوڵای ئەشکەوتێکی تەریك بکات و بێزاریەکی سەیری بێ رەنگ خۆر لە دوورەوە کاتژمێرە کونیلەکە بوو تیشکەکان لەپەتی تەناف ئاسا چووە کونیلەکانیان دەکرد تاڵە تیشکەکانی ئەو دەمەو عەسرە وەك کۆمەڵ پەتی رزیوو بەسەر زەوی شۆربونەتەوە، بیری لەمەکردەوە لەوانەیە ئەو پەتە خۆڵەمێشی یانە هاورێی چوارەمی بێ گیان بەرەو ئاسمان هەڵکێشن. درەختەکان لەو دوورایی یە سەیرەدا لە کۆمەڵێ منداڵی لەریان دەکرد دەستیان بە تەناڵ بەهراوی خۆر گرتبێت

- لەوانەیە درەختەکان خۆربەردەنە خوارەوە....

ئەمەی ووت و سەیری کاتژمێرەکەی کردو هەوڵ دا بیر نەکاتەوە.....

لە دوورەوە درەختەکان لە کۆمەڵێ پیاوی درێژی نێو تەمومژیان دەکرد کۆمەڵێ پیاوی بێدەنگ، بەساردییەوە لەو جەستە خوێناویەیان دەروانی ئەوەی بێ سنوورەکەی زیندان تیشکێکی سەیری بێ دەنگ خۆی لەسەر زەوییە مێزاوی و شێدارەکە رادەکشا لە تیشکی خۆری نەدەکرد لە رۆشنایی چۆری مێزی دەکرد سێبەری درەختە دوورەکان ئەمەی بیهێنایەوە ئای لەو درەختانە ....!!

هەناسەیەکی قری دایە دەرەوە وەك کۆلارە لە ئاسمانە نزمەکە گیهسایەوە سەیری هاورێ چاو ساردەکەی هەناسەکەی سەمای دەکرد لە نێو گردۆڵکەی هەورە سپییە بێ هێزەکان دا هەناسەی پیاوە چاو ساردو درێژ کۆڵەکان سەیر بوون ماوەیەکی

به سەردا تێپەڕیبوو، تەمەنی خەیارێك بوو لەو ژوورە پڕ سیسرك و یانە سەیرەی‌مێروومكان دا مابووە، دوای خامۆشی نیوەشەوان گوێی لە هەناسە برکێی سەیرەکانی نێو تاریکی دەگرت ئەو شەوە هەستا لەبازنە سەر سوورماوەکانی زەمەن دا هێشتا نەرمەکوکەیێکی سپێدان بوو، هەستاو ژووری زیندانە کەش بووبە کویچکەیەکی گەورە بێ سرپەوبێ هەست بەرەو دوو پیاوە درێژکۆڵەکە ڕۆیشت، چەند چارەکە مەترێ لەبەتانی یەکەی ـوانی وەك ئەوەی ئاژەڵێکی درەندەی نێو دەریای لەژێردابێ ـوا بەرزبوو هەناسەکان گەرمترو شلەژاوی جیهانیان ڕژانە خەیەکانی زیندانیان چڕدەکردەوە دەستی بۆ بەتانی‌یەکە بردولای برد، دووپیاوە زیندانی‌یە درێژ کۆڵەکان شلەژان یەکیان لەسەردەم ڕاکشابوو کۆمە تۆکنارییەکەی بە گەردوون پێدەکەنی، ئەوی تریان کە خۆی لەسەر سمتە تۆکناوییەکە جووت کرد بوو قلەپە ئێسکەکانی لە درەختێکی سووتاویان دەکرد هەستایە سەر پێ و دەرپێ کەی هەڵکێشایەوە هەڵاتە ئاسنینەکەی چلوانی تۆزی بزوات ئەو تریشیان خێرا بەتانیە سەربازیەکەی ـە خۆیدا دایەوە هەردووکیان خامۆش یان لاچێهشتنی و خێرا زیندانیان دەستە مۆکرد..

لەو ساتەدا ملیۆنێك قالۆنچە هاتن .. فك .. فك .. فك .. فك

باڵەکانیان بەتوندیەوە دەلەراندەوە بەسەر جەستەوە نیشتەوە.. ڕووخایت، وەك باگێرێکی خوکوژێنەر خۆت خستەوە باوەشی بەتانی یەکەتەوە..

- مرۆسەیرە -

تەنها ئەووشەیە دالدەی دەدایت جار .. جار ترووسکایی‌یەکەی ئەوتینەی دەداتێی کە لە زیندان هاتیە دەرێ گەردوون کراسەکەی گۆڕیبوو سەیربوو وەك جاران وەڵام نەبوو و لە ئەمامەتی پرسیاردا خنکێنرا بوو..

- ئای هاوڕێ کەم ..

بەغەمباریەوە بیری لە پیاوبشتێکی خۆکوشتن دا خولی خواردەوە سەیری هاوڕێی چوارەمی کرد . بەساردیەوە لە جیهانە مردووەکەی دەڕوانی لە ئاوابووە ڕژانی گۆڤەکی بێدەنگی بیری لەو درەختانە کردەوە لە هەورەوە هاتوون.

- لەوانەیە سێیەرەکەیان تێکەڵ بەلادان بێت..

بیری کردەوە خۆری بینی لە پەنجەرەی زیندانێکی گەورەی دەکردە تیشکەکانی بینی بریسکەیان دەگاتە هاوڕێی چوارەمیان...

هاوڕێی خۆشەویستی نێو میهرەبانیەکانی باران . مردن .. تیشکەکان لە میزی ئەخۆشیێکی سیلاویان دەکرد هەوڵ دا بیەنەکاتەوە پێش ئاشتنی هاوڕێکەیان سەیری خۆڵە زەردەکەی کرد و بیری نەکردەوە، ئەمی تریان لە بازنە سەیرەکانی بێدەنگی دامامە خولەی بوو لە ئاوارەبوونی پەلەوەری دەکرد دوای باڵندەکان هاتن و بەقەرەباڵغی‌یەوە ئەمیان چەنجاڵ کرد سەدەیەکی خنکێنراوی دەروونی لەزەمەنە سەیرەکەی باڵندەکان شێد بووەو بەڵام کە باڵندەکان ئەمیان جێ هێشت هەستی بەکەوتنە خوارەوەی ساتە وەختیەکانی بیەوەری کرد بە کەمارۆدان تەنها خۆی و دوو هاوڕێکەی تری و هاوڕێی چوارەمیان کەبەساردیەوە لە ئاسمانە نزمەکەی دەڕوانی .

بیری لە باڵندەکان کردەوە لە نێونە هامەتی کۆچ کردن دا ئەمیان جێهێشت وەك ئەوەی لە دارستانە چڕەکانی مانگەوە هاتبن خۆر لە سەرەتای دروست بوونی مانگ دا لەم عەسرە پڕ ڕۆشنایی یەکزە خۆی نیشانی گەردوون دەدا بیری لە باڵندەکان کردەوە چۆن لە ناو سەرەتاکانی مانگدا وون بوون

- تەنانەت باڵندەکانیش!!؟

ئاسمان بێ کۆتای وەرەشەبایی هەستە خەفە بووەکانی ئەمی وروژاند ترسا ئاسمانی بە چۆڵی بینی بێ باڵندە سەیری خۆری کرد هەرەشە لە ئاسمان دەکا تیشکە هێمنە سریەکەی لە لیکی دەمی جاڵجاڵۆکەیەکی پیری دەکرد .. ئەو دوای کۆچکردنی باڵندەکان خۆری بینی مووی زێڕینی لەسەرپشت ڕوابوو بیری کەوتەوە .. ئازیزی بیکەوتەوە

- بۆ وا سەیری خۆر دەکەی دەڵێی خۆرت نەدیوە؟

- دوای ئەوەی ئەو پۆلەنەو ڕەسە ڕەویان کرد خۆر لە جاڵجاڵۆکە دەچێ...

ئەوەندە پێ کەنی تاوەکو پرچەکانی کەوتنە نێویەکدیەوە

- قسەی سەیر دەکەی..

ئەوەی ووت و جارێکی تر پێکەنین ئاسمانی لەباوەش کرد.

- زۆر پێمەکەنە .... دەنا گەنمی زەهراویت دەدەمێ..

هەردوکیان پێکەنین ..

سەیری مووە زێرینەکانی سەرپشتی خۆری کرد بیری لەگەنمە

زەھراویەکان کردەوە وویستی پێکەنێت بگریت
- بیر لەچی دەکەیەوە..
- نازانم .. کەی مەلەبکەین ... کەی سەما بکەین ... کەی سواری پاسکیل بین ؟؟
وەک باڵندە پێکەنی ...
دیسانەوە بیری لە باڵندەکان کردەوە ئەم جارەیان تەرمی ئازیزی بینی باڵندەکان لەگەڵ خۆیان دەیبەن
- دەبێت لەکوێ هێلانە بکەن؟!
ئەمەی بە خۆی ووت و وویستی ئەو درەختانە بکێشی کەلە دوورەوە سێبەرە درێژەکەیان لە نێو وون بووندا دەرکەوت لەسێ ئاستە جگەرەی جیاوازی دەرهاتووی پاکەتێکیان دەکرد..
- سێ جگەرە .. سێ درەخت..
سەیری هاورێ چاوسارەو بێگیانەکەی کرد..
- بۆ تەنها سێ کەس..
بیری لە ئازیزی کۆچ کردووی نێو باڵیفە هەمیشە خەواڵوەکانی مردن کردەوە
- جگەرەی چوارەم بۆکەس نییە..
سەیری درەختەکانی کرد.... لەهەرسێکیانی دەکرد لەوون بوونێکی ئێجگار بێ وێنەی ناو تەرمباڵفییەبێ هەستەکانی قلۆر بوونەوەی دەکرد ... بیری لە باڵندەکان کردەوە
- باڵندەو کەنمی ژەھراوی ..
بەغەمباریییەوە سەیری راکشانە مەرگاو یەکەی هاورێی چوارەمی کرد سەیری خۆری کرد بە تووکە درێژبوومەکانی سەر پەرشتی لە جاڵجالۆکەیەکی ژیری بە ساڵا چووی دەکرد .. بیری کردەوە
- بۆچی جیهان ناگۆرێت ؟!!
هاورێی سێیەم ئەم پرسیارەی کرد ، سەیری چاوە ساردە بێ وێنەکەی چوارەمی کرد کەلە ئاسمانە نەویەکەی دەروانی سەیری خۆری کرد و بیری لە جیهان کردەوە ئەو جیهانەی کە هاورێی چوارەم دوای چەند ساتێک لەنێو چاڵە نیمچە قوڵەکە.... قوڵ و لاکێشەییەکەدا تێدا رادەکشێ... ئیتر خۆر نابینێ... بیری لەمە کردەوە... سەیری خۆری کرد درەختەکان لە دوورەوە گوریسە رایەڵ کراوە بەسۆزەکانی خۆریان لە پەلکەکانیان دا شەتەکێوتەوە بیری لەخۆر کردەوە...

- بۆخۆی دووبارە دەکاتەوە ...؟!
هەستی بە بێزاریەک کرد هەستی بە هەڵرژانی ژەھرکرد خۆری کۆتای بوو پارچە سلپاتێکی نێو بیچوونەوەی سات خەموکی یەکانی ئاسمانی دەکرد ، سووبارە بوونەوەیەکی سە کەماروێ دا وویستی جگارەیەک بکێشێ خۆر قونیەیەکی ژەنگاو بوو.. پێکەنی... جگەرەکەی نەکێشا... سەیری دوور کرد.... زۆر دوور.. ئاسمان نزم بووەوە.. زۆر نزم تا ئاسمان نز بۆوە هاورێی سێیەم رووی کردە دوو هاورێ کەی تری بێ ووتن
- بابینێژین !!
هەرسێکیان بەغەمبارییەوە لە نێوتەم تۆمانی غەمباری د سەیری یەکیان کرد پاشان سەیری هاورێی چوارەمیان.. چاڵە لاکێشەیی و قولەکە کۆمەڵە گڵە ئامادە میهرەکەی مردن. دەستیان کرد بە لێکردنەوەو هەڵوەشاندنی هاورێی چوارەمیا پەکەم جار بەسۆزەوە یەکەم پێچەکەیان لێ کردەوە پاشان دووەم پێچکە بە قوڵییەوە سەیری چاوە گەورەسنارەکەیان کر پێچەکەی هاورێی چوارەمیان (مۆتۆسکیلەکە) لەولاوە دانرابوو پاشان هەرسێ هاورێکە جەستەی ئاسێنی هاورێکەیان خستە کەرووی نهێنی وونبوونەوە گریان بۆ دواجار سەیری هاورێ بیرویی چارەکەیان کرد گڵیان بەسەرداکرد و بێدەنگ بوون گرینیان لە هیچ نەبوو.. جگە لە دەنگی خاکە نازەکانیان... پاشان دوو کێلیان بۆ چەقاند... سەیرییە یەکتریان کرد لەسەر کێلە بەردینە کە نووسیان (ئەمە گۆری هاورێ کەمانە) ئەوەندەو هیچی تر ماوەیەک بێ ئەلقێ بێ مەلا بێ قەرمباڵفی و پرسە.. راوەستان پاشان نێو چارەک یاریان بە پێچەکان کرد بۆ دواجار تلۆریان کردەوە پێش ئەوەی پێچەکان وون بێ پشتیان لە گۆری هاورێ کەیان کرد بەرەو سێ درەخت دوورەکە هەنگاویان نا.. ئاسمان سووربوو لەدرەختە کان نزیک بوونەوە تیشکی سووری نێوارە لە ترۆپکی درەختە کۆلکەکانی دەدا سێ درەختە کە لەسێ جگەرەی دەکرد... سێ هاورێ کەراوەستان سەیری ئاسمانە بێ باڵندەو بێدەنگەکەیان کرد... لەدرەختەکان نزیک بوونەوە.
بوون بەسێ دەنگەکەنمی ژەھراوی...
**سلێمانی / گەلاوێژانی ١٩٩١**

چیرۆک | جلیل کاکەوەیس

# بەرەو باوان

هەتا چاو بڕ دەکات نیگای بەری دەخات، لە زەوی ووشك و برنگ تر نییە، ئاوەدانی خواسایی چییە جگە لە چەند تەپۆلکەیەکی ڕم و خنکاوی نێو پووش و پەلاشی و زەردهەڵگەڕاو بەرەهەڵستی یکاکاری ناکات. ڕووانینەکەی لەئاست تەپۆلکەکان دا دەگرێت، ئینجا بە پانایی کیلۆمەترێکی چوار گۆشەیی سوورێکی بە دەوردا دەکێشێت، لە چوار قوژبیشەوە چوار شریکە دەردەکات، نیگای دەگێڕێتەوە سەریان و بە قووڵی سەریان دەکاتەوە، لە ئاست هەریەکێکیان دا گاڵۆکەیەك دەمێنێ: ڕامانێکی پڕ ئەفسوون و جۆشش، تەزوویەك هەستەی دەهێنێتە هەژان و ڕۆحی دەخاتە نێو جۆلانەیەك و هێدی هێدی ڕای دەژەنێت، هزریشی دەبێتە کوڕ کوڕێکی میلانە لێ ونبووی ئەوکەرمیانە، دەفڕێت و سەر هەموو تەپۆلکەکان تەی دەکات. دەنیشێتەوەو هەڵدەستێتەوە، باڵەکانی ە ڕك و داڵی سەر تەپۆلکەکان هەڵدەسوێت تا بەسەر تەپۆلکەیەکەوە دەنیشێتەوە: وەك ئەوەی بڵێت: ئەوا من گەیشتمە لانەی ونبووی خۆم و دەتۆش بڵێ:

تا.شا، منیش دۆزیمەوە، ئێرە لانەی ونبووی منە، لێرەدا لە مەناوی دایکم بەربوومەوە، هەموو جارێکیش پێی دەگوتم: ئێمە درەختێکین سوری ژیانمان لێرەدا تەواو دەکەین.).

چاوی بەو تەپۆلکەیەوە دەروێت، تەپۆلکەی تایین بڕینی کۆن و نوێی لێ دێنێتەوە سوێ، وەك جاری جاران تەپۆلکەکانی لێ دەژێنەوەو خەڵکەکەشی لەبەرچاو بەهەموو ئاکاریکیانەوە دەکەونە بزاوتن: ڕوخساری هەریەکەیان بەزرپ و زیندوویی دەبینێت:

ئەوە دەرویش فەتاحی شەکرەو لەو کۆڵانەوە ڕووەو مزگەوت هەڵدەکشێ و نەختێکی دی بانگ دەدا.

لەو کۆڵانەی تریشەوە کوێخا حەمەدو مەجید کۆڵیش پەدەمە تەقیوە هەر بۆ مزگەوت دەچن و مەلا عومەریش پێش نوێژیان دەکات.. ئا ئەویش ساڵە درێژەو بەدیار دامەکەرەکانەوە ساویلکانە دەمی دا بچریوەو تێیان دەڕوانێت و جارنەجارێك دەستێ بەریشەتۆبزەکەیدا دێنێت.. ئا ئەویش حەوزو ئاوەکەیەو پیرە دارتووەکەش خۆی بەسەردا نوشتاندۆتەوەو سێبەرێکی خەستی خستۆتە سەر. ساڵەش هەر بەناو چایخانە ژووروچکەیەکی لەپاڵ قوت کردۆتەوە.. وابەچاوی خۆم دەی بینم: منداڵانی ئاوایی بەو قرچەی نیوەڕۆیە خۆیان لە ئاوە لخنەکەی پیرە حەوز هەڵدەکێشن و هەرکە کوێخا حەمەدیان لێ دەرکەوێت ئیدی جلەکانیان بە پەلە پرووزێ هەڵدەگرن و بە ڕووتی دەقوچێنن و لە کۆڵانەکان دا خۆ تەفەت دەکەن.

لە دامێنی تەپۆلکەکەوەوە بەرەو شارێکەی باشوور نیگای دەگوێزێتەوە، تیژتیەڕ ئەوانی دیش بەسەر دەکاتەوەو رابردووی لێ بەرجەستە دەبێت، لەوێدا خۆی خەریك ناکات تا لە ئاست گۆڕەپانێکی بەرین دا ڕووانینەکەی ڕادەگرێت، لێرەدا درێژە دەخایەنێت، لەناوەوەیدا هزرێك بکوتێ ڕۆژگارێك دەکات و بەم تەرحەی دێنێتە زمان:

- ئا لێرەدا ڕەشماڵێکی چوار هەستوونی هەڵدرابوو، لە چوار سووچی ڕەشماڵەکەو لە ڕووکاری دەرەوەدا چوار کووپەی لەیلانی پڕ لە بەفراو لەو هاوینە سوورەدا دانرا بوون، چوار دەوری ڕەشماڵیش ئاوڕشینێکی تێر کرا بوو بۆ تەرحێ بۆنی خاکی تەڕ سەرپەلەی وەیادت دێنایەوە.. (ئەوەتا دوو ڕوخساری ناچوون یەکیش زەق زەق دەڕواننە یەکدی: ئاوەوەی بە ململانێی بیری (کەریم کۆیی) و کوێخا حەمە د هاتۆتە گێو گاز، لە دەرێش دا ئەو مارفە وخووی بە ڕەشماڵ دا کردووەو ناڵەو سۆزێك دەربڕێت مەگەر هەر خۆی بزانێت چ قەومانێك دەگێڕێتەوە.)

سەر لەبەری ئەو ڕۆژگارە دەستەویەخەی دەبن و بەئاشکرا پێی دەڵێن: (تۆ درەختێکی لەم خاکەدا ڕوایت و ڕەگەکانت بە قووڵایی ئەم خاکەدا ڕۆچوون، بەڵام وەیشوومەی ئاوەخت گەڵار چلیان تێك شکاندی!) نیگای لە تەپۆلکەکان گێر دەکات و لە

نووکـەوە بەهـۆش بیزاریان دەکاتەوە.. ئەوەتا بە چاوی دڵ و هۆشن دەبینێت کوێخـا حەمـەدو کەریم کۆیی شان بەشانی یەکـدی لەزارکی رەشمـاڵ دانیشتـوون: کەریم دەستـەسرە سوورەکـەی دەردێنـێـو چەشنی بەیـداخ بە دەستی‌یـەوە دەشەکێنێتەوەو ناوبەناو بە پێکەنینەیکی گاڵتە ئامێزەوە لابەلای کوێخادا دەکات و پێی دەڵێت:

- کوێخا، ئەم رەنگە سوورە شتەشت! مانای زۆری تێدایە: خوێنی شەهید، گڵپەی ئاگر، رووسووری ئافرەت و...

وادەبینێت حەمەد تەنگەتاوە، هەر بۆ ئەوەی خۆی لەو لاقرتێ پێیە وەلاخات هۆش و هزری خۆی تێکەڵ زەماوەندەکە دەکات، هەر واشە، ئێستا بەرۆح لە دەستی شۆخەژنێکەوە هەڵدەپەڕێو بەئاوازی شمشاڵەکەی مارف گیانی لە جەستەی دەرپەڕیوەو بەرز فڕیوە. مارفیش هەرکە لێوی نا بەلێوی شمشاڵەوە ئیدی ئاگـای لەم دنیایە نامێنێو دەبێتە (دەروێش عەبدوڵا) یەك و رۆحی دەبێتە کۆترە باریکەیەك و لەشەقەی باڵ دەدات.

چاو لەو شوێنـە ناترووکێنێ، درك و داڵی لێ دەبنە زەوی‌یەکی لووس و بێ رووەك، چاویشی بەزارکی رەشمـاڵەوە دەڕوانێت و رووخساری مۆنی حەمەدی بەزیندوویی دێتەوەیاد:

- کاکە کەریم، دەتواخوا ئەم دەستەسرە سوورە چی‌یە؟ کۆن بووەو باوی نەماوە، حەز دەکەم هەر تێ‌ی هەڵدەی!

- کوێخا حەمەد، ئەمە هێمای خوێنە خوێن، پاشە رۆژی ئەم خەڵکەیە، ئەدی نابینی چەند کەیف سازن!؟

-خوێنی چیو قوڕی چی! من دەزانم تۆ... کورە با نەی‌ڵێم، تۆ هێنیت، ئەوانەی.ئا.. ئەوانەی کە دایك و خوشکی خۆشیان.. تەحا! بانەی لێم.

- حەمەد، بایێت بڵێم من یەکێکم لەو خەڵکەو لقێکم لە درەختی پەل و پۆداری ئازارەکـانیان، من زادەی بیری مەلۆتکەی‌کەی (گـۆرقەرەج)م! دەزانی ئاوازی شمشاڵەکەی مارفیش مارشی سەرکەوتنی ئەم خەڵکەیە! دەزانی حەمەد!؟

-تۆ سەیری کە خەریکە بەگاڵەی دەم شار بەدەرم دەکات!

هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێت، بەچاوی ئاخ دەڕوانێتە تەپۆڵکەکان:

- ئەوە هەڵەکـەرەو بلوانـە، ئەوەتا دەبینم رۆژی جەژنەو لە هەموو ماڵێکەوە سنی‌یە چێشتی سەربەمەلاو رووەو مزگەوت دەبەن: هەر یەکەو لەتەرزێك لە دالانی مزگەوتدا ریزکراون: دە ئەمـاشا چەند بە تاسووقەوە هەموو تێ‌ی وورووکاون، چەند ساکـارن! رەنگـە کۆمـەڵە کەسێکی وەك ئەمـان لەم دنیایەدا بەختەوەر نەبن؛ مرۆ لە بینینیان تێر ناخوات.

لەم کاتـەدا دەنگگـەلێکی سۆزنـاکی بەر هەست دەکـەوێت. ئاشنان بە رۆحی، دەی هەژێنن، هەژانێك مەگەر ئەوساتە خۆی بێتـە زمـان و رست رست بی گێڕێتـەوە دەنـا لە دەسـەلاتی دارشتنی هیچ هزرێك دا نی‌یە.. لە رژمەلاتەوە دەنگەکان بەرز دەبنەوە، ئینجا دەبنە تەمە دەنگێك و دای دەچڵەکێنن. ئاوەر دەداتـەوە نیگـای لەگـەڵ شاری خامۆشان یەکانگیر دەبێت، کۆمەڵە رووخسارێکی ئاشنا ئامبازی چاوەکانی دەبنەوە، بەزرپ و زیندوویی، بە بەرگی ئاودامان سپی، سپی هەروەك قوزاخەی لۆکە.

لە نێو کێل و گۆڕی تەپیوەو، هەر وەك هەموو بوونەوەرێکی دی، بەرهەڵستاری زیندوویانەوە دێنە بەرچاوی:

- ئەوە دەروێش فەتـاحـی شەکـرە، ئەوە مەجیـدە کۆڵ و مەلاعومەرە، تەنها کەریم کۆیی‌یان لەتەك دا نی‌یە (ئاخر ئەو بە دوای کاری خۆیدا چوو، شاگردی مەلۆتکەکەی گۆرقەرەج بوو، ئەو لێرەنی‌یـە تەنها ئاوەکەی رشت و رۆشت.) ئەوەش مارفەو گوێم لە دەنگێتی‌و دەنگی لێ هەڵبـڕیـوەو (ئـەوەڵ سەحـەرە) دەچرێت، حەمەدیش هەر لێرە نی‌یە.)

چاو لەشـەبـەنگـەکـان ناتـرووکێنێ، لەتەك هەر یەکێکیان دا بیرەوەری‌یـەك بەرێ دەخـات: هەریـەکەو بەپێ‌ی هەڵویستی خۆی ماڵ دەنـاتەمست. لە عاست، لە عاست هەندێکیان دا ئازاری ویـژدان لێ‌ی وەگـاڵە دێـت، داوای برە ماڵێکیش لە هەندێکیان دەکات:

- ئێوە هەندێکتان رابەری منن، یان هیچ نەبێ لە لێلایی هزری ئێـوەوە پەیـجـووری دەروازەیـەکـی رۆشنم کردووە، بەلام ئەفسـووس ئێـوە مەرگەساتەکەتان بە چاوی خۆتان نەبینی، ئەگینـا ئەیـوەش من ئاسـا دەیـان گرێ کوێـرە لە قوولایی دەروونتان دا پەیدا دەبوو، من تووشم بوو بە تووشی رۆژێکەوە کە هەرچـرکەیەکی دەیان شەیتان و شەیتانۆکەی تیا لە دایك دەبـوو، بە چاوتـرووکانێکیش شەیتانەکان ئاووزێیان دەکردەو

هەریەکەیان دەبوو بە دۆزەخەوانێک ئا. ئا دۆزەخێکی یەکجار گەورە دروست کرا، لقیشی لێ بوو بۆوە لەهەموو شوێنێک

دۆزەخۆکەیەک هەبوو، دەڵێن چەند هەزار بە قەد ژمارەی پلساکەی خامورابی بۆ ئەوێنانە نێردرا بوون، ئیدی من بەمنی خۆمەوە نازانم دێنەوە یان نا!؟

ئێ من قەرزارو منە تباری ئێوەم ئەوەتا نیشانەو مۆری دەست و پەنجەتان هێشتا بەم تەپۆلکانەوە هەر ماون.

چەند جارێک بەکڕنووش دا دەچێت، کەسەر هەڵدەبڕێت دەبینێ چەشنی درەختی دوای خاکە لێوە ڕوخساری هەمە چەشنە سەر دەردێنن و بەنۆرە قسان دەکەن؛ هەر یەکەو بەجۆرێک دەناخاوێت: گازندە، ستایش، نالەرین، دەردەدڵو تەنیایی لە زاریان دەوەرێت: (بانگ هەڵدە، بەهەموو گەرووتەوە بانگ هەڵدەو هەرچی مرۆی ئەم دنیایەیە لە خۆتی گرد کەرەوە، کوان ئەوانەی تەمەنی جوانیان پێچایەوەو لەگەڵ کۆچ و کۆچباری غەریبیا دا کەوتنەرێ!؟ کوان ئەوانەی لە نێو ئەم تەپۆلکانەوە سەریان دەرێناو دوای کاروانی هات و نەهات کەوتن.. وەرن جارێکی دیش چاوتان بەگەردی ئەم هەوارە برێژن.)

هەست دەکات هەموو دەوروبەری سپی هەڵدەگەرێت، سپی هەوەک جۆری شیر تەنانەت تەپۆلکەکان و زەویو ئاسمانیش لەبەرچاوی سپی دەبن. لەم کاتەدا بە چوار دەوری خۆیدا دەڕوانێت و نیگای لە نێو دەریایەکی یەکجار سپیدا مەلە ـەکات. کە وەئاگا دێتەوە دەبینێ واپۆلەمەلێکی سپی لە ئاسمان دا چەشنی قەتارەی قولنگان بە دوای یەک دا هێندی هێندی باڵەکانیان لە هەوا دەسوون. جەستەی شەلاڵی عارەق دەبێت، هەست بەنیگەرانییەک دەکات. کەلابەلای تەپۆلکەکان دا دەکاتەوە دەبینێ یەکەیەکە لەبەر چاوی هەڵدەکشێن و بست بە بست بالا دەکەن. زەردەخەنەیەکی گەش لێوەکانی دەکشێنێو دەڵێت:

- تۆ بڵێیت ئێرەیان بیر نەچووبێتەوەو دڵیان دا بچلەکێو زوو بگەرێنەوە!؟

تێبینی/ئەم دەقەی کۆتایی ١٩٩٢دا لەیەکێ لە چالاکییەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی کەرکووک لەفێستیڤاڵی ئەم چیرۆکە خوێندرایەوە.

**کەلاریزانی/١٩٩١**

# جەگەر خوون و هۆزانەک

● حجی صبحی جعفر ●

سالا هزارو نەهسەدو دو سێ ئەز      هاتمە دونیایێ
بنالێ سولتان شێخ مویس ئەز      چووم ژدایێ[1]

جەگەر خوین وەکو ئەو بخۆ دبێژیت. (شێخ مویسە کوڕێ حەسەن)ە، نالێ دەیکا وی (عەیشانە)، ل سالا ١٩٠٣، ل گوندێ (حەسارێ) ژدەیک بویە[2]. پشتی ژیێ وی بویە ١٢ سال، ژدەست کورتیا خۆ بابێ وی مالا خۆ ژگوندێ حەسارێ بارکریەو چوویە (عامودە)، ل عامودە بابێ وی چووبە بەردلۆڤانیا خودێ[3]. ژبێ چارییو هەژاری، دبیتە شڤان، پاشی ل بەردەستێت مەلا دخوینیت و دبیتە فەقە. پشتی باوەرناما خاندنێ وەردگریت، مەلاتیێ ل گوندێت کوردان دکەت[4].

هێشتا موی ل سمبێلا نەهاتین، دەمارێت کوردینیێ لنک ڤەبینەو سینگێ خۆ ژخەمارا ڤەکریەو بارێ خۆ ژخەبات و بزاڤێ داگرتیەو ترارێ خۆ ل کانیکا مێرینییێو گەرناسیێو شەرەڤێ دایە[5].

جەگەر خوین کوردەک دلسۆزو نە ترس بویە، شەهرەزاییێ دەردێ میللەتێ خۆ بویە، هێژا (ئوسمان صەبری)، ل پێشەکیا دیوانا (سەورا ئازادی) دبێژیت: (ئەڤە بونە ٢٣ بیست و سێ سالێت بتێن، ئەز سەیدا جەگەر خوین دنیاسم، دڤێ نیاسینییدا، دوو تشتێت مەزن و بەرکەتی من لنک دیتن:

١ـ جەگەر خوین باش ب دەردێ میللەتی کورد کەتیەو زانییە لاوازیو لەنگی ل کیڤەیە.

٢ـ جەگەر خوین دکوردینیا خوەدا سینگا خوە ژزیڤارو بەلەنگازیارا ڤەکریەو کوردەک ڕاست و دروست بویە.

جەگەر خوین دڤەهاندنا هۆزاناداو بەرەڤاژیکرنا کاودانێت کوردی هۆزانڤانەک بێ بەڤل بویە، ددەمێ خۆدا سەرکێشی

هۆزانا کوردی بویە. هێژا تەما بوا دبێژیت: (جەگەرخوین، کو ناڤێ وی (شێخ مویس حسن)ە، ل سالا ١٩٠٣ ژدەیك بویە، نەهۆ سەرکێشێ دەستەکەکا هۆزانڤانێت کرمانجیا ژووری ب هەمی: باوەرییا خوڤاو دیوانا (سەورا ئازادی) دا دکەتە گازی، کو بابێ رزگاربوونێ ژلایێ ژووریڤە تێت، وی ژی تاما نەخوشیا ژگرتیخا نیت سوریایێ دیتیە[٦] هەرچەندە جەگەر خوین تاما گرتیخانا دیتیە، لێ چ جارا ژێ نەترسیایە، نوریدیخانێ جەلیل دبێژیت: (راستە جەگەرخوین گەلەك جارا دزیندانادا هاتیە

هەلاویستن، بەلێ چ جارا پەشیمان نەبویەو چ جارا ژی شەرم نەکریەکو تێکوشەرو پێشکەفتن خوازا[٧] هەتا ژیێ جەگەرخوین گەهشتیە(٨٠) سالا، هێشتا دەربەدەرو دووری نیشتمان دژیو ژنڤیسینا هۆزانێ ب دوور نەکەفتیە، دەنگێ وی بنڤیسین و تومارکرن و ب ستران و سروود دگەهتە دوورترین قولاچکا وەلاتی[٨].

ئەڤە مە گوتی، رێ خوشکرنەك بو، داکو پێنڤیسێ مە چەند گوتنا، ل سەر هۆزانا[سەرهاتیا جوان دەولەت] بکەن.

سەرهاتیا جوان دەولەت، هۆزانەکا پڕ خوەش و ژیهاتیە، کەفتیە ددیوانا ئێکی‌دا، یاکو سالا (١٩٤٥)، ل دیمەشقێ هاتیە چاپکرن، ئەڤ هۆزانە ژ(١٨١) مالکا پێکهاتیە. ب شێوێ چیروکی ڤەهاندیە، کو ب پەهلەوانەکێ کورد دەست پێ دکەت. مێرکێ چاك و ژیهاتیە، کەسێ بەرامبەری خۆ نابینیت، خەلك هەمی هزرا ژێ دکەن دبێژیت:

**ل شەری زینێ خورت و جوان بوم**
**چەلەنگ و سواربوم، خوەش پەهلەوان بوم**
**کێ ئەز دیتم ژمن دترسین**
**ناڤ و نیشانێم ژهەڤ دپرسین**

ڤێ مێرچاکیو سوارچاکێ (غرور) بۆ چێکر بو، گوە نەدا دەوروبەرێت خۆ هەتا هەمی تشتەك ژدەستا دچیت دبێژیت:

**ئەڤ ئێل و کۆچەر تەڤ من ب دەردان**
**خوورتیو دەولەت هەمی مە بەردان**

ل دەمەکی پەهلەوان خۆ بتنێ دبینیت، دبێژیت:

**هەمی پەریشان، مروڤ و پسمام**
**ئەڤئێل و دەولەت، بەس ئەز تنێ مام**

دەمێ پەهلەوان دزانین کو بێ بتنێ مایی، ژخەو هشیار دبیت و دزانیت، کو کریارێت بەرێ نەدباش بون دبێژیت

**هنگی جوان بوم، نەکر مە یا باش**
**دژوارو خوین خوار، مێکوژو قەللاش**
**ئەڤێ دلێ من، دلێ وەکی سەنگ**
**تشتەك نەدی بو بەس کوشتن و جەنگ**

پەهلەوانێ چیروکا جەگەرخوینی پەشیمانی ژینا بووری دبیت، بەرێ خۆ ددەتێ چ باشی بۆ وەلاتێ خۆ دگەنجی دا نەکریە، مللەت ژ بیرکربو، ئاگەهـ ژکەسێ نەبو، دەمێ خۆ هوسا دیتی، ل هەسپێ خۆ سواردبیت و بتنێ بێ هەڤال دکەفتە رێ کیڤە ؟ نزانیت.

**جارەك بتەنها ئەزێ سوار بوم**
**تفەنگ و شاش، ب کارو بارو بوم**
**جەلەو ب دەست من، ل هەسپێ سەرکەرم**
**داژوم ل هەر دەری، بێ ترس و بێ شەرم**

نەخوشترین دەم ئەو دەمە، دەمێ مروڤ بتنێ بیت و سەرگەردان بیت، دەمێ دەرکەهێت ژینێ ل بەر مروڤی دگرتی بن، دەمێ بێ هەڤال و هوکر بدەتە رێکێ، بێ هیڤی و داخواز، بێ ئارمانج و دوز بژیت.

**چەلەنگ و چالاك، کەرنەس و سەربلز**
**نە راڤ و نەنێچیر، نە دوزو نە داخواز**

هوسا بێ دوزو داخواز، ل دویڤ سەرێ خۆ دچیت، هەتا هند خۆ دبینیت کو بێ دنیڤەکا دەریایەکێ دا، ددەریا ژنێك ڤەدبیت

**قەسرەك سپی دناڤ دا خویا دبیت**
**من دی ژنشکاڤە قەسرەك خویابو**
**دەریا بێ گومان ژهەڤ بەلا بو**
**بلندو هاویر رەزو باخ**
**دبەردا رویبار دسەردا شاخ**
**دناڤ رەزاندا گولیلك و سورگول**
**ل سەر چیان تێ خوەش دەنگێ بولبول**

پەهلەوانێ مە ب دلێ خۆ، ل ناڤ باغ و بیستانێت قەسرێ تێت و دچیت، ژنویکا تێتە بیرێ، کا بۆچی کەسەك دناڤ ڤێ قەسرێ دا نینە ؟!

جوجی هو بێ دەنگە؟! ئایا بێ خودانە ؟!
دبێژیت:

**ئەڤ باخ و ئەڤ ڕەزڤەی بێ خو هدینە**
**ئەڤ خان و ئەیوان هێ من نە دینە**
**ملێ کو ئەز خوەش باخان ببینم**
**نە ڕوپەلێ ژینێ هویر بخوینم**
**بەلکی ل قەسرا بەلەک پەری زاد**
**نێچیر بکەم ئەز وەک مەم و فەرهاد**

هەرە هش و بیریت ژینێ پتر دکەت، پتر خۆ دادهێلتە دەریا مەینیا دبێژیت.

**هیدی زەمەسپی ئەز داکەتم خوار**
**بلند ل بەر من دەرگەه و دیوار**
**هوویر گرێ بەند، ئەڤ بەستەو زنجیر**
**تە دکو کەسێ لێ نە کریە نێچیر**

مەکو زەمەسپی تێتەخوار، دڤێت پتر دنەهێنیت قەسرێ دا شەهرەزابیت.
بەرەو دەرگەهێ قەسرێ دچیت، دەنگی خۆ بلند دکەت و دبێژیت

**دەنگێ خوە هەلدان ب قیرو هالان**
**ڤەی بێ خوەدی نە. ئەڤ خان و ئەیوان**

دگەل گازی کرنێ دا، دەرگەه بۆ ڤەدبیت دبێژیت

**من دی لەبەر من دەریک ڤەبو زوی**
**ئیردان ل من ڕەش چاڤ و ئەبروی**

وەسا دیارە ژنێ مالکا ڕووری کو با دەرگەه ڤەکری مییە ئانکو کچکەکە.

**ئەڤ کچکە تێتە بەرسڤا گازیێ و دبێژیت.**
**شەکر ژلێڤان بارێ ب نازی**
**کۆ هێ تۆ چ دکی؟ چ ژمن دخوازی؟**
**ئەڤ باخ و ئەڤ خان نەبێ خوەدینە**
**هێ کەسێ دخەونا خوە نەدینە**

**کچەک هندی هندا تێنی یە بۆ شەربەتا ئازادیێ و سەربەستیێ ناهێلیت کورک بەرسڤا وێ بدەت بەردەوام دبیت و نەهێنیت خۆ و قەسرێ ئێک ئێک بۆ ڤەدهێنیت دبێژیت**

**دیوێ سپی هێ دووە چوویە نێچیر**
**ل بەر مە دادان دەرگەه و زنجیر**
**ڕۆژینێ تە ماندە هێژێ دژینێ**
**کو ئەو تە ئەگری ل شانەشینێ**
**ژکۆ تۆ هاتی؟ ژتە دپرسم**

**کورک بەرسڤ کچکێ ددەت و دبێژیت**

**من گوت شیرین ژمن نە پرسە**
**دەردێ خۆ بێژە ژمن نە ترسە**
**ئەڤ ڕەنگێ ب کەنی و جوانی**
**چما بتەنها ل ڤر خویانی**
**ئاڵێ خۆ بێژە . چارەک ژبۆ من**
**بابێ تە کیبی . چ دوست و چ دوژمن**
**سوندا مە هەردوو چاڤێن بەلەک ڕەش**
**ئەز پەهلەوانم . نە دین و نە سەرخوەش**
**هەتا دبێژیت:**
**شەکرێ ژهەردوو لێڤیان بڕێژە**
**چ هات سەرێ تە ژمن ڕا بێژە**
**ئەبرووی شکاندن شیرین شەکر کەن**
**کەش بون ل بەر من . ئەو دیم و ئەو چەمن**

پاش ڤان پرس و پسیارا . کچێ دەستێ کورکی دگریت و دبەتە دقەسرێ ڤەو ژیهەل دچنە سەربانی ، ل حەم یەک دڕونین و دلێ خۆ بۆ یەک ڤەدکەن . دلێ کورکی پڕی ئەڤین بو ، ب دیتنا وێ پرتر لێ هات . دڤییا دەست ل ستوییێ وێ وەربنیت و ڕاموسانەکێ ژێ بستینیت . بەلێ هەی هات . (هەتا نەچینی ناهەلینی)!
کچکێ گوتی

**تاکو دیوێ سپی ئەکی مەند**
**نابێ بنوشی لێڤا شەکر خەند**
**کو بەس خوە بکرە . تۆ نەی دلۆڤان**
**کەچێ وەکو ناکری تۆ ئەرزان**
**ژکوشتێ من بلندە ئەڤ شاخ**
**ب هێستری من شین بونە ئەڤ باخ**

ژسەد هزار سەرا چێ بویە ئەڤ خان
هێ نوی تو ئیرو لێ بویە مێڤان
چارەک خوە بگرە دێوێ سپی بێ
کەر ئەز نە شاشم ئێ سێ سەری بێ
ئاشان بگێری ، سەران بهێری
چە نینە چارەک خوە لێ ڤەشێری
جهێ سەرێ تە مایە دخانێ
راست هاتنە ، ڤەی تو ژێرا ئانی
ل من وەکی تە پر بونە مێڤان
هێ کەسێ نە نوشیە شەربەت ژلێڤان
تو من دخوازی ، گران بهامە
مەگەر شەربخم ، ئەز ئەژدەهامە
هنگی کو دێوێ سپی وەسا ساخ
ژبو تە نابن نە ئەز ، نە ئەڤ باخ

پاش ڤان گوتنا ، کچک تێنە سەر هندێ ، کا بوچی بتنێیە !! دبێژیت :

دێ بام رویمەت بلندو سەربەست
برا مە چاربون ، هەر چار ژێ بن دەست
دەرویش و بابیلوز ، گەردوو رەنجبەر
خوەزی نەبونا هەر چار خوەلی سەر
پسمامێ من هەبو (جوان مێر)
بچویکێ سیوی ، چەلەنگ بو ، وەک شێر
برایێ دەرویش رما خوە بەردا
تور دا ملێ خوە ، پارسەک ل گوندا
کو ، من نەڤێت ئەڤ ، تاج و دەولەت
نە ئێل ، نە پسمام ، نە ناڤ ، نە رویمەت
بلا خوە وی تەڤ فروتە دوژمن
دوژمن ژینڤە چاڤێ خوە دا من

نەڤە سەرو بەرێ برایێ (دەرویش) بو، کو دبێژیت ، من چ نەڤێت و بن دەستی خوەشترە ، لێ دا بەرێ خو بدەینە برایێ «بابیلوز» کا بو وی چ دبێژیت :

برایێ «بابیلوز» ب توللەو بازی
رویمەت ناڤێ وی پەران دخوازی
خوە دایە دوژمن ب کولەداری
ل وی هەرو سەد تف دباری

برایێ «بابیلوز» خو فروتیە ، بەلێ کا برایێ «گەردو» چەوانەو چی دکەت :

برایێ گەردو بێ بەخت و مێرکوژ
تالان کەرو بێ خواس و خوین مژ
تەڤ دانە دوژمن ئەڤ گوندو بازار
هێژی وەکو گوند ب ڤیرو هاوار

برایێ «گردو» ژبلی مێرکوشتن و بێ بەختیێ پێڤە ، چیتر نزانیت ، بەلێ دا بچینە جەم برایێ «رەنجبەر» ، کا ل سەرو چ دبێژیت :

برایێ رەنجبەر، بچویک و بێزار
خەبات ل سەر روی کارکەرو جوتکار
سەدان، هزاران سال مایە بن دەست
گەردەن شکەستیو وندان سەرمەست
هەر سێ بران ژی دەست ودانە دوژمن
دبەرپیا چوو ئەو هاتە کوشتن
پسمامێ سیوی، نزانم کو چوو کو؟
کەس مە نینە کی دێ هەری دو؟
هەر سێ براینت بێ بەخت و بێکێر
ئەز دامە دوژمن بو هنک زێر
دوژمن ب خورتی ئەز بو خوە ئانیم
دێوێ سپی ئەز دڤردا دانیم

کچکێ ئەڤ چیروکە هەمی بو کورکی ڤەهاندو نەدزانی، کو کورک کیەو کی نینە؟!! هەتا کورکی خو پێدا نیاسین و گوتی:

منکو، نە ترسە، ئەز (جوان مێرم)
نە هرچ و هوڤم، بەلێ ئەز شێرم
سەد سویندو پەیمان، ب هەردوو چاڤان
نێچیر بکم ئەز لڤان گراڤان
هەتا کو دێوی سپی بینم
سەرێ وی ژێکەم بو تە بینم

سەرێ وی بیخم دیوارێ خانی
ئیدی تە بگرم ب سەرگرانی

-مێ کهکێ کوهـ ل گوتنێت جوامـێری بوبو زانی پشمامێ
وێیە، تیکەمشت، کو مێشتا کەنج وخوین گەرمە، لەوما گوتێ:

سەرێ خوه راکر وێ شەنگەدارێ
مێستر ژ چاڤان زوی هاته خوارێ
گوٚ. نا نه راسته تنێ هەری وی
ترسم بمینم بێ ئاهـ و سیوی
نا قەنج ئەڤه کو بیسلن هەرێ مال
هشیار بکی وان پسمامێ مرداڵ
بگەل خوه راکەی پر کوٚم و لەشکەر
ب توپ و تفنگ، فروٚک و خەنجەر
نێش بکی سەر ڤی دێوی دوژمن
سەرێ وی ژێکەن، پاشی وەرن من

(جوان مێر) بەرسڤا دوتمامێ ددەن و دبێژتێ:

سەرێ خوه راکر، من گوتێ دوتمام
بزوار هشیار بن، ئەڤ ڤلسه پسمام

بگەل هندێ، کو جوامێری باوەرییەکا موکم هەیە بەبێ زاخییا پسمامێت خوٚ، کو دهاوارو گازییت «جوان دەولەتێ» ناهێن، بەلێ سەر خاترا دوتمامێ، دژڤرینه وەلاتێ ... انك پسماما، جارا تێکێ دچیته نك «دەرویش» و دبێژیتێ:

عاتم ژرێڤه، من گوته دەرویش
رابه توٚ پسمام، دا ئەم هەرن پێش
گوٚ، مه ناڤێتن، ئەڤ باخ و دەولەت
ژ بل خودێ ڤەت. مه ناڤێ رویەت
بێ ئەز نه کوردم تنێ مسلمان
نابم هەڤالێ شڤان و گاڤان

دەرویش ژکرتنا خوٚ نامێته خوارو نامێته گومورین. سەرێ وی بەڤه، وەکو کولوخێ کەری، (جوان دەولەتێ)، چ ل سەر گوتبو، هەمی راست بون. (جـوان مێر) ژ دەرویش بێ هیڤی دبیت، دچیته نك «بایلوز» دبێژیت.

رابوم ژ جەم وی کهامه بایلوز
پسمام توٚ چ دکی؟ روژاته پیروز
پشتا خوه دامن سەرێ وی بەرژێر
کەنی و گوٚ. ئەز بوم خوه دێ زێر
گەر هەبم زێر، چ بکم ب خونکار

ناڤێ مه تلجا شاهێ ستەمبار
ب دەستێ دوژمن گرتن مه ئاڤ زێر
دەولەت مه ناڤێ هەره جوان مێر

ئەڤی ژی ژبەر پارا ئاگەهـ ژبابێ ڤەلەکێ نینه. خاینێ مەزن، ل چەرخێ هەڤدێ دەستێ خوٚ داتایه سەر ڤی دەردێ گران دەمێ دبێژیت:

یەعنی ژڤه مع دراف و دینار
هەر یەك ژمەرا وەبونه دلدار[١٠]

جوامێر ژڤێ ژی بێ هیڤی دبیت، رابو چوو نك «گەردو» دبێژیت:

رابوم ژجەم وی گەهامه گەردوٚ
من ل وی کر چ دکی توٚ کوردوٚ
گوٚ، ئەز خوەدێ گوند. ئەز خوەدێ تەراکتور
گرت مه تەڤ ئەڤ ب کوتەك و زوٚر
من گوٚ، وەلاتێ ته ستەمبار
ئیرو ب جارەك بن دەستێ نەیار
دەستێ خوه پاڤێن دارێ تفەنگێ
بکەن ب وی را دو وباره جەنگێ

گوٚ:

گوندی ل بەر من بێ چەك ، پەریشان
هەمی لجەم من شڤان و گاڤان
کی بیٚو بکری خلکێ ستەمبار
کولا من ئەڤ کوندو دینار

گەردوٚ ژی ژبـەر پاراو گونـداو طەمـەعێ نەهـاته سەر ریکا سەربلندیێ ، وی ژی چ زاخ نەبو ، لەوما جوان مێر هاته نك برایێ بچوك ، دبێژیت :

ژ جەم وی رابوم کهامه رەنجبەر
هوٚف و نەزانه . سەرێ وی وەك بەر
چ ڤلس مه گوتێ ، نەرمنگ . نه کوتن
جەرگ و دل و ناڤ . ل من سوتن

رەنجبەر دکەڤته بن کارتێکرنا ئاخفتنا جوامێری ، نەچار دبیت دئاخڤیت دبێژیت:

هەر سێ برایێن بێ بەخت و خوین خوار
وان ئەز فروتم ، ب زێرو دولار
بێ ئاللم ئەز دمن نەمایە تێ
بن دەستێ دوژمن ئەز مامە وەك دین
سوژا مە ئەڤ بێ ، ب هەڤ را رابن
لێ ئەم نە یارێ هەر سێ برا بن
وان فروتن دەولەت خوەا مە
بێن ژدەست ڤلن جارەك گها مە
دەولەت ژبۆ تە ، رویمەت ژبۆ من
رابە بەهەڤ را ، ئەم هەرن دوژ من
دەستێ خوە دا من ئەم ئەڤ را رابون
مرکێن ل وە دەولەت و رەنجبەر شیاربون

هوسا جەگەرخون هۆزانا خوە ب دوماهی تینیت ، رەنجەرو جوان مێرو دەولەت بوتە ئێك و ژخەوا گران هیشار بون و کەتنە سەر رێکا ئازادیێ و خەباتێ. هەکە جارەکا دی، ل ڤێ هۆزانێ بزڤرین و بەرێ خۆ بدەینێ ، دێ بینین هۆزانەکا چیروکی یە ، ئانکو شێوێ چیڤا نوکێ وەرگرتیە ژلایێ روخساری ڤە، جەگەرخون قالبەکێ دروستێ چیڤانوکێ کوردی ئینایەو بیرو باوەریێت خۆ دارشتینێ. ئانکو بیرو باوەرەك پێشکەڤتی ئێخستیە قالبێ چیڤانوکا کوردی ـ بڤێ چەندێ هۆزانا خۆ ئێخستیە بن بەرێ هۆزانا رومانتیکی ـ چونکی خەیال ل سەر هۆزانێ زال بویە و خۆ کریە کە ڤلوژانك بۆ گوتنێت رومانتیکی. بڤی هزرێ چی هۆزانا دکراسێ خەیالێ دا بنڤیت، دێ چیتە رێزا هوزانا رومانتیك. شاعیرێ ئینگلیزی شیلی ١٧٩٢ ـ ١٨٢٢ دبێژیت:

(خەیال شەنگەستێ رومانسیەتێیە). ژبەر هندێ کو خەیال دڤێ هوزانێ دا زال بویە ئەم دکارین بێژین هوزانەك رومانتیکیە. ئەڤ رەنگی هوزانێ دناڤبەینا جەنگا جیهانا ئێکێو دوویێدا دئەدەبێ کوردیدا پەیدا بویە [١٢] هەرچەندە ئەڤ رەنگێ هوزانێ رەڤینە ژراستیێ، لێ بشیعرا رومانتیکیا کوردی، وەکو یا فرنسی ، کراسەك دی ل بەرخۆ کریە، ئەو ژی کراسێ نیشتمان پەروەریێەو هەلرکیا حوکمێ زالم و بێ بەخت کریەو ب رەخ جوتیارڤە راوەستایە.

زمانێ ڤێ هۆزانێ، پەیڤێت سادەو پر مەعنانە، هەر ئێك کەڤتیە دجهێ خۆدا. ئەڤ پەیڤێت جەگەر خوین بکار ئینایێن، وەسا بکار ئینایینە، کو هەمی خاسیەتێت وێ تشتی دیار بکەن یێ کو بڤێت ل سەر باخڤیت. گەلەك جاران پەیڤێت وی بخۆ د ئاخڤن وەکو دبێژیت، (پشتا خوە دا من، سەرێ وێ بەرژێر) ئەڤ رستە وەسا دیاردکەت، کو مروڤەك هەژیو ژێهاتی نینە... ئانکو ئەڤ رستە (رەمزە) بۆ مروڤەکێ ترسینوك و نەباش. یان بکار ئینانا ناڤێ (دێوێ سپی) ، بتنێ (رەمز) نینە بۆ دێوێ سپی، کو بنیاسین، بەلکو ڤی رەهێن سحری هەنە، رەنگێ وی، زولما وی، کرێتیا وی.. هەمی تێنە پێش چاڤێن خوێندەڤانا. هوسا جگەر خوین معاملا رامانێ دگەل زمانی دکەت. جەگەر خوین) خۆ ژئێد بوم و تشبیهاتێت کلەسیکی رزگار کریە بۆ نمونە: لێڤێت یارا خۆ ب بشکوژا گولێ تشبیە نەکریە، وەکو شاعرێت لکلاسیکی، بەلکو جوانیا لێڤێت وێ دیاردبن، دەمێ دکەنە کەنی، جوانیا برویێ وێ ب جوانیا هەیڤا ئێك شەڤ ناچیت، بەلکو جوانیا وان دیار دبیت، دەمێ دلڤینیت و سەر نەڤرازو سەر نشیڤ دکەن... هەمی گاڤا جەگەر خوین بزاڤێ دکەن، کو

خۆ نێزیکی فولکوری بکەت. پەڤن و گوتن و چیڤا نوکا بکاربینیت. ب ناویەکێ روژنامەگەری، بپەوەزێت خۆ دگەهینیتە خوێندەڤانی. هەروەسا ب شێوێ گفتوگویا ، بگرەو فەکێشێ دهوزانا خۆدا بکار ئینایە...

وێنێت جەگەر خوین بکار ئینایێن ، دساخ و پر بزاڤن ، بۆ نمونە ، وێنێ بۆ کولەدارا کێشایی دقالبێ (دێوێ سپی)دا ، جوانترین وێنەیە بۆ زولم و زوریێ ، چونکی ئەڤ وێنە (رەمزەکە) بۆ هەمی رەنگێت زوریێ . ئەڤ هوزانە ب ئاوازێ فولکوری هاتیە دارشتن ، ئانکو ل سەر (دە) کەرتێن چوویە ، کو کێشەکا رەسەنە دفولکورێ کوردی دا [١٤].

بۆ سەروا هوزانا خۆ، جووتە قافیە بکارئینایە، وەکو مەم وزینا خانی چونکی هوزانا جەگەر خوینی ب چیروکا شیعرێ ڤە دچیت بتنێ جارەکێ ژڤێ رێبازێ لادایە، بۆ مەخسە دەکا خۆ... ب گشتی ئەم دکارین بێژین:

١ـ هەرچەندە جەگەر خوین، خۆ ژسەروا کلاسیکی رزگار نەکریە لێ شورشەك ئێخستیە دناڤ هوزانا خۆدا ئانکو تازە کرنەك ب سەردا ئینایە، ژلایێ ناڤەروك و روخساری ڤە.....

٢ـ جەگەر خوین، دگەل هندێ دا نەبویە، کو باوەرییێت موسلمانەتیێ ـ دێ کارن خزمەتا بزاڤا رزگاری خوازا کوردی کەت.

٣ـ جەگەر خوین، ل سەر زمانێ پەهلەوانێت شعرا خۆ، شیایە مەخسەدا خۆ بۆ خەلکی دیار بکەت ئانکو هۆزانا وی ئارمانج منکالتی یە.

٤ـ بێ شیای هەمی پەهلەوانێت هۆزانا خۆ هەر ئێکی ب رێکەکێ ڤە پاژوت و بلڤییت ئەڤە ژی ب هاریکاریا فولکوری ڤە جویە

٥ـ دلێ هۆزانێ دا هیڤی و داخوزێت خەلکی دەربرینە شیایە بچیتە دناڤ خەلکی دا و ل دویڤ زەوقێ وان بچیت

٦ـ وێنەک راست و دروست ژژیانا مللەتێ کورد گرتیە وزال بویە ـ سەر عاطفێ ـ سوز ـ

٧ـ وێنێت لاوازو دەری دناڤ هۆزانێ دا ناهێنە دیتن...

٨ـ هندی شیایە (توظیف) چیڤانوکا کوردی کریە

٩ـ چارەسەریا جەگەر خوین) بۆ دەردێ مللەتێ خۆ دیتی بتنێ ئێکرتنە ئێکگرتن کیلیلا هەمی سەرکەفتنانە.

١٠ـ عنصرێ (مفاجاتا) هێزەک دی ل ه[illegible]ێ زێدەکریە

**هندەک تێبینی و رەخنە**

١ـ خویشک کریە (رمز) بۆ وەلاتی ئەڤ بۆ چوونە، یا راست نەبویە چونکی دایک وەلاتە دناڤ هەمی خەلکی دا عەردێ پیروزە. عەرد ژی دایکە و هەمی خاسیەتێت ژینێ دعەردی دانە[15]

٢ـ پەهلەوانێت (سلبی) ژێیت (ئیجابی) پتر بوینە ئەڤەژی رێکا رزگار کرنێ پتر ئاسایێ دکەت و خەلکی بێ زار دکەت.

٣ـ (جوان مێر) هەر بێ ساخ بویە لێ نزا چەوا چارەکێ ب زاردەڤێ (جوان دەولەتێ) دابو کوشتن.

٤ـ شعرا خۆ ب لەز ب دوماهی ئینایە، ئانکو ب رەنگەکێ (منطقي) ب دووماهی نە ئینایە.

٥ـ دروستکرنا چیایی ب گوشتێ (جوان دەولەتێ).. یا ژمن ڤە وێنەک ب هێز نینە چونکە گوشت زویکا دریزیت و تەیرو درندە دخون هەکە ب هەستیکا دروستکربایە دا ب هێزتربیت، چونکی هەستی دبیتە ئاخ ئاخ ژی پیروزە....

**ژێدەر**


١ـ دیوانا ئێکێ ـ تێکستا (بونا من) ١٩٤٥ چاپخانا تەرەقی دیمەشق.

٢ـ پێشەکیا دیوانا (سەوزو ئازادی) ژ نڤیسینا هێژا (ئوسمان صبری)

٣ـ دیوانا ئێکێ هەمان ژێدە ...

٤ـ هاوکاری ژمارە (٧١٠)، ١٩٨٣/١١/٣ د. عزالدین مستەفا رەسوول

٥ـ هاوکاری هەمان ژێدەر

٦ـ مع الاکراد، توما بوا ترجمة ئاواز زەنگەنە.....

٧ـ هاوکاری ژمارە (٧١١) ١٩٨٣/١١/٢٠ د. عزالدین

٨ـ هاوکاری ژمارە (٧٠٦) ١٩٨٣/١٠/٦ د. عزالدین

٩ـ دیوانا ئێکی هەمان ژێدەر....

١٠ـ مەم و زین هەولێر ١٩٦٨ ل٣٧

١١ـ البحث عن مفنى، دراسات نقديه دكتور عبد الواحد لؤلؤة ط ٢ ١٩٨٣ ل٣٥.....

١٢ـ گۆڤاری کولیجی ئەدەبیات زانستگا بەغدا ژمارە (١٥) سالا ١٩٧١ ـ ١٩٧٢ د. معروف خزنەدار.

١٣ـ الخلاصة في مذاهب الادب الغربي تاليف د. علي جواد الطاهر موسوعه صيفره ژمارە (١٢١) ل ٢٢

١٤ـ کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا لیفراد ١٩٦٢ ل ٣٢ د معروف خزنەدار

١٥ـ الصورة في الشعر العربي درسات في اصولها و تطورها د: علي البطل ط ٢ ل ٤٢ بیروت ١٩٨١.


**تێبینی**

سالا (١٩٨٦) چەند ڤەکولین
ژلایێ ئێکەتیا نڤیسەرێت دهوکێ،
ل سەر (جەگەر خوین) هاتبون پێشکێش کرن ،
ئەڤ نڤیسینە ژی ژوان بو.

# لامارتین

فەرهاد پیرباڵ

شەش حەوت مانگ بوو بەدووای کاردا دەگەرام. رۆژێکیان، کە ئیدی تەنیا بیست فرەنکم لە باخەڵ مابوو، چوومە ئاژانسی A.N.P.E وتم بەڵکو کارێکم دەست دەکەوێت و پێی دەژیم..

لە سالۆنی ئاژانسەکەدا، لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی دیکەش: فەرەنسی غەیرە فەرەنسی؛ کچ، کور، سپی، رەش سوور.. دانیشتبووین و چاوەرێیان دەکرد. دووای نزیکەی سەعاتێك چاوەروانی، کاتێ نۆرەی من هات، چوومە ژوورەوە. لەودیو مێزەکەوە، ژنێك دانیشتبوو، وتی:

فەرموو!

لەسەر کورسیەکە دانیشتم. ناسنامەکەی خۆمم پێی نیشان دا

وتم:

- بێکارم. هاتووم بەدووای کاردا دەگەرێم.

ناسنامەکەی لێوەرگرتم و تەماشایەکی کرد، وتی:

- شارەزاییت لە چ بوارێکدا هەیە؟

وتم:

- لەبارەی قافیە.

ژنەکە کەمێك داما، بێدەنگ بوو، پاشان وتی:

- قافیەی چی.

- قافیەی شیعر.

وتم:

سەری بەرزکردەوە، تەماشای تۆپەڵە-هەورێکی ناو ژوورەکەی کرد، وتی:

تۆ چیت خوێندووە؟

وتم:

- دکتۆرام هەیە لەبارەی قافیە لە شیعرەکانی لامارتین دا.

وتی: دەتەوێ چ کارێك بکەی؟

وتم: هەر کارێك بێ کە بتوانم پێی بژیم.

وابزانم ژنەکە بەم قسەیەی من تووڕە بوو، یەکسەر وتی:

- ئێمە ناتوانین بەم شێوەیە کار بۆ خەڵکی بێکار بدۆزینەوە.

سەرم سوڕما، وتم:

- بۆچی؟

وتی:

- هەر بێکارێك کە دێتە ئەم ئاژانسەو بەدووای کاردا دەگەڕێ، پێویستە شارەزایی لە بوارێك یان لە کارێکدا هەبێ!

منیش تەنگاو بووم، وتم:

- ئێ خانم، منیش، وەکو پێم وتی: شارەزاییەکی فراوانم لەبارەی قافیە هەیە، چوار ساڵی رەبەقە هەر خەریکی خوێندن و لێکۆڵینەوە قافیەم. تاکو ئێستا چەندین وتاریشم لەبارەی ئەم مەسەلەیە بڵاوکردۆتەوە.

ژنەکە ماوەیەك بێدەنگ ما، پاشان وتی:
- تۆ پێشتر هیچ کارێکت کردووە؟
ئەم پرسیارە کەمێك نیگەرانی کردم، بەڵام نەم هێشت هیچ شتێك بە روخسارمەوە دیار بێ، وتم:
- ئەی چۆن، خانم!
وتی:
- چی وتم:
- خانم، من بەدرێژایی تەمەنی گەنجیم، وا بۆ نزیکەی پازدەساڵ دەچێ شیعر دەنووسم. ئەزموونێکی فراوانم لەبارەی شیعر نووسین هەیە. هەر بۆیەش قافیەم لە شیعرەکانی لامارتین بۆ نامەی دکتۆراکەم هەڵبژارد.
وتی:
- کەواتە تایبەتمەندیت لە بارەی «قافیە» وەرگرتووە!
وتم:
- بەڵێ، خانم... قافیە لە شیعرەکانی لامارتین دا.
لەو دەمەدا پشیلەیەك هاتە سەر مێزەکە. ژنەکە تەماشایەکی کردم، وتی:
- بە پشیلە ئیزعاج نابی؟
تەماشایەکی پشیلەکەم کرد، وتم:
- بەهیچ شێوەیەك.
ژنەکە گوڵێکی لە چەکمەجەی مێزەکە دەرهێنا، بەئەسپاییەوە بۆنی کرد، ئنجا بەکاوەخۆ وتی:
- باشە! ئێمە، لقێکی ئاژانسەکەمان شیعر دەکڕێت و دەفرۆشێتەوە؛ بەڵام...
- بەڵام چی، خانم؟
- ئێمە بۆ ئەم جۆرە کارە چەند مەرجێکمان هەن.
- مەرجەکان چین، خانم؟
ژنەکە دەستی بە کلکی پشیلەکەدا دەهێناو تەماشای کاغەزێکی بەردەم و خۆی دەکرد. وتی:
- پێش هەموو شتێك پێویستە ئێمە پشیلەکان بخوێنینەوە!-
- مەبەستت شیعرەکانە؟
- بەڵێ. دەبێ بە دڵمان بن. مەرجی دووەمیش ئەوەیە کە لەسەرەتادا، واتە لەرۆژی سپاردنی شیعرەکانت بە ئاژانسەکەمان، پێویستە سێزدە هەزار فرەنك بنوێنی.

- ئەمە بۆچی، خانم؟
- چونکە لە حاڵەتێکدا ئەگەر شیعرەکانت بەدڵی لیژنەکە نەبوو، ئەوا نیوەی ئەو پارەیەت لێ دەگێڕنەوە.
- ئەی ئەگەر بەدڵتان بوو؟
- بێگومان لێت دەکڕن.
- کیلۆی بەچەند؟
- ئێمەی بەکیلۆ نایکڕین. دانە دانە شیعری کلاسیك: پێنج سەد فرەنك، شیعری ئازاد: سێ سەد فرەنك پەخشانە شیعر: سەدو پەنجا فرەنك، چوارین و پێنج خشتەکی و ئەم جۆرە شیعرانەش: سەد فرەنك:
- ئەی مەرجەکانی دیکە چین؟
- ئێمەی لیژنەیەکمان هەیە کە ساڵی جارێك دادەنیشێ، شیعری شاعیران هەڵدەبژێرێ... وەڵامی رازی بوون و نەبوونیش، هەمیشە دووای هەشت مانگانە بۆ شاعیرەکە دەنێردرێتەوە.
چونکە هەموو ساڵێك خەڵکانێکی یەکجار زۆر شیعری خۆیان بۆ فرۆشتن پێشکەش بەم ئاژانسەی ئێمە دەکەن.
- سوپاس.
ئەمەم بە ژنەکە وت و، بێدەنگ، هەڵسام رۆیشتم.
دەستم لەناو گیرفانی پاڵتۆ، غەمگین، بەدەم پیاسەوە، گەیشتمە سەر شەقامی (سانت ژێرمەن دێ پڕێ). لەوێ، لە مەیدانێکی بچکۆلەدا، لەتەنیشت گیووسکێك، لەو شوێنەی کە پەیکەرێکی لامارتینی لێیە، چووم راوەستام. کەمێك دوور لە پەیکەرەکەوە، وەك ئەوەی ئەمە یەکەمین جار بێ کە تەماشای ئەو پەیکەرەی لامارتین بکەم، کەوتمە ووردبوونەوە لەو پەیکەرە بەرزو شکۆمەندەی لامارتین:
بەجلوبەرگێکی رێکپۆش و کەش و شاهانەوە، دانیشتبوو؛ دەستی راستی لەسەر چۆکی خۆی دانابوو، دەستی چەپیشی بەرز کردبۆوەو پەنجەی بۆ (ئاسمان) درێژ کردبوو، وەك ئەوەی لە حاڵەتی خوێندنەوەی شیعرێکی بێت. پاشان چووم بەماندوویی و دڵپڕییەوە لەژێر پەیکەرەکەیدا دانیشتم.
هەرکە دانیشتم و دانەنیشتم، لامارتین، لەپشتەوە، بەدەنگێکی بەرز،- دیاربوو دەیویست دڵم بداتەوە- وتی:
- نیگەران مەبە!
منیش دانەوشتابوومەوە، بێ ئەوەی سەرم بەرزبکەمەوە،

لەبەرخۆمەوە وتم :
- چۆن نیگەران نەبم؟
لامارتین، لەپشت سەرمەوە، بەدەنگێکی ماندوو و خەفەتناکەوە وتی :
- ئەوەیە ئیتر. . !
سەرم بەرزکردەوە، رووەو هاتوچۆی ئوتومبیلە ڕاکردووەکانی سەر شەقام، وەك ئەوەی بەمەوێ کە تەنیا خۆم بلەوێنم :
- من ئەگەر سێزدە هەزار فرەنکم هەبوایە و بمتوانیایە تاکو هەشت مانگی دیکە چاوەڕێ بکەم، بۆچی دەچوومە لایان؟ چ حەوجەیم بەکار هەبوو؟
لامارتین یەکسەڵەف وتی :
- تۆ لەسەرەتاوە نەدەبووایە چارەنووسی خۆت بدەیتە دەست شیعر و جوانی و نووسینەوە!
کە ئەم قسەیەم لە لامارتین بیست، یەکسەر ئاوڕێکم لێی دایەوە، وتم :
- ئەی تۆ، تۆ بۆچی چارەنــووسی خۆت دایە دەست شیعـــرو جوانی و نووسینەوە؟
بەتوورەییەوە وتی :
- من کەر بووم.
بێدەنگ، هیچ وەڵامم نەدایەوە. دەمزانی کە لامارتینیش وەك من دڵی پڕە، پێویستی بەوە هەیە کە خۆی تاوانبار بکات و خۆی تێك بشکێنێ : بۆ ئەوەی هیچ نەبێ دڵی کەمێك ئارام بگرێ.
ڕووم کردەوە سەر شەقامەکە، وتم :
- بەڕاستی ئێــمەو مانــان، ئێمەی هونەرمەندو شاعیران جێگای بەزەیین! زۆر جاران هەست دەکەم کە شەیتانێك، هەر لە ئەزەلەوە ئێمەی بە بەدبەختی فرچك داوە.
بەنیگارییەکی قووڵەوە، نائارام، چاوم بەملاو بەولای خۆمدا دەگێڕا. هەستم دەکرد دڵم، ڕۆحم، ئەژنۆکانم دەلەرزین.
پاشان بەدەنگێکی زەبوون، بەڵام بەرز- بۆ ئەوەی کە لامارتین گوێی لێم بێت -، وتم :
- ببـورە، مسیۆ لامـارتـین. . دەتـوانی بۆ چەنـد ڕۆژێك سەد فرەنکێکم بەقەرزز بدەیتێ؟
چاوم لەبەر خۆم نابوو. چاوەڕێی وەڵام بووم، بەڵام هیچم نەبیست.

پاشان ئاوڕێکم بۆ دوواوە دایەوە، دیتم لامارتین لەوێ نەمابوو. تەمـــاشـــای لای چەپی خۆمم کرد، دیتم لامـــارتـــین لەولاوە قاپووتەکەی بەسەر شانی خۆی داداوە و دەڕوا. بە دوای کەوتم. یەك دوو جاران بانگم کرد: «مسیۆ لامــارتــین»! لەبــەردەم قاوەخانەکەدا ڕاوەستا. پەلە دیاربوو. وتم :
- دەڕۆی؟

وتی :
- ئا، درەنگە. دەبێ بچمە سەر کار.
وتم :
- لە کوێ کار دەکەی؟
وتی :
- لە هوتێلێك.
وتم :
- بە شەوان؟
وتی :
- ئا. حەرەسم. شەوان پاسەوانیی هوتێلێك دەکەم.
دەمویست لێی بپرسم بزانم شەوی بەچەند کاردەکا، بەڵام لەبەر ئەوەی دەمزانی کە پەلەیەتی و دەیەوێ بەپەلە بگاتە مێترۆ بۆ سەر کارەکەی، لێم پرسی وتم :
- ناتوانی لای خۆتەوە لەم لاو لەولا بۆم بپرسی، بەڵکو کارێکم بۆ بدۆزیتەوە!
وتی :
- تۆ خۆشت دەزانی، منی تەنیا و غەریب لە پاریس کەس ناناسم.
بەڵام لەگەڵ ئەوەش، بزانم بۆت دەپرسم. جارێ بەدوعا. دەبێ بگەمە سەر کارەکەم.
لامـــارتـــین کە بەجێمی هێشت، بەدەم ڕێگـــاوە ئاوڕێکی بەپەلەی لێم دایەوە، وتی :
- ئەگــەر هاتی سەرم لێبدەی: لە نزیك مەیترۆی (کـادێ)، شەقامی (تەیفۆ)، ژمارە (٧)، هوتێل (پرییا).
لامـــارتـــین، مانـــدوو، بەرەو مێترۆ ڕایدەکـــرد؛ هەنگاوەکانیشی جار بەجار ئاوڕیان لە شوێن پەیکەرەکەی خۆی دەدایەوە و هوّن دەگریان.

# سەربهووردی ناوێك

حمە كەریم عارف

خویش سەیرە! هەر لە دایك بوونەوە پێتەوە دەلكێو لە گەڵت دا ـی. ئەویش وەكو زۆر شتی دی بە خۆت هەڵی نابژێری. وەكو سێـبەر بە دواتـە وەیـەو كەم رێدەكەوێ لێت ببێ بە بارێكی قورس. وەكو چۆن بیر لە سێبەری خۆ ناكەیەوە بەو جۆرەش بە ـكەمێ هەڵدەكەوێ بیر لە ناوی خۆ بكەیەوە،

ـەگەر سەریە شەیەكت بۆ بخولقێنێ!

تەمـەنـم پازدە ساڵ بووە پۆلی سێی ناوەنـدی بووم. رۆژێ ـمـوستـای وەرزش ناوی دەخـوێنـدینـەوە... ئـەو رۆژە بۆ یەكەمجار بیرم لە ناوی خۆ كردەوە...

ـمـوستـای وەرزشم خۆش دەویست. هەستم دەكرد ئەویش ـمی خۆش دەویست. جارێك یاری دوو گۆڵی پێدەكردین. من ـەوەندە كەیفم بە وەرزش نەدەهات. خۆ ئەگەر خۆشەویستی ـمـوستـا لطیف عبـد الرحمـان نەبوایە. هەموو جارێ خۆم ـدزیـەوە... تۆزێ رێـوەڵەو كەم جورم بووم. لە گەرمـەی ـیریـدا بووین، تۆپـەكەم دایە بەر، نزیكی گۆڵی تیپی رەقیب ـوومەوە، خۆم تەواو ئامادە كرد بۆ لێدانی تۆپەكەو گۆڵ كردن. ـمەد دێو، لەبەر زەلامیو كەتەیی پێمان دەگوت مەد دێو... خۆی گەیـاندێ، لاقی دایە بەر لاقم، بەپشتا كەوتم، لە گەڵ كەوتنا ـووكی پێم بەر تۆپـەكە كەوت، تۆپ بەرز بۆوە. زیاتر فشاری مەد دێو بەرزی كردەوە، بەنزمی‌یەوە بەسەر گۆڵەكەدا رۆیی. ـەمزەندەی خۆم ـ ئێستاشی لە گەڵ دابێ ـ گۆڵ نەبوو. كە چی ماموستا لەتیف لە مەد تورە بوو. گۆڵەكەی بەگۆڵ حسێبكرد. ـەو پۆلەی قوتـابی‌یەكان دادی نەدا، گۆڵەكەم كرا بەگۆڵی ـستی. ماموستا ناوی دەخوێندینەوە

ـ ئەوزاد حسین

ـ بەلێ.

ـ شێرزاد حەسەن

ـ بەلێ

ـ مهدی حبیب

هەستامە سەرپێ، ئەزوویەكم پێدا هات، وەك بلێی.

شتێك زمانی بەستم. بۆ یەكەمجار هەستم بە جۆرە نەبانی‌یەك لە ناوەكەی خۆم كرد. دوو دڵ و سەراسیمە بە شەرمزمیەوە گوتم:

ـ بە...لێ.

هەندێ لە قوتابی‌یەكان پێكەنین. سوور هەڵگەرام.

لە فكران را چووم: «رەنگە گاڵتەیان بە ناوەكەم بێ، بە ناوێكی دێهاتیانەی بزانن.. رەنگە واش نەبێ..»

پاش بیر كردنـەوەیـەكی زۆر، بڕیارم دا هەركە چوومەوە سەر گوزوشتەی ئەم ناوەم لە دایكم بپرسم، دەمەو ئێوارە، خۆر تەواو لە ئاسـۆ نزیك ببۆوە. گەییمەوە كۆڵانەكەی خۆمان. دایكم لە دوورەوە بینی كە لەبـەر دەرگـا دانیشتبـوو، بەسەر تەقەڵ و دروماندا نوشتا بۆوە، كراسێكی بۆ جەمیلەی خوشكم دەدروی. جەمـیـلەی حەوت ساڵان لە تەنـیـشـت دایكمـەوە چەشـی جوجەڵەیەكی ئاسودە هەڵكورما بوو. چاوە گەشەكانی بڕی بووە دەست و تەقەڵی ئەو... سەری لەگەڵ هات و چووی دەرزیەو داوەكەدا دیناو دەبرد... دەیویست لەوە دڵنیابێ كە كراسەكەی بۆ جەژنی ئەورۆز تەواو دەبێ یا نا. لەم سەر هێنـان و سەر بردنەدا نیگای لە نیگام هەڵەنگوت. قریشكەیەكی شادیی كردو:

ـ ئەرێ وەڵلا ئەوە كاكە مەهدی‌یە....

وەكو جوجەڵە بە باڵە فڕێ بەرەو پێم هات، بە هانكە هانك خۆی گەیاندێو گوتی:

ـ كاكە مەهدی، بابە چووە كەبابمان بۆ بكرێ.

دەستیم گرت، لە دڵی خۆدا گوتم: «تـومەز دایكم بۆیە تا ئەم درەنگ وەختە لەبەر دەرگایە، خەمی شیولێنانی نی‌یە.»

دایكم لە قریشكـەكـەی جەمیلە سەری هەڵبـڕی. پرشنگی سۆزێكی یەكجار گەرمم لە چاوە كاڵەكانیدا بەدی كرد.

هەوەڵ مانگی‌سێ بوو، خەڵكی هێشتـا لە ژوورەوە دەنوستن. ئێمە كرێ چی بووین، دوو ژوورمان لە گەرەكێكی میلی بەكرێ گرتبوو.... بابم هاتەوە، بۆنی كەبابی گەرم ئاوی دەزاندە دەم. چووینە ژوورەوە، سفرە راخرا، بە چوارقۆلی دانیشتینە سەر پێرە سفرە.. جەمیلە چاوی بڕی بووە لوولە (كەبابەكان)و بەدەم چاوەڕوانی‌یەوە خۆی. رادەژاند ئەگەر بابم تۆزێكی دی ماتەڵ بووایە هەموو دەستورێكی پێ شێل دەكردو وەكو كتكی ئەوسن پڕی دەدایە كەبابێك و...

بەدەم نان خواردنـەوە، ناوە ناوە(دەمـەروانی‌یە دایكم. دایكم سوسەی شتێكی كردبوو. زۆر جار كە پارەم پێویست با بەدایكم دەگـوت و ئەویش بەبابمی دەگوت. نیگای دەیگوت: «ئەوە بۆ نانەكەت ناخۆی رۆڵە، پێ دەچێ شتێكت پێ بێ.... هەر خوا بكا دیسان پارە نەبێ. خۆ دوێنێ دینارێكم لەم داماوەی بابت

بۆ وەرگرتی.. بەستەزمانە ڕۆژ تا ئێواری ڕەنجی دەدا... وا پیر بوو و پێژی حەسانەوەی بە خۆوە نەدی.. لە ماڵەوە بۆ عەمەلاتی، لە عەمەلاتی بۆ ماڵەوە....

نان خورا، سفـرە پێچـرایـەوە، چا هاتـە بەرەوە، بەدەم چا خواردنەوە بیرم لەوە دەکردەوە: لێی بپرسم، نەپرسم: ئاخۆ بابم چەند پێ بکەنێ!..»

قیروسیام کردو پرسیم:

ـ دایکە...

ـ گیانی دایکە.

ـ کێ ناوی ناوم؟!

نیگـایەکی بابمی کردوو سێیەری بزەیەکی ناسک کەوتە سەر لێوی‌و زوو ناوەبوو. فڕێکی لە چایەکەی بەردەمی‌دا. نیگایەکی دی بابمی کرد. وەك بڵێی ئیزنی لێ بخوازێ تاسەر گوزشتەی ئەم ناوەم بۆ بگێڕێتەوە. بابم سەرینە زلەکەی ئەولای خۆیەوەی ڕاکێشا. وەکو ئەوەی ئەویش خۆ بۆ بیستن چیرۆکی ناوەکەی من ئامادە بکا، شانی دادایە سەر سەرینەکە، تۆزێ لە فکران ڕا چوو، گوتی:

ـ ئا، ڕاست دەکا ئافرەت، بۆمانی بگێڕەوە... خۆزگەم بەو دەمە. ئۆخـژنێکم لە دڵ و دەروون گەڕا، پتر خولیای ناوەکەم کەوتە سەر. دایکم وەك ئەوەی لە سێو دووی ئەوەدا بێ، چۆن و لە کوێوە دەست پێ بکا، بەسۆزێکی دایکانەوە گوتی:

ـ ناشێ ناوەکت بەدڵ نەبێ لە دەورت گەڕێم!

هەندێ دامام، گوتم:

ـ نا.... هەر ویستم بزانم.

بەفرێ چایەکەی هەڵدا، تاماوەکەی دەمی قووت داو دەستی پێکرد:

ـ هێی پیرە دنیا! گەر ماوی یادت بە خێرو گەر مردووی هەزار ڕەحمەت لە گۆڕت.

نیگایەکی بابمی کرد. وەك بڵێی بە خۆی بڵێ: ئەرێ بۆ تا ئێستا یادێکی ئەو پیاوەمان نەکردۆتەوە، ئەوجا گوتی:

ـ تۆ بڵێی مابێ پیاوەکە؟!

بابم هێدی هێدی تەزبیحە دەنك گەورەکەی لە دەستا دەگێڕا، لەبن لێوانەوەو بە دەنگێکی پڕ میهرەوە گوتی:

ـ بڵێم چی ئافرەت! دوور نی‌یە.

ئەوجا دایکم لە سەری ڕۆیی:

ئەو ساڵە بووکـە شۆڕشـەکـەی مەلامستـەفای بەرزانیان تواندەوە.. نۆرەی ڕەبی سەبەبکارت بەکۆی زوخاڵ بێ.. پیاوێکی گەلێ گەورە بوو، حکومەت یەك ملیۆن دیناری تەرخان کردبوو بۆ هەرکەسێ بیکوژێ، ملیۆن گاڵتە نی‌یە! ماڵمان لە(دۆڵە ڕووت) بوو. ئەوەندە جوان لە بیرمە،

وادەزانم دوێنێ بووە. ئاخـر چۆن بیرم دەچێ، سەر لەبەری ژیانی کوردەواری گۆڕی. چی کوژرا، کوژرا، چی ڕەهەندەی وڵاتـان بوو، بوو، چی بە عەزرەتـەوە سەری نایەوە، سەری نایـەوە، ئێمـەش قیسمـەت ونسیب لە شاری گیرساندینەوە. هەندێکیش بەدزی بە چیاوە مانەوە!

دێهات وێران کران، ماڵان لە زیل بارکران، سەدان خێزان نەفی کران...

باران بوو، ساڵی واتەڕو تووش هەر نەبۆتەوە.

گونـدەکەمان سەر تۆپ درا، تەیارە بەئاسمانەوە فڕکان فڕکان هەر مەپرسە! بەڵام پیاو کە پێشمەرگەی لە پشت بێ تف لە ئاسنیش دەکا... جا پێشمەرگەش کێ بێ؟ ئەو سەر پەلەی لە مەر خۆمان! پیاوێکی قۆز، باڵابەرز، دایمە ردێن و سمێڵ هاتوو، تۆکمەو گورج و گۆڵ، قسەقوت و ورە بەرز، لە فیشەکدا زەردی دەکـردەوە... هەمـوو پێشمـەرگەیەك لە پەلەکەی ئەودا بەند نەدەبـوو، گلەییان لێدەکرد، لە بەر ئازایەتی‌و چاو نەترسی ئەو کەس لە پەلەکەیدا دەر نەدەکەوت و ناوی دەر نەدەکرد. لاڵ بم یاخـوا، ئەگـەر جارێ پێشمەرگە لە شەڕێك دا شکابان، بەوە دڵخۆشی خۆی‌و خەڵکەکەی دەدایەوە دەیگوت:

ـ گوێ مەدەنێ، هەمـوو شکانێ بەزین نی‌یە، ئێمە تەبیعەتی شووشەمان هەیە، لە شکانا تیژتر دەبین. بۆ ئەمجارە بێتەوە...

بەرایی هێـزی دەوڵەت، لە ئاسۆگەکانی خوار گوندەوە بەدیار کەوت، قەت بەقەد ئەو ڕۆژە نەترساوم. سکم وا بەقەد دەهۆڵی دەهـۆڵ کوتێك بەرز بۆتەوە. نزیکەی سەعاتێکە بەدەم ژانەوە دەتلێمەوە، پور مەنیجی مامان بە دەستمەوە داماوە، لە لایەکەوە ترسی شەڕو لەلایەکەوە ترسی ئەوەی من بەسەر منداڵەوە بچم، شپرزەیان کردبوو. ئەمەقی نەبوو، هەموو جارێ خۆی بەرەوە هەڵدەکێشا: لەوەتەی ئەم مەنیجە مامانە، نەی هێشتووە.. هیچ ژنێ لە گوندەکەدا بەسەر منداڵەوە بچێ. تەنانەت سکی هەشت

مەتکیش زایاندوە! خۆی بەنەنکی سەر لەبەری مندالانی گوند
ـحزانی. دایمـە گیرفانی شەکروکەو گوێزی سوێرکراو، مێوژە
ـرشکەی پێ بوو. هەر مندالێك گریوی گرتبا، هەر کە ئەو گازی
کربا دەست بەجێ ژێر دەبۆوە. چ قودرەت بوو، دایکێك لەبەر
چاوی ئەو لە مندالی خۆ بدا.. زارە بێ ددانەکەی لێ دەکردەوە
جی ئاشێو بشێڤێی دەکرد. ئەوەندە پیر بوو ردێنی هاتبوو. جا
کە لەژنێ توڕەبایە، تالە مووە سپی‌یەکان سەر چەناگەی
ـطەرزی:
ـ عەمـرت نەمێنی ئاوەهـا! خوا بە قوربانی منتکا، ئەگەر من
ـدەمبووم تۆ ئەو ژنە بووی مندال بگری‌یە باوەش!
ـدەستێکی بەسـەر منـدالەکـەدا دێنـا، دەیبـردە ژوورەکـەی
خوی. جـاری وابـوو بە حەفتـە ئەو منـدالەی نادایـەوە بە
ـلیکـەکـەی، دەیگـوت: ئێوە نازانن ئەو والیکراوی واپێکراوە
چونە.. با قەدری عافیت بزانێ.
چەنـدین تکـاکـار دەچوونە تکا ئەوجا مندالەکەی دەدایەوە..
یخوا خوا عافوت بکا پور مەنیج.. باوەرناکەم مابێ..
حەریك بوو دیقبکەم، من عەودالی ناوەکەی خۆم بووم، ئەویش
بلـی پور مەنیجی بۆ دەکـردم. بەلام ئەوەنـدە بەئـاووتـاو
ـدەیگێڕایەوە دلم نەدەهات پێی‌ببرم.
ەنلسەیەکی قولی هەلکێشاو لەسەری رۆیی:
ـ خەلکی هەموو لەگوند دەرچوون.. بەهەر جۆری بوو قەناعەتم
ـە پور مەنیج کرد کە ئەویش وورده وورده بەکەلکەکەی پشت
گوندا هەلگەڕێو بڕوا... هەرچی دەکرد پێی ڕێی دا نەدەگرت
ـتـەنیـا جێم بێلێ. ئەدی چۆن جارێکی دی خوی هەلبکێشێ
ولێ: من ئەنکی هەموو گوندەکەم! رۆحیش شیرینە، ئینسان کە
ـێر بوو ترسنۆکیش دەبێ. چاوی تێم بڕی، خوڕ خوڕ فرمێسك
بە چاویا هاتە خوارێ، لەپڕ پشتی تێکردم، دای کورکاندو وەکو
جەنازە خوی بکێش کرد....
لەنـاو ژانی خۆم ئاگام لەگەرمەی تۆپ و تەیارە نەمابوو... ناو
بەناو زەلەو هەراو هەنگامەی خەلکە کۆچ کردووەکەم بەرگوێ
دەکەوت کە لە کەلکەکە ئاودیو دەبوون. زۆر دەترسام، دەنگی
تەقە تەواو کز بوو، لەوە دەچوو پێشمەرگەش پاشەکشە بکەن.
لە پڕ گوێم لە تەپـەی پێ بوو، لەنـاو قەدەوە پەڕام. نەخـێر
عەسکەر دەگەنە سەرم وچش لە مردنەکە هەر حەیاشم دەچێ..
بابیشت لە هەرێمێکی دی پێشمەرگە بوو.

دایکم بەدەم قسـەکـردنەوە سیمای دەگۆرا، گرژ دەبوو. خاو
دەبۆوە، سوور هەلدەگەرا، رەنگی دێناو دەبرد، دەتگوت ئێستا
ژان گرتـویەتی‌و بەدەم ژانەوە ئەو بەسەر هاتە دەگێڕێتەوە...
نیگایەکی پرسیار ئامێزی بابمی کردو گوتی:
ـ حەبیب چات بۆ تێکەمەوە!
چایەکی لە بەردەم بابم داناو ئەوجا لەسەری ڕێی چاوم ریشکەو
پێشکەی دەکرد تارماییەك بەهانکە هانك وەژوورکەوت. هەر لە
پێلم ئەوی‌و بەلایەکی شانی‌دا دام:
ـ مەترسە باجی غوربەت..
برۆ، برۆ. کابرای تاین لە ژێرما شەلالی ئارەقە ببوو. پارچە تۆپ
دەکەوتەوە، لە تەپو تۆزدا وون دەبوین. هەزار قولووهللا بەفلسێ:
خوایـە چۆن خەجـالەت بووم. چۆن ئەم کابـرایەش بەمنەوە
گیرۆدە بوو.. مەرگم بە ئاوات دەخـواست. رۆح لە جێیـەکی
سەختەو دەرناچێ! گیزو هۆری گوللە هەترمشی زەلامی دەبرد.
کاری راست بێ لە کەلکەکە مار دیوی کردم.. لەبەر زارکی کوێر،
ئەشکـەوتێك دایـنام پشوو بدەین.. هەستی بە حالم کردبووە.
تۆزێ لێم دوور کەوتەوە، لە پەنا گابەردێك دا دانیشت..
پاش تۆزێـك تۆ واقـە واقت لێ هەستا. کابرا قەلەم برێکی لە
بەرکی دەرهێنـا. هات ناوکتی بڕی. چ پارچـەیەکمان دەست
نەکەوت. جامانە سوورەکەی خوی لە سەری دامالاند، قوماتی
کردیت و کردیتی بەلوولەی تفـەنگـەکـەیـەوە وخستی‌یە سەر
شانی‌و بەڕێ کەوت. کە لە دوایەوە دەڕۆیشتم تۆم لە جامانە
سوورەکـەدا دەبینی هەمـوو ئازارێکم بیر دەچـۆوە.. وەستا،
بەشەرمێکەوە ئاوڕێکی پاشەوەی دایەوە:
ـ باجی غوربەت ئەرێ کورە یاکچ؟!
سوور هەلگەرام. بە شلە ژاوی‌یەوە گوتم:
ـ کورە
ـ ناوی دەنەی چی؟
ـ ئەیەرۆ کاك مەهدی توخوا ئەوەقسەیە. بلێ ئەوەندە سپلەبم
ناوی ئەنێم مەهدی!
بزەیـەکی گەش نیشتـە سەر سیمـای‌و هیچی نەگوت. دایکم
چاوێکی بە هەمووماندا گێڕا. بزە نیگایەکی بابم کرد، فرمێسك
لە چاوانی قەتیس مابوو. هەستم دەکرد گریان لە ئەوکی گیراوە،
هەر زار هەلێنێ لە هۆر ژنی گریانێ دەدا. لێکدا لێکدا دەستی
بەقژە خاوەکەی جەمیلەدا دێنا کە لە پەنایدا خەوی لێکەوتبوو.
بەخۆیشم کە بیم لە ناوەکەم دەکردەوە گەشکە دەیگرتم و....
١٩٩٠

# خەباتی رزگاریخوای نەتەوایەتی گەلی کورد لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ١٩٠٠_١٩١٤

نووسینی : نەجات عبدالله

لەدوادوایی‌یەکەی سەدەی هەژدەمو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا زۆر ئالوگۆڕو گۆڕینکاری گەورە گەورە بەسەر سەرتاپای جیهان داهاتن و یەک لەگۆرینکارە گەورەکان خەباتی ئایدیۆلۆژیکی و سیاسیوئابوری چینی بۆرژوا بوو لەبەرامبەر پێوەندی‌یەکانی دەرەبەگایەتیو لەئەنجامیش دا کلّپەوتاوسەندنی جوولانەوەی نەتەوایەتی کەهاودەنگ دەگەڵ گەشەئەستاندن و بەخۆداهاتنەوەی سیستەمی سەرمایەداری و هەر لەهەناوی مندالّدانی سیستەمی سەرمایەداریش جوڵانەوەی نەتەوایەتی سەری دەرهێنا ، سەرەتای سەدەی بیستەم ـ سەدەی هەستانەوەی نەتەوایەتی بوو وهەموو گەلان بەخۆکەوتن و بەگەرمی کەوتنە جۆشدانی خەباتوقوربانی بۆ سەربەخۆیی‌و رزگاری شۆرشی گەورەی فەرەنسا یەکێک لەخالّە هەرە گەورەکانی وەرچەرخانی بیروباوەڕی مرۆڤایەتی بوو وقەلّەمبازێکی چلۆنایەتی یەکجار گەورە بوو بۆپێشەوە بەوەی کەلەبنەوان دا پێوەندی‌یەکانی دەرەبەگایەتی هەلّتەکاندو بیروباوەرو ئایدیۆلۆژیکی شۆرش‌بۆ هەموو گەلانی سەر دونیا وەکو تیشکی خۆر پرشنگی دەهاویشت . خۆحارێ دروشمی پیرۆزی ( سەربەستی ، یەکسانی ، برایەتی) بۆ گەلانی ستەمدیدەو چەوساوەی رۆژهەلاتونەخوازەش گەلانی ژێردەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی قیبلەنومایەک بوو بۆخۆی ، تەنانەت خودی(تورکەلاوەکان ) بیروباوەری شۆرشی گەورەی فەرەنسا کاری تێکردبوون و ( توانیان سالّی ١٩٠٨ لە رێگای کودیتایەکی سەربازی جاری دەستورنامەی عوسمانی بدەن)[1] . کۆدیتا سوپایی‌یەکەی تورکەلاوەکان بۆ گەلانی زۆرو ستەمدیدەی چوارسەد سالّەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پاییزەخەونێک بوو بۆخۆی ، هێندەی نەبرد رووی راستەقینەی تەسک وتروسکی تۆرانیەتی ( ئیتەحادوتەرەقی‌یەکان) کەوتەروو کەدەیانەویست بەهەر رێگاو وەسیلەیەک بی گەلانی غەیرە تورک لەناو بۆتەی تورکیسم بتوێننەوە ، لێک هەلوەشاندنەوەو لاوازی پەک کەوتەگی ئیمپراتۆریەتی چوارسەد سالّەی تیرۆرو تۆتالیتریستی عوسمانی و سیاسەتی تواندنەوەی گەلانی غەیرەتورک ، هەموو گەلانی نێو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وریاکردەوە، نەخوازەش نەتەوەکانی نیمچە دوورگەی ( بالکان ) وەکو یۆنانستان و صربی‌یەکان و بۆلگارستان و بۆسنەوئەلبانیا و هتد . هەروا لەنیمچە دورگەی عەرەب وئەرمینیا و تەنانەت خودی تورکستانیش بۆ پێک هێنانی دەولّەتێکی تورکی سەربەخۆ وەخۆکەوتن ، لەنێو ئەمگەلانەدا گەلی کوردیش وەخۆکەوت ، وەلێ پان تورکەلاوەکان هەموو جولّانەوەو هەستانەوەیەکی گەلانی غەیرە تورکیان بەسووندی سەرکوت دەکرد تاوای لێهاتبوو جولانەوەی تۆرانیسم بوو بوو بەدەستگایەکی سەرکوت کردن و لەناوبردنی هەموو جولانەوەیەکی دیموکرانیکی‌و ئازادیبەخش ، لەلایەکی دیکە گەلانی غەیرەتورکی نێو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەکارتێکردنی جولانەوە ئازادیبەخشەکانی سەدەی نۆزدەهەمی ئاوروپاو بیروباوەری رزگاریو یەکسانی هەریەکەسەرقالّی ئازادی و رزگاری گەلانی ژێردەستەی خۆیان بوون .

عیراق بەکشتی و کوردستانی خوراوو بەتایبەتی وەک ویلایەتێکی دوورە دەستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کەئەوسا لەویلایەتی موسل خۆی دەنواند . ( تادوای شەری قرم (١٨٥٣ ـ ١٨٥٦) پاش‌ئەوەی کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دوای ئەو شەرە سوپایەکی قایمو خەزینەیەکی پری وەبن دەستکەوت

ـای ئەوەی نەبوو بەتەواوی دەست بەسەر ـی وکوردستانی خواروودا بکێشێ ، لەسایەی ـنەتی مەدحەت پاشاو، چەند ریفۆرمێکی نـلوە ـی کران ، کەهێندەی نەبرد هەلومەرج لەجاران ـ ـسەر بووەو تاکودیتاکەی ساڵی ١٩٠٨چ عیراق و ـکوردستانی خواروو هیچ چەشنە گۆڕینێکی وایا ـخۆیەوە نەدی کەباس بکرێن)(٢) بەدوای کودیتا ـی ساڵی ١٩٠٨ی حکومەتی ( ئیتحادوتەرەقی ) ـ گۆرانکارییەک وولاتی عیراقیشی گرتەوە ، ـ دەیەک هەول درا هانی فێرکردن وپەروەردە ، ـی ، بایەخێکی تایبەتی بەپەرەپێدانی ـ وکال درا ، ئەندازیاری ئینگلیزی سیرولیەم ـکوکس بۆ ریفۆرمی ئاودێری بانگهێشتی ئێراق ـ و دوای ئەوە بەربەستی هێندیەی دروستکرد ـ کۆمپانیایەکی بەریتانی بۆ ئاودێری بە ـی زەوی‌و زارەکان دروستی کرد)(٣)! هەلایسانی ـگری شەری نێوان ئیتالیا ویونانستان جارێکی ـکە دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی لاوازکردو ـیان کرد کەدەستووری ساڵی ١٩٠٨ نەخرێتە ـ ـرچیوەی جێبەجێ کردن وکەش وهەوایەکی وا ـو دروست بوون کە بوونە سەرەتای بلاوبونەوەی ـی نەتەوایەتی لەناو گەلانی ستەمدیدەی ـیرە تورک بەشێوەیەک کە ( تورکەلاوەکان دوای ـردانی دەستورنامەی ساڵی ١٩٠٨ سیاسەتی ـتورک کردنی گەلان و نەتەوەکانی غەیرەتورکی ـو ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان پیادەکردو ـۆمەڵی ( ئیتحادوتەرەقی ) کە لیژنەی ـبەراندنی تورکەلاوەکان بوو لەشاری ( سالونیک ـەکارتێکردنی بیروباوەری دیموکراتیکی ـزئاوایی دامەزرا ، ئەم کۆمەڵەیە توانی ساڵی ١٩٠٠ لەرێگای کودیتایەکی سەربازی دەستورنامەی ـورکەلاوەکان بەسەر سولتان عبدالحمیدی دووهەم ـسەپێنێ و دەستووری ساڵی ١٩٠٨ سەرەتای ـ پەرین و وریابونەوەی گەلانی غەیرەتورکی

نێو چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوون و گەلانی غەیرەتورک ، عەرەب ویونان و صرب وکورد بەرەو ئاسۆی رزگاری وسەربەخۆیی هەنگاویان هەلێنا و دەستیان بەجولانەوەو هەنگاوهەلگرتن کرد)(٤) ساڵی ١٩٠٩ لەئەنجامی ئەو پشێوی و نارێکییەی کەوڵاتی تەنیەوەو لەئاکامی داواکاری خۆپیشاندەرەکان لەئەستانەی پێتەختدا بۆ داوای جێبەجێکردنی یاسای ئیسلامی، بەمە ئیتحادییەکان ئەم هەلەیان قۆستەوەو لەدەست خۆیان نەداو سولتان عەبدوالحمیدی دووهەمیان وەلاناو حەمە رەشادی برایان لەشوێن دا دانا کە حەمەرەشاد هەر بۆخۆی داشی‌دامەی دەست ئیتحادییەکان بوو وبەس ، بۆیە دەبینین کەساڵی ١٩٠٩ چ لەنێوەوەو چ لەدەرەوەی عیراق و کوردستانی خواروودا زۆر کارەسات ورووداوی ، زۆر روویان داو شیوان وپشێوییە خێلەکییەکان بلاوبوونەوە، بۆ نموونە لەویلایەتی بەسرەو بەتایبەتی لەناوچەی عەمارەدا کوشت وکوشتاری هۆزەکانی عەنزەو دەلیم گەیشتە ئەوەی کەژەنرال حەمەفاضل پاشا بەخۆی سەرکردایەتی چەند گوردانێکی سوپایی بکا تاشەرەکە ئاگربەس بکا . هەر لەوسالەدا چالاکی سیانیرەکان گەرم‌وگوڕییەکی دیکەی بەخۆوە گرت .

قوتابخانەی ( ئەلیانین) ی یەهودی لەموسل و کازمیەوحیلەو عەممارەو بەسرەدا بەهۆی کۆمەڵەی فەرەنسایی ـ بەریتانی دامەزرا .لەژێر چاودێری ( دوکتۆر دەبلیو. ئەی ویگرام) مسیانیرە ئایینییە بەریتانییەکان چالاکی ئایینییان لەکوردستانی خواروودا پەرەپێدا . لەشاری ئامێدی قوتابخانەیەکی ئایینییان دامەزراند ، هەروا بالوێزخانەی فەرەنسایی بەگەرمی پاڵپشتی مسیانیرە ئایینییە کاسولیکییەکانی دەکرد . یەکەمین قوتابخانەی ئەلەمانی بۆ هەوەل جار ساڵی ١٩٠٩ لەشاری موسل دا دامەزرا وەلێ

هێندەی نەبردو نەما )[5].

هاودەنگ دەگەڵ شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ای تورکەلاوەکان کوردەکانیش وەخوکەوتن و ریکخستنی کوردستانی خۆیان دامەزراندو کەوتنە بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوایەتی کوردو بلاوکردنەوەی فەرهەنگ وکەلتووری کوردی ( شۆرشەکەی ١٩٠٨ای تورکیا لەپێناوی دەستوورویاسایەکی دیموکراسی یانەبوو کاری تیکردن ، لەودەمەدا کوردەکان بۆیەکەمجار بەڕاستی هەوڵی خۆ رێکخستنیان دا چەند پارتێکیان دامەزراند یەکەم پارتی کوردی ( عەزمی قەومی ) بوو ولە١٩٠٨ یەکێتی(تەعالیو تەرەقی کورد ) لەپاڵ ( نەشری مەعاریفی کوردی ) لەلایەن کوردە ڕۆشنبیرە ئورستوکراتەکانەوە دامەزرێنرا[6] هاوئاهەنگ دەگەڵ هەوادارانی تورکەلاوەکان ) جولانەوەی نیشتمانی کوردیش وەخۆکەوت و ( بەم جۆرە سالی ١٩٠٨ بەساڵی سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی رێکخراوی رامیاری کوردی دادەنەدرێو دەست پێکردنی قۆناغێکی تازەش بوو لەتێکۆشانی گەلی کوردو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی) [7]تورکەلاوەکان بەهەموو چەشنێک دژایەتی بزاڤی نەتەوایەتی گەلی کوردیان دەکرد لەساڵی ١٩٠٩ تورکەلاوەکان ئەنجومەن و قوتابخانەی کوردەکانیان لە ( چەنبەرلی)داخست بەڵام ئەوە رێگای لەوەنەگرت کە لە١٩١٠ گرویەک لەقوتابیان ومامۆستایان ئەنجوومەنێکی تازە بە نیوی ( هێڤی کورد ) دابمەزرێنن و دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی گووارێکی مانگانە بەنێوی ( ڕۆژی کورد ) [8]کۆمەڵەی هیڤی دووەمین کۆمەڵەی کوردی رامیارییە دیتەکایەو لەهەموو کۆمەڵە کوردییەکانی ئەو سەردەمە چالاکتربوو ،گووارێکی بەنێوی ( ڕۆژی کورد ) بەزمانی کوردی وتورکی بڵاوکردەوەو دواجاربوو بە ( هەتاوی کورد ،ودواتر بەنێوی ( ژین ) بڵاودەکرایەوە ، تابەشداربوونی تورکیا لەشەڕی یەکەمی جیهانی ئەم کۆمەڵەیە هەر دەست بەکاربوو.)[9]

کوردستان لەوسەروبەندەدا کوانوی ڕاپەڕین و بەرخودان بوو هەلومەرجی بابەتی زۆر لەباربوو بەڵام بەداخەوە هوشیاری سیاسیو نەتەوایەتی لەو ئاستە بەرزەدانەبوو کەجولانەوەکە بگەیەنێتە مەنزل ( لەساڵی ١٩٠٩ هەوادارانی شێخ عەبدولقادر شۆڕشێکی گەورەیان لەبەتلیس بەرپا کرد ، وەلێ هەرەسی هێنا )[10]دەولەتی ئیتحادو تەرەقی کەتازە هاتبووە سەرکار هێندەی نەبرد بیری پەلاماردانی کوردستانی خوارو لەکەڵکەڵەی داو ( هاتن سوپاوهێزێکی چەکداری گەورەیان لە ساڵی ١٩٠٩ ناردە سەر بارزان ، ئەمەش سەرەتای راپەرینە چەکدارەکەی بارزان بوو )[11] هەرزوو بەئاگروئاسن کەوتنە ئاوربارانی بارزان وتا دواجار توانیان بارزان داگیربکەن و خەباتی چەکداری گەلی کورد لەوناوچەیە بکوژێننەوە جارێکیتر سوپای سوڵتانی عوسمانی بۆ داواکردنی ئەو باجە زێترەی کەخرابووە سەرشانی حوتیرانو زەحمەتکێشانی کوردو بۆ سەرکوتکردن و تەمی کردنی پیاوەکانی شیخ عەبدولسەلامی بارزانی لەمارتی ١٩١٤ سەرلەنوێ ئەمجارە پەلاماری بردە سەرناوچەی بارزان و ( هێزی چەکداری بارزانیان خۆبەختکەرانە بەرهەلستی هێزی میری کردو زیانێکی بێ شوماری پێگەیاند ، بەلام میری هەتائەهات هێزی بەدوای هێزائەیناردە سەر بارزان ئەمەو خۆفرۆشتنی کۆنەپەرستەکانی ناوەو بەیارمەتی ئاغاکانی زێبارو چەند عەشیرەتێکی چڵکاوخۆری تر میری و ئەو هێزانە توانیان بگەنە بارزان و داگیری بکەن وبەتەواوەتی بیسوتێنن وتالانی بکەن، لەحوزەیرانی ئەوساڵەدا پاش ٣ مانگ خەباتی مەردانە کۆتایی بە ڕاپەڕینەکەی بارزان هات وشێخ عەبدالسلام ناچار بوو بەخۆیو چەند پیاوێکیەوە سنوور ببڕن و بگەنە شاری ورمێ لەکوردستانی ئێراندا )[12]گەلی

کورد هیچ کاتێک لەقوربانی دان و شۆرشنە کەوتووە، سەرهەلدانێک لێرە بەئاگروئاسن خامۆش دەکرێ لەلایەکی دیکە بەرخودانێکی دیکە سەرهەلدەداتەوە ( بەرخودانێکی دیکەی کوردان سالی ۱۹۱۳ لەویلایەتی بەتلیس بەسەرکردایەتی مەلاسەلیم و شهابالدین هەلایساو ئاگری شۆرش هەموو ناوچەیەکی بەتلیسی گرتەوە، بەلام چونکی راپەرینەکە تەنها لەناوچەیەکی بەرتەنگ بوو، بۆیی دەبینین کەهەرزوو شکستی هێناو مەلا سەلیمیش خۆیدا بەدەست بالوێزخانەی روسیا لەبەتلیس وتا شەری یەکەمی جیهانی مەلاسەلیم ناچاربوو خۆی بەدەستمیری بداو تا لەیەکێک لەشەقامەکانی بەتلیسدا بەدارا کرا ) (۱۳).

دوای ئەوەی کەئاگری شەری یەکەمی جیهانی هەلگیرساو تورکیا لەژیر دروشمی درۆزنانەی ( غەزا ) و ( جیهادکردن ) دا چووە نێوکۆری جەنگ، بەمە جولانەوەی رزگاریخوازی کورد خۆی لەئاستانەیەکی وێل وسەرگەرداندا دۆزیەوە ( دۆزی کورد هەر دەگەل سەرەتای شەری یەکەمی جیهانیدا ۱۹۱٤ خۆی لەژێر دروشمی ( جیهاد لە دژی کافران ) دا دۆزییەوە ) (۱٤) وێرای ئەم دروشمە بریقەدارانەی سیاسەتمەدارانی عوسمانی بۆ تواندنەوەی جولانەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستان بەرزیان کردبووە دەگەل ئەوەشدا دەبینین کەهێشتا جولانەوەی نیشتمانی کوردستان دەگەل تۆپەکانی شەرو مالوێرانکاری و کاولی شەردا چاوی خەوالووی کردەوەو بەرەو ئاسۆی رزگاری و ووشیاربوونەوەی نەتەوایەتی هەنگاوی گەورە گەورەی هەلێناو قۆناغێکی تازە لە خەباتی گەلی کورد دەستی پێ کرد.

پەراوێزو سەرچاوەکان :

١) عبدالغنی الملاح . تأریخ الحرکە الدیمقراطیە فی العراق . الطبعەالثانیە . المؤسسەالعربیە للدراسات والنشر،بیروت، ١٩٨٠، ص: ٩

٢) العراق فی الوثائق البریطانیە ١٩٠٥-١٩٣٠، ترجمەوتحریر: فؤاد قزانجی ، دار المأمون بغداد،١٩٨٩ ص: ٢٠

٣) هەمان سەرچاوە، ص: ٢١

٤) هەمان سەرچاوە ص: ٥٩

٥) هەمان سەرچاوە ، ص: ٦٠

٦) جەمال نەبەز، کوردستان ومەسەلەی کورد سوێد، ١٩٨٩ .

٧) گۆواری کوری زانیاری کورد، ژ(١٨ - ١٩)سالی ١٩٨٨ ، لا، ٢٨٣

٨) واسیلی نیکیتین ، کردوکردستان ، ترجمە محمد قاضی ، انتشارات نیلوز، تهران ١٩٨٧ ص: ٤١٥

٩) گۆواری کۆری زانیاری کورد ،ژ( ١٨ - ١٩ )، سالی ١٩٨٨ ، لا : ٢٨٨

١٠) حسین مدنی ، کردستان ، برس تحلیلی سیاسی نهضتهای ملی در کردستان ، تهران ١٩٧٩ ، ص: ٣٨

١١) گۆواری ( بەیان ) ژمارە (١) سالی (١٩٧٢)، لا : ٤٢

١٢) گۆواری ( بەیان ) ژمارە(١) سالی ( ١٩٧٢)، لا : ٤٣

١٣) رەفیق حلمی ، الاکراد منذ فجر التاریخ الی سنە ١٩٣٠ ، الموصل ، ١٩٣٤ ص ٥٦

١٤) حسین مدنی ، کردستان ، برسی تحلیلی سیاسی نهضتهای ملی در کردستان تهران - ١٩٧٩ ، ص: ٤٢

# مامەڵەی تایبەتی لە دەرهێنانکاری شانۆی کوردی دا

عمر علی امین

ئەو نمایشە شانۆیانەی کە بینەر دەچێتە سەیرکردنیان، تاکە هونەرێک نییە کە خۆی بە تەنیا نیشانی بینەر بدات و لەگەڵیدا بکەوێتە گفت و گۆ، بەڵکو لە کۆمەڵێک هونەری هەمە جۆر دروست بووە کە رژانەتە ناو یەکەوە کارێکیان دروست کردووە کەپێی دەوترێت: شانۆیی. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە بە شانۆیان وتووە: دایکی هونەرەکان.

شانۆ، هونەری شێوەکاری: بەوێنەو نەخش و پەیکەرو میکیاجەوە.. هتد، هونەری مۆسیقا: بە ئاوازو سازو گۆرانیو دەنگەوە.. هتد، رووناکی بازی بەبات و رەنگەکانیەوە، جل و بەرگ بە مۆدێلەکانیەوە، وێژە بە چیرۆک و هۆنراوەو پەخشانەوە.. هتد چەندان هونەری گرتۆتە خۆ.

بەڵام بۆ ئەوەی ئەم هونەرانەش لە دەستکاریو ئارەزووکاری ئەکتەرەکان پارێزراوبێت و پاشا گەردانی لە کارەکەدا نەکەوێتەوە، واتە هەر هونەرە روونەکاتە جێگەیەک و بە ئارەزووی خۆی ئەسپی خۆی لێتاو بدات، بەڵکو هەر هونەرە بە پێی پێویستی کارەکە بەشێوەیەکی هەرەوەزی سوود ببەخشێت و جوانکاری بکات، بۆ ئەم مەبەستەش پلانیو نەخشەیەکی بۆ دەست نیشان کراوە ئەو نەخشەیەش کارمەندێکی بەدەسەڵات گرتوویەتیە ئەستۆی خۆی کە ئەو هونەرانە هەمووی لە یەکێتییەکدا بهۆنێتەوە کە بەرەو خزمەتی یەک ئامانج سەرقاڵیان بکات کە ئەویش سەرکەوتنی نمایشەکەیە، ئەو کارمەندە هونەرمەندەش لە شانۆدا پێی دەوترێت: دەرهێنەر.

خۆ وانەبێت دەرهێنەریش لەگەڵ سەرەتای بزوتنەوەی شانۆوە بوونی بووبێت، نەخێر، بەڵکو شانۆ لەرەوتی بەرەو پێشەوە چوونیدا بەرە بەرە لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەستی بەوە کرد ئەم شێوازییەی کە باسمان کرد پەکی سەرکەوتن دەخات بۆیە پێویستی بە سەرەوکاری هونەرمەندێکی بەکار هەیە تواناو کەرەسەکان یەک بخات و وەستایانە رووەو سەرکەوتن بەکاریان بهێنێت. ئیتر ئەوەبوو لەسەدەی بیستەمدا دەرهێنەریش خۆی لەسەر تەخت و بەختی شانۆ چەسپاندو، بەرادەیەکی ئەوتۆش کە دوای نووسەر، لەکارەکەدا پاشای بەرو بەحر هەر خۆی بێت.

(دەرهێنەر نەبوێکی هونەرمەندە سەرۆکایەتی کۆمەڵێک هونەرمەندانی تر دەکات.... نیوەکەی تریش وەک سەرکارێکی کرێکاران وایە لە کارگەیەکدا، وەک سەرۆکێکی قەشەکان وایە لە کەنیسەیەکدا، وەک چاودێرێکی ئەزموونکارەکان وایە لە ئەزموونگەیەکدا، جگە لە چەکەکانی تریشی. هەروەها بۆی هەیە خۆی چەکدار بکات بە ئارامی مومەریزەیەکی میهرەبان و، قورگی چاوە شێکشەوە - تیرون جاسرێ کە دەرهێنەرێکی بەناوبانگی ئەمەریکایە -)

لێرەدا بەو رێگەیەدا ناڕۆم کەروو دەکاتە باس کردنی لایەنە خەستەکانی هونەری دەرهێنانکاری وەک: چۆنێتی رێکخستنی نمایشەکەو، جۆرەکانی رێبازەکانی پیشاندان و، شیکردنەوەی شەخسیات و، نەخشەی کارو، مەشق و راهێنان و.. هتد، چونکە ئەم جۆرە زانیاریانە لە کتێب و گۆڤارو رۆژنامەدا زۆروزەبەندە بڵاو کراونەتەوەو لە پەیمانگەو کۆلێجە هونەرییەکاندا بەدەرس دەخوێنرێن. بەڵکو بەلایەکی تردا پێچ دەکەمەوە لەم نووسینەدا رووەو ئەو جێگەیە دەڕۆم کە دەرهێنەری کوردی لێیە، رووەو ئەو باسانە کە پێوەندی بە دەرهێنەرێکی کوردەوە هەبێت، ئەویش:

لەم قۆناغە ناسکەی هونەرەکەماندا کە مۆرکێکی تایبەتی خۆی هەیە، کە قۆناغی پێگەیشتن و دروست بوونی شانۆکەمانە، کە ئەم کاری دروست بوونەش بەوە ساز دەبێت دەرهێنەر جۆرە مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ ئەم قۆناغەدا بکات.

ئێمەش وەکو وڵاتانی تری ئەم جیهانە وەکو دیاردەیەکی شارستانێتی پێشوازی شانۆمان کردووە، ئەم بزووتنەوەیەش وەکو هەموو بزووتنەوەیەکی تر لە پڕێك نەبووە بە کوڕێك، بەڵکو لە ڕەوتی بەرەو پێشەوە چوونیدا پێویستی بە خەمخۆرانی خۆی هەبووە کەرەنجیان تێدادا‌وەو دەماخیان سووتاندووە هەتا گەیشتۆتە ئاستی ئەمڕۆی. کەواتە ئەو هونەرمەندە خەمخۆرانەی کە ئێستا دێنە کۆڕەوە، دێنە سەر کۆمەڵێك کەلەپووری پیرۆزی شانۆ، کە ئەمانیش چ ڕەنجێکی تری لەگەڵدا بدەن و چی تری پێشکەش بکەن: دەچێتە سەر ئەو ڕەنجەی پێشینان و دەبێتە تەواوکەری ئەو کەلەپوورەی ئەوان و، مایەی بەردەوام بوون و گەشە کردنی تری بزووتنەوەکە. خۆ ئەمەش یاسایەکە نە بەدەست منەو نەبەدەست تۆ، هەر ئەوەیەکی نوێ لە بووتنەوەیەکدا هاتبێت، هاتۆتە سەر کەلەپوورێکی ئامادەکراوی بەری ڕەنجی پێشینان و ئەویش بووە بەتەواوکەری ئەو ڕەنجەو جڵەوی گرتۆتە دەست ڕووەو پێشکەوتنی تر ڕێگەی گرتۆتە بەر. بۆیە ئەوانەی کە لەم ڕاستییە خۆیان گێل دەکەن هەمیشە هەر مایە پووچ بوون و هیچیان بە هیچ نەبووە.

هونەرمەندانی ئێستای شانۆ شمان کەلەم سەردەمەدا لە کۆڕدان و ئەرکی دەرهێنانکارییان گرتۆتە ئەستۆ، لە تێ پەڕبوونیاندا بەم قۆناغەی ئێستاماندا کەوتمان مۆرکی تایبەتی خۆی هەیە کە ئەویش قۆناغی پێگەیشتنی شانۆمانە، هێندێك ئەزموون و تاقی کردنەوە هەیە ئەگەر بە تایبەتکاری بە دەربەستیانەوەبن و، بیکەنە پەیەوێکی وردی کاکردن بۆ هونەرەکە، ئەمە دەبێتە تەواو کەری ڕەنجی ڕابووردوو، واتە دەبێتە هێزی گەورە بۆ دەقی درامیو هونەری نواندن کە تین و گوڕ بە پێگەیشتن و دروست بوونی

**شانۆمان دەبەخشێت کە لێرەدا لەمەودوا بەهێنی دەرفەت پێشکەشی دەکەین.**

دەمەتەقێی ئەم بەشە لەگەڵ هونەرمەنداندا:

١- جیاوازی چییە لە نێوان ڕژێمی شانۆی درامیو شانۆی بازرگانیدا؟

٢- ئەلەکسەندەر ئۆستروفسکی کە وتوویەتی «بەبێ ڕژێم شتێك نابێت پێی بووترێت هونەری شانۆ» ئەم وتەیە چی دەبەخشێت و لەژیانی کارکردنی هونەریتدا چیت دێنێتەوە یاد؟

٣- لەرووی ڕژێمەوە پەیوەندی نێوان بینەرو شانۆ چین؟

٤- ئەگەر مەرج بێت ڕژێم لە شانۆدا بسەپێت، بە چ ڕێگەیەك دەبێت؟

٥- ڕژێمی ڕاهێنانی کۆرس، جیاوازی چییە لەگەڵ ڕژێمی ڕاهێنانی ئەکتەرەکانی تردا؟

**مامەڵەی تایبەتی لە دەرهێنانکاریی شانۆ ی،**

مۆسیقا مۆسیقایەو، ڕۆژنامەگەری ڕۆژنامەگەریەو، بازرگانی بازرگانییەو، شانۆش شانۆیە. هەموو بزووتنەوەو چالاکییەکی ئەم ژیانە خاسیەت و ڕژێم و یاساو، تایبەتکارێتییەکی جیاوازی خۆی هەیە، وەستاو شاگردو پسپۆڕو ئوستادی، کارمەندی تایبەتی خۆی هەڵ دەسووڕێنێت و دەیگەیەنێتە ئامانجە دیاری کراوەکانی خۆی، بۆیە هەر یەکە ناوێکی تایبەتی خۆی هەیەو قابیل نابێت بیدات بە یەکێکی تر.

هەر لەبەر ئەم ڕاستییەشە کە پێشکەوتن و سەرکەوتنی هەر بزووتنەوەو چالاکییەك بەرهەمی ڕەنجی پسپۆڕو شارەزاکانێتی.

شانۆش بەو سیفەتەی کە ژیان نیشان دەدات بەرابووردووی‌و ئێستای‌و داهاتوویەوە بەنیازو مەبەستی چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکانی مرۆڤەوە، جا بەو پێیەی کە دەرهێنەر خۆی بەرپرسیاری سەرەکی سەرکەوتن و ژێرکوتنی نمایشەکەیە، وا پێویست دەکات کە: هونەرمەندێکی زانابێت، نەك هەر زانابێت، بەڵکو زۆریش زانابێت، نەك هەر زۆریش زانابێت، بەڵکو لە هەمەجۆر زانستیشدا زانابێت، بەلام پێش هەموویان بلیمەت و شارەزای هونەرەکەی خۆی بێت کە کەرەسەی کارەکەیەتی.

زانستیش بەو چاوە سەیر ناکرێت کە گۆمێکی ڕاوەستاوەو ئەلەبەری دەروات و نە دەچێتە سەری، چونکە مادام ژیان ڕاوەستاوە نییەو لە جم و جووڵ و گۆڕانێکی هەمیشە پیدایە، زانینیش هەر دەبێت بەرەو پێشەوە چوون و دەوڵەمەند بوون بروات، ئەگینا زانیارییە کۆنەکەی دوێنێ بەتەنیا بۆ کەرەسەی ئەمڕۆ دەست نادات.

شانۆ پێش هەموو شتێك فیكرە. چەكی دەرهێنەریش زانیارییە: زانیاری كۆمەلایەتی، ئابووری، جوگرافیا، مێژوو، زمان، سیاسەت، یاسا، دەروونی، ئاینی، فۆلكلۆر...هتد كە ئەمانە یەك لەیەكتری پێویست ترن جگەلە سەلیقەو زیرەكیو بلیمەتی دەرهێنەر خۆی، ئەنجا ئەگەر شانۆیەك بەختی یاربوو دەرهێنەرێكی وا بووبە خاوەنی، ئەوە بەرخی بازی دەكات. خۆ ئەگەر خواش دەرهێنەرێكی وای پێ نەبەخشی، هەر هیچ نەبێت ئەو دەرهێنەرە مەرجە بەلایەنی كەمەوە زانیارییەكی تێرو تەسەلی دەربارەی ئەو دەق و نمایشە ببێت كە دەستی دەداتێ. خۆ ئەگەر ئەوەندەش بێ بەختبوو تووشی دەرهێنەرێك بوو كە هەتا لە زمانی زمانناسیی شارەكەی خۆیشیدا ساتمە بكات، ئاخۆ نەبێت ئەو شانۆیە چ دڵێكی بەخۆیەو دوارۆژی خۆی خۆش بێت.

ئەكتەرێكی شارەزاو سەركەوتووی هاوڕێم لە كۆنەوە لەگەل كاروانی هونەرەكەدا بەرێكەوەیە جارێك لێم پرسی: هی وا هەیە ماشەلا ئەوەندە بلیمەتە، سەرەتای ژیانی هونەری جانتای خۆی لێ دەگرێت بە دەستەوەو بەدەرهێنانكاری دەست پێ دەكات، ئەی تۆ بەم هەموو شارەزایی‌و ئەزموونە و سەركەوتوویییەی خۆتەوە بۆچی جاروبارەیەك كارێكی دەرهێنان ناگریتە دەست؟ هاوڕێكەم لە وەلامدا وتی:

ـ دەلێن فۆرد (خاوەنی كارگەی ئۆتۆمبیلی فۆرد) گوایا كاتی خۆی وتوویەتی: هەركەسێك هێندەی من شارەزای ئۆتۆمبیل بێت، سواری نابێت. ئەنجا هاوڕێكەم وتی:

ـ هەر كەسێك چاك شانۆ بناسێت و لێی شارەزابێت و بزانێت دەرهێنان چ بەرپرسیارییەكی گرانی تێدایە، تا بەتەواوی لە خۆی رانەبینێت ناچێت بەلای ئەو كارەوە.

هەر بەپێچەوانەی ئەو هاوڕێیە شمەوە، یەكێكم بینی كە بۆ یەكەم جاری بوو چووبووە سەر شانۆ، دەورێكی سەركەوتووی بینی كە جێگەی رەزامەندی دەرهێنەرو بینەرەكان بوو، كە ئەو خۆشی نەی دەزانی هۆی سەركەوتنەكەی ئەوەبوو كە شەخسیەتە سروشتیەكەی خۆی لە خۆیدا لەگەل ئەو دەورەدا گونجاو بوو، هەر وەكو چۆن دەرهێنەرێكی سینەما لە شەقامێك شەخسیەتێكی نا هونەری گونجاو بۆ یەك جار هەلدەبژێرێت و چیرۆكەكەی پێ سەركەوتوو دەكات.

بەلێ ئەو برایە كە لەدواییدا ئەم ناوەی خۆی بیستەوە، پاش مانگێك بینیم لەو سەر شەقامانە چەند فایەلێكی لەبن دەستایەو یەك دوو كەسێكی لەگەلەو هەر دێن و دەچن، كە پرسیم: ئەری خێرە فلا نكەس واسەری قالە؟ وتیان: ئەی ئەت زانیوە، خەریكە تیپ دابمە زرێنێت، وتوویەتی من حەزم لەدەرهێنانەو دەبمە دەرهێنەر. وتم: باشە ئیشەلا خێری پێوە دەبێت.

دەمن چیرۆكی ئەم برایەم هیچ بەلاوە سەیر نییە، چونكە ئەوەندەی كە بە شان و باهوی دەرهێنەردا هەلدەدرێت، سەیر نییە كە چەند كەسانێكی بێ توێشوو تەفرە بدات كە بەپەلە پرروزێ خۆیان بگەیەننە رووناكی ئەو ستایشانەو لە دواییشدا هەر وەكو ئەو پەپوولانەیان لێ بەسەربێت كە لە تاریكی شەودا خۆیان دەگەیەننە رووناكی چرایەك و لە ئانجامدا بە گەرمایی چراكە دەسووتێن.

لێرەدا زۆر مەبەستە روونی بكەمەوە:كە دەلێن مەرجە دەرهێنەری ئەم سەردەمەی شانۆی ئێستامان شارەزاییەكی تەواوی لە هونەرەكەی خۆیدا هەبێت، نابێت ئەمە وابگەیەنێت كە لە داهاتوودا كەم تواناش بێت. بۆی هەیە، نەخێر بۆی نییە. بەلكو پێ لە سەر ئەوە دادەگرین كە: مەرجی شارەزایی دەهێنەر پابەندینیە بەقۆناغەوە، بەلام لەو حالەتەدا كە شانۆمان گەیشتە قۆناغ، مەترسی لە چەند دەرهێنەرێكی كەم تواناش نامێنێت، چونكە دلۆپێك ناو كارناكاتە سەر كەم بوونەوەی عەماراوێكی پر.

**دەمەتەقێ ئەم بەشە لەگەل هونەرمەنداندا:**

١ـ لە ژیانی هونەریی خۆتدا دیوتە دەرهێنەرێك كارەكەی هەمووی زادەی بیرو زانیاری خۆی بێت و، بیروڕای ئەكتەرەكانیش یاریدەیان نەدابێت؟

٢ـ لەسەر وتەكەی ستانسلافسكی كە دەلێت: هەموو ژیانێك لە هونەر تاوانە. ئایا رێكەوتی دەرهێنەرێكت كردووە لە كارەكەی كشابێتەوە لەبەر ئەوەی توانای بەسەریدا نەشكاوە؟

٣ـ بەرای تۆ دەرهێنەرێكی كەم شارەزا، تا چ رادەیەك دەتوانێت ئەنجامی دەقێكی شانۆیی بەر لە نمایش كردن، هەلبسە نگێنێت؟

٤ـ دەرهێنەرێك كە خۆی لە رادەیەكی جیهانیدا نەبێت، ئایا بۆی هەیە لەسەر ئەوە پێ دابگرێت كە: دەقی كورێش پێویستە لە رادەیەكی جیهانیدا بێت ئەوسا شایستە كە ئەم

تمایشی بکات؟

هـ ئەگەر شانۆییەك لە سەرو تێگەیشتن جەماوەری بینەرانەوە بێت، ئایا ئەو بەرهەمە خزمەتی پێگەیشتنی شانۆمان دەکات؟ ئایا رادەی شارەزایی لە دەرهێنەنکاریدا نیشان دەدات؟

جارێکیان لە نووسینێکدا بەم مانایە وتم مرۆڤ کە لە ئاوێنەدا سەیری خۆی دەکات، چەندە ئەو ئاوێنەیە روونی نیشان بدات ئەو مرۆڤەش ئەوەندە سەیری دەکات، خۆ ئەگەر وێنەی خۆی تێدانەبینی، یان بەلێڵی نیشاندا، یان گۆڕی، ئەو کەسەش زوتر وڕز لە سەیر کردنی دێنێت، بەلای منەوە شانۆش هەر وەکو ئاوێنە وایە، بینەر کە سەیری نمایشێك دەکات، چەندە خۆیو هیوا و ئامانجی خۆی لەو نمایش دا ببینێت، چەندە بەسەرهات و مێژووی وڵات و نەتەوەی خۆی تێدا رەنگ بداتەوە، ئەوەندەش بە شانۆی خۆی دەزانێت، بەم پێیەش ئەوەندە نرخی شانۆی بەلاوە بەرزتر دەچێتەوە، خۆ پێچەوانەی ئەم حاڵەتەش هەر بە پێچەوانە دەوەستێتەوە.

جا هەڵبژاردنی دەقێکی درامیش بۆ نمایشێك کە ئەم بەشەی نووسینەکەمانی بۆ تەرخانە، هەڵبژاردنەکەی پەیوەندی راستەوخۆی بە دەرهێنەرەوە هەیە.

شانۆییەك کە پڕ بەپێستی سەردەم و رۆژگارەکەبێت، کە جەماوەری بینەر خۆیان و ئاواتە کانیانی تێدا ببیننەوە، ئەرك و رەنج و مەسرەف بکرێتە قەبەڵی ئەو جۆرە دەقە، ئەمە راست و دروستە. کە شان بەشانی ئەمەش نرخی شانۆ لای جەماوەر بەرزتر دەکاتەوە.

هەندا رایەك دەڵێت: بەڵێ هەڵبژاردنێکی وا نایاب راستیە و دروستە، بەڵام خۆ هەموو شانۆییەکی چاکیش بەشی خۆی کەڵکی هەیەو بەشی خۆی نرخی مرۆڤایەتی گرتوتە خۆ. بەڵێ ئەمەش هەر راستەو لاریی لەمەدا نییە. بەڵام ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە زور لە ئامانجە سەرەکییەکانی سەردەمێکی تایبەتی جەماوەر وەربگیردرێت و لە جیاتی ئەوە پێشوازی هەندێ مەبەستی لاوەکی بکرێت کە هۆش و بیرکردنەوە لە ئاواتە سەرەکییەکان کەمتر بکاتەوەو سوودێکی کەمتر ببەخشێت لەوەی کە مەبەست و سەرەکییە. کە لەوانەشە بیروڕایەکی وا [illegible] هەندێك دروست بکات کە شانۆ بۆ کات بردنە سەرە.

بەم بۆنەیەشەوە دەڵێن: شانۆ یەکەم وڵات کە چەکەرەی تێداکردوو، رووادو، گەورە بوو پێ گەیشت، وڵاتی گریك بوو، ئەنجا لەوێوە گەلانی تری جیهان پێشوازییان لێ کرد بۆ وڵاتانی خۆیان.

جا ئەگەر هەر لە سەرەتادا ناوەرۆکێکی شانۆی درامی تەواوی نەگرتایەتە خۆیو لە خزمەتی ئامانجە سەرەکییەکانی کۆمەلایەتیو سیاسیو...هتد سەردەمی ئەوسای گریکەکاندا نەبوایە یان ئەگەر رێبازێکی شانۆی بازرگانی بگریایەتە بەر، کێ دەڵێت ئەو شانۆی گریکە هەر لە سەردەمی خۆیدا چاوەڕەمی لێك نەدەناو بەشەرییەت لەم دیاردە شارستانیتییە بێ بەش نەدەبوو؟

بزووتنەوەی شانۆی کوردیشمان بەم تەمەنە کورتەی خۆیەوە، شانازی بەوەوە دەکات کە رێچکەی شانۆی درامی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو دوورەپەرێزی شانۆی بازرگانی بووە، چاکەکەشی لێرەدا چاکەی جەماوەری بینەری کورد خۆیەتی، چونکە هەمیشە پەرۆشی بینینی ئەو نمایشانەن کە هیوا رەواکانی خۆیانی تێدا دەبیننەوە، ئەگەرچی ئەو دەقانەی لەم جۆرەبوون کە لە دوورەوە قسەیان کردووەو، ناراستە و خۆ بوون.

جا سوودوەرگرتن لە تاقی کردنەوەکانی رابووردوومان، داوا لە دەرهێنەری ئەمڕۆی بزوتنەوەی شانۆمان دەکات، کە لە هەڵبژاردنی دەقەکاندا بایەخی گەورەتراں بەو دەقانە بدات کە لەگەڵ ئاوەتەکانی جەماوەری کورددا گۆرانی دەڵێن و، لە گەڵ ژانەکانیاندا دەناڵێنن، کە ئەمەش یەکێکە لەو مامەڵە تایبەتکارییانەی دەرهێنەری ئەمڕۆی کورد لەم قۆناغی پێگەیشتنی شانۆیەماندا پێرەوی دەکات.

کەمێك لەمەوبەر وتمان شانۆکەی ئێمەش شانۆیەکی درامی بووە، ئەی کە وایە بۆ چی شانۆی کوردیمان پێنە گەیشتووە؟ ئەگەر تێ بینی پێگەیشتنی شانۆی گریکەکان بکەینەوە وتمان: دەقی نمایشەکان لە خزمەتی ئامانجە سەرەکییەکانی سەردەمی ئەوسای گەلی گریکدا بووە. هەروەها دەڵێن وڵاتانی تریش کە خاوەنی شانۆی خۆیانن دەقی نمایشکانیان لە ناخی خواستە سەرەکییەکانی سەردەمی خۆیانەوە هەڵقوڵاوە، بەڵام ئایا دەقی شانۆییەکانی ئێمەش ئەگەرچی درامی بووبن لە خزمەتی ئامانجە سەرەکییەکانی جەماوەری گەلی کورددا بوون؟ راستەوخۆ لەگەڵمان دوواون؟ لە نزیکەوە رووبەروومان

بونەتەوە؟ بە ئاشکراتر ئایا دەقەکان لە ناخی خواستە تایبەتیەکانی ژیانی کوردەوارییەوە هاتبوونە دەرەوە؟ یان ژمارەی ئەو دەقانە هەتا پێش ڕاپەرینەکەی کوردستانیش بەشێوەیەکی زۆر گشتی، تێکڕا ڕۆشنبیریەکی مرۆڤایەتی، یان نیشتیمان پەروەری، یان کۆمەڵایەتی بوون، ئەگەر لەوەش پتر بووبن، تایبەت نەبوون بە ئێمەو خواستەکانی ئێمەوە، بەڵکو تایبەت بوون بە ڕووداوو بەسەرهاتی وڵاتانی ترو، بەسەردەم و ڕۆژگاری گەلانی ترو، خواست و داخوازی تایبەتی میللەتانی ترەوە.

کەواتە تاقی کردنەوەکە لێرەدایە: کوردیش وەکو نەتەوەیەك کە خاسیەتی تایبەت و/ ڕووداوو بەسەرهاتی تایبەت و/ ڕۆژگارو سەردەمی تایبەتی خۆمان هەیە، مێژوو خواستی تایبەتی خۆمان هەیە، مەرجە ئەم بابەتانە لە شانۆکەماندا ڕەنگ بداتەوە، کە ئەم بابەتانەش لەدەقی کوردیدا نەبێت لەدەقی بیانیدا نیە، دەقی کوردیش قەڵەمی نووسەری کورد دەینووسێت.

جا دەرهێنەرێك کەماڵ تەواوی ئەم قۆناغە بدات و بەشداری پێگەیشتنی شانۆیەکی ڕەسەن و هاوچەرخی کوردی بکات نمایشە کردنی دەقی کوردی دەیگەیەنێتە ئەم ئامانجە. خۆ دەمێکیشە لەو ڕاستییە بووینەتەوەکە: بەڵێ دەقی بیانی ڕێبازەکانی نمایش کردن و شێوەی چارەسەرکردن و بەروبوومی ئەزمونکاریو لایەنی هونەری بەئێمە دەبەخشێت، ئەگەرچی ئەمەش خۆی کارێکی گەلێك بەکەڵکەو دابڕبوون لێی دابڕبوونێکە لەڕەوتی هونەری جیهان، بەڵام ناسنامەی شانۆی کوردی نانوسێت جا دەرهێنەرێکی کورد لەم قۆناغەدا کە دەقێکی کوردی دەست دەکەوێت بۆ نمایش کردن و دەشێت، چەندە لە بەختانی شانۆمان بوو ڕێگەی بەچیوە خرتنی شەیتان نەدایە کە گوایا نووسەرەکەی لەکۆڕو کۆمەڵ و تیپی ئەم نییە، یان دۆست و هاوڕێی ئەم نییە، یان گوایا بۆچی ئەم ناوبانگ بۆ ئەو نووسەرە پەیدا بکات، هەروەها بە توندی دەرگای لە ڕووی هەموو ئیعتیباراتێکی ڕقەبەرایەتیو ناتەبایی دەربارەی نووسەرەکەی ـ ئەگەر هەبوایە ـ دابخستایە. بەکورتی دەرزی قیبلەنما چۆن بەهەر لایەکدا جووڵێنتەوە هەر ڕووەکاتەوە باکووروو باشوور، نیازو ئامانجی دەرهێنەریش لەو حاڵەتەدا هەر ڕووی بکردایەتەوە سەرکەوتن و پێگەیشتنی شانۆکە. ئەو

دەهێنەرانەی کە مەبەستیانە خزمەتی شانۆ بکەن بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەرفەت نایەن زاڵ بن بەسەر ئەو نەخۆشیە دەروونیانەدا، بەوە دەتوانن کەڵك بەشانۆمان ببەخشن کە گۆرەپانی هونەرەکە چۆڵ کەن بۆ خەمخۆرانی خۆی.

زیرەکی دەرهێنەر لەوەدایە کە ئەو حەقیقەتە بزانێت کە ناوبانگ پەیداکردن بە دەرهێنانی دەقی (گۆتە) و (هارولد پنتەر) و (شکسپیر) و... هتد پەیدا نابێت، تا ئێستاش هیچ دەرهێنەرێکی عالەمی بەو دەقانە ناوبانگیان پەیدا نەکردووە بەڵکو ناوبانگ هەر ناوبانگی نووسەرەکەی بووە.. نووسەر یەك و دەهێنەر سەدان. بەڵکو ناوبانگ پەیدا کردن، بەکاری داهێنان و نوێکاری ئەفراندن و ئەزموونی سەرکەتوو بەدەست دێت، کاری ئەفراندن و نوێکاریش لەم سەردەمەدا پێگەیاندنی شانۆیەکی ڕەسەنی هاوچەرخی کوردیە، کەوابوو کێ خشتێکی خستە سەر بەرزکردنەوەی دیواری شانۆکەمان و لەم کارەدا جێ دەستی دیار بوو، داهێنەرو ئیبداع کەر ئەوەو ناوبانگ ناوبانگی ئەوە.

**دەمەتەقێی ئەم بەشە لەگەڵ هونەرمەنداندا:**

١ـ ناوی دەرهێنەرێکی کورد دەزانێت کە زوربەی نمایشەکانی دەقی قەڵەمی نووسەری کورد بێت؟

٢ـ ئایا لە تیپ و کۆمەڵە هونەرییەکەی خۆتدا، لەلایەن دەرهێنەرەوە. کۆبوونەوەو کۆڕی تایبەتی ساز دەکرێت بۆ لێکۆڵینەوەو بایەخ دان بە نمایش کردنی دەقی کوردی؟

٣ـ ئایا بە بیرتدا دێت دەرهێنەرێك قەناعەتی بە دەقێك نەبووبێت و گەچی هەڵیشی بژاردبێت و نمایشیشی کردبێت؟

٤ـ ئایا هەر دەقێك لەبەر ئەوەی کوردییە، ئیتر مەرجە دەرهێنەر هەڵی بژێرێت بۆ نمایش کردن بەنیازی بەشداری کردن لە ڕەوتی شانۆدا؟

٥ـ بەڕای تۆ، نووسەرێکی کورد لە کوردستاندا نەژیابێت و دراماکانیشی بە کوردی نووسرابن، بەڵام ئایدیۆلۆجیەتی جەماوەری کورد نیشان نەدات، ئایا بەرهەمەکانی لە خانەی دەقی درامای کوردیدا ڕیز دەکرێن؟ یان ئەگەر بەزمانێکی غەیرە کوردیش نووسرابن، بەڵام موعانەتی کوردەواری نیشان دەدەن، ئایە لەخانەی درامای کوردیدا ڕیز دەکرێن؟

دوای ئەوەی کە چەند وشەیەك دەبارەی دەرهێنەرو، مەرجی شارەزایی دەرهێنەرو، هەڵبژاردنی چیرۆك و دەق، وترا، ئێستا

لەم بەشی کۆتاییەدا دەربارەی هەڵبژاردنی ئەکتەر دەدوێین.
بە پێی ئەو ڕاستییەی کە: دەق و، ئەکتەرو، تەختەی شانۆکە، سێ عونسوری سەرەکین لە کاری دروست بوونی شانۆدا، ئەگەر یەکێک لەم سیانە بوونی نەبوو، واتە شانۆیەکی کۆج.
کەواتە ئەگەر ئەکتەر لەرادەی هونەری خۆیدا نەبوو، نەیتوانی بگاتە ئەو ئاستەی جێگەی خۆی پڕبکاتەوە لەوکاری دروست بوونەدا، لەم حاڵەتەدا ڕاست نییە پێ نەگەیشتنی شانۆمان بە تەنیا بخرێتە مل لاوازی دەق - وەکو وا بلاو بووە - چونکە چەندان دەقی نایاب و بەهێز بەهۆی ئەکتەری بوودەڵەوە مەرەسی هێناوە،
بە پێچەوانە شەوە چەندان دەقی لاواز بەهۆی تینی هونەری ئەکتەرەوە درەوشاوەتەوە، ئەمە ئەگەرچی عونسەرەکانی هونەری شانۆ پەرەوازەیی ناگرنە خۆو، مەرجە هەموویان لە یەکێتییەکدا تێ هەڵکێش بن و دووران نەبن.
بە ڕووناکایی ئەو ڕاستیەدا کە کاری ئەکتەر لە دروست بوونی شانۆییەکدا کارێکی سەرەکییە، هەڵبژاردنی ئەکتەریش بۆ ئەم مەبەستە ئەرکی دەرهێنەر خۆیەتی. خۆ باسەکەی ئێمەش لەم ڕووەوە باسی سەردەم و زەمانەو قۆناغە ـیە پێ لەسەر ئەوە دادەگرین کە چۆنێتی هەڵبژاردنی ئەـەر لەم سەردەمەدا مەسەلەیەکی تایبەتکاری دەوێت.
دەرهێنەر پێش هەمووان لای ڕوونە کە شارەزایی و توانای هونەری هۆی، لەرادەی بەرزو نزمی کارە شانۆییەکەیدا رەنگ دەداتەوە، واتە نمایشە شانۆییەکە لە توانای دەرهێنەر دەدوێت.
کەواتە هەڵبژاردنی ئەکتەر بۆ نواندنی دەوری کەسە درامییەکانی ناو دەقەکە پڕ بەپێستی خۆیان، ئەمە جگەلە ئەوەی شانۆ باڵای پێ دەکات لە هامان کاتیشدا ناوی دەرهێنەرەکەشی پێ بەرز دەبێتەوە.
کەوابوو کاتێک هەنگاوەکانی دەرهێنەر دەگاتە ئاستی دابەش کردنی دەورە درامییەکان و هەڵبژاردنی ئەکتەر، باڵاکردنی شانۆییەکە داواکارە کە ئەم هەڵبژاردنەش مەرجەکانی چۆنێتی هەڵبژاردنی دەق بگرێتە خۆ- وەك لەوەو پێش باسمان کرد- واتە تەنیا یەك ئیعتیبار ڕەچاو بکرێت، سەرکەوتن و پێشکەوتنی شانۆییەکە، ئیتر ئەو ئیعتیبارانەی تر کە کارەکە دەخەنە قوڕگی گێژاوەوە دوور بخرێنەوە.
بەڵێ هەموو کۆمەڵ و ڕێکخراوێکی ئەم ژیانە بۆی هەیە شانازی بە ئەندامان و دۆستان و بەرهەمەکانی خۆیەوە بکات، خۆ لەکاتی پێویستیشدا داوای یارمەتی لە کەسان و لایەنی تر بکات بۆ ئەنجامدانی بەرهەمەکانی، ئەوەش دیسانەوە هەر مایەی شانازییە بۆیان... دە تیپێکی هونەری ئەگەر لە شەخسیاتە درامییەکانی چیرۆکێدا، دەورێك یان چەند دەورێکی نواندنی تێدا بوو بۆ ئەندامانی ئەو تیپە نەشیا کە شانۆیەکە نمایش دەکەن، لەم حاڵەتەدا کارێکی زۆر بەجێیە بۆ دەرهێنەرێك کە داوای هاوبەشی لە تیپێکی هونەری تر بکات بۆ پێ سپاردنی ئەو دەورانەی کە بۆ ئەکتەرەکانی لای ئەوان دەشێت. واتە لە حاڵەتی پێویستدا دەرهێنەر هەر پابەندی تیپەکەی خۆی نەبێت. چونکە کە دەور بۆ ئەکتەرێك نەشیا ناشێت. ئەمە درامایە.
مەکینەیەك کە برغوویەك یان پارچەیەکی بۆ دابنرێت کە هی خۆی نەبێت بۆی ناشێت و ئەنجامەکەی هەر پەکەوتن دەبێت. دەرهێنەرێکی خەمخۆری شانۆش دوورە لەوەوە کە تیپ خوازی و هاوڕێیەتی و خزمایەتی، یان ڕقەبەرایەتی و ناتەبایی، یان سوودی تایبەتی شەخسی بکاتە سەنگ بۆ هەڵبژاردنی ئەکتەرو ڕادەی شیانی بۆ دەورو توانا هونەرییەکەی. چونکە زیانی ئەم کارە بەسەر شانۆدا دەشکێتەوەو شانۆ دەییزێرێت.
بەڵکو دەرهێنەرێك کە بە دەربەست پێگەیشتنی شانۆی نەتەوەکەی خۆیەتی بەسەنگی هونەرو توانای هونەرین، ئەکتەرو هونەرمەند دەکێشێت،
لەبەر ئەوەش کە شانۆ لە خزمەتی پێشکەش کردنی فیکردایە، نەك پێشکەش کردنی ئەشخاس، فیکر ناکاتە قوربانی ئەشخاس و تیپ، چونکە فیکر لە ئەشخاس و تیپ بەرزترە.
بەلای منەوە دەرهێنەر سەنگێکی تریش هەبێت بۆ کێشانەی کاری ئەکتەر کە لە سەنگە هونەرییەکە سووکتر نەبێت، ئەویش ئەوەیە: ئەکتەرێك با لە ڕادەی هونەرەکەیدا ستانلا فسکی بێت، بەڵام ئەگەر لە ناو جەماوەری بینەراندا زرابێت و، دەرکەوتنەکەی، ژانی ڕۆژگاری دەستی دوژمنی گەل بهێنێتەوە یاد بینەر، بەم کارە نەك هەر ڕێزی شانۆ کەم دەبێتەوە بەڵکو ڕەوتی بەرەو پێگەیشتنەکەشی خاو دەکاتەوە.
هەڵبژاردنی ئەکتەر بەشێوەیەکی ڕەوای خۆی، شانۆیەکی ڕەوا

دەخاتەوە. پێچەوانەش بە پێچەوانەوە. با لەبەر خاتری هەڵبژاردنی ئەکتەرێکی دۆست بەڵام لێ نەهاتوو، یان هەڵنەبژاردنی ئەکتەرێکی بڵێین ناخۆشەویست بەڵام لێ هاتوو، شانۆییەکی بەرزوگەورە هەرەس نەهێنێت.

ئەگەر لەژیانی هونەریتدا دەرهێنەرێکت بینی کارەکەی پێویستی بە ئەکتەرێکی سەرەکی یان یەك دوو ئەکتەری ناسەرەکی بوو، بۆی پەیدا نەکراو لەبەر ئەم هۆیە وای بەچاك زانی دەست لەو نمایشە هەڵگرێت چاکترە لەوەی کە بە چەند ئەکتەرێکی لاوازەوە پێشکەشی بکات، ئەگەر رێکەوتی دەرهێنەرێکی وات کرد، ئەوە لە خانەی ئەو هونەرمەندانەدا ناونووسی بکە کە لە کاری پێگەیاندنی شانۆکەماندا چاوەروانی دەست رەنگینیان لێ دەکرێت.

خوێنەری بەرێز، لە سەرەتای نووسنەکەماندا کە بەبریق وباقی شەخسیەتی دەرهێنەردا هەڵدرا کە: وا سەرکردەی کارەکەیەو، وا پاشای بەروبەحر خوێیەتیو، واو واو... هتد لەبەر ئەوە شتێکی سەیرینیە کە ئەمە چەند کەسانێکی ساواهونەر، یان زرەهونەرمەند فریو بدات کە خۆیان بە کاروباری دەرهێناندا هەڵبواسن و بینە مایەی چەند تاقی کردنەوەو ئەزموونێکی تاڵ و تیژ بۆ هونەرمەندان وئیل کردنی هێندێك رووخساری هونەریی کە ئەنجامەکەی خۆشنووییەکی بەدەمەوە نەبێت.

کە وابوو ئەم نووسینەش ئەگەرچی شۆڕ نەبوتەوە بۆ ناو وردەکاری دەرهێنان و بەلای بینەرێکی وریاشەوە ئەلف وبێی دەرهێنان کاریە، ئەگەر بە مەبەستی بیرخستنەوەش بێت هەر کەڵك بەخشە چونکە جاری وا هەیە هێندێك بیرکەوتنە وە ئەوەندەی دروستکاری کەڵك بەخشە. لە سەرێکی تریشەوە ئەمە سکاڵایەکی هونەرییە بەو نیازەی کە گیانی بەرپرسیاری هونەریی لای خەمخۆرانی شانۆکەمان خۆشەویستر بکات.

هەر لەم ئاستەشەوە شانۆکەمان بەوە دڵشادە کە هەر لە کۆنەوە خاوەنی کۆمەڵێك هونەرمەندی دڵسۆزو چالاك و بەتوانا بووەو کە بەگیانی لێبووردنەوە کاریان تێدا کردووەو، بەرهەمی پێت و بەخەریان پێ بەخشیوە، کە ئەگەر خاوەنی ئەو شۆرە سوارە لە خۆبووردووانە نەبوایە، وا بەم جۆرەی ئێستای کاری ساز نەدەبوو.... کورگەلی دەرهێنەرانی ئەم سەردەمەی ئێستاشمان کە بەشادەمانییەوە مەبەستیانە بەر پرسیاریی بەشداربوونی پێگەیاندنی شانۆمان بکەن، وایان بۆ تو[...]

دەکرێت کە ئەوەتان لە گۆرەپانەکەدا قۆڵیان لێ هەڵمالیوەو گەر[...]

لە پێشینانیان سەرقاڵی کارە شانۆییەکانن، ئەرەتا بە ساما[...]

هونەرییەکەیان دەوڵەمەندی دەکەن و، بەتاقی [...] وەکانیا[...]

موتوربەی دەکەن و بە داهێنان و نوێکاری مالی سە[...]مە[...]

خۆی دەدەن، کە ئەمەش گەش بینیەك بە دواڕۆژی دەبەخشێ[...]

و چاوی بینەران بە پێگەیشتنی شانۆیەکی رەسەنی هاوچەرخ[...]

کوردی روون دەکاتەوە.

دەمەتەقێی ئەم بەشە لەگەڵ هونەرمەنداندا:

١ـ ئەگەر هەڵبژاردنی ئەکتەرێك لە لایەن دەرهێنەرەوە [...] دەورێك، لەگەڵ ئارەزووی ئەکتەرەکەدا یەك نەوەستایەوە، یا[...] بەپێچەوانەوە، ئەنجام بەلای تووە چۆن بێت چاکە؟

٢ـ ئەنجامی موناقەسەی یەك دوو ئەکتەر بۆ هەڵبژارد[...] دەورێك، ئایا مەرجە لەگەڵ رای دەرهێنەردا یەك بگرێتەوە؟

٣ـ توانای هونەریو رەوشتی شانۆیی، هەردووکیان تەواوکەر[...] یەکترین بۆ هونەرمەند، لەحاڵەتی هەڵبژاردن[...] ئەکتەرێکدا کەخاوەنی یەکێکیان بێت، بەلای تۆو، دەرهێن[...] هەڵبژاردنی کامیان پەسەند بکات؟

٤ـ ئایا دەرهێنەر خۆی ئەکتەر هەڵبژێرێت بۆ نواندنی دەور[...] شەخسیەتە درامییەکان، یان ئەکتەرەکان سەربەست بکات [...] خۆیان دەورەکان بۆ خۆ خۆیان هەڵبژێرن؟

٥ـ لە ساڵانی هەشتاکاندا یەکێك خەریکی دەرهێنانی دراما[...] تەلەفزیۆن بوو وتی:

ـ بۆم دەرکەوتووە لەناو یەك تیپدا هەموو ئەو ئەکتەرانە دەس[...] ناکەون کە پراوپڕی شەخسیاتە درامییەکان بن، خۆ ئەگ[...] پێویست بە ئەکتەری‌تر بوو، تیپەکە لەسەر ئەوە سوورن [...] هەردەبێت لە ئەندامانی خۆیان هەڵبژێرم ئەگەر چی‌کەم تو[...] یان بۆ ئەو دەورانەش نەشێن، لەبەر ئەوە لە پێناوی سەرکەوتن[...] بەرهەمەکاندا لەمەولا خۆم بەیەك تیپەوە نابەستمەوە، بەڵکو ک[...] هونەرمەند بۆ دەورەکان بشێت، داوای بەشداربوون لەو دەک[...] لەمەر کۆڕو کۆمەڵ و تیپێکی هونەریدا بێت.

ئەنجا ئیتر ئەو ئەم رێبازەی ئەنجام دا یان نا، ئەوە پەیوەند[...] بەخۆیەوە هەیە. بەڵام ئایا تۆ ئەم رێبازەی ئەوت بەلاوە چۆنە[...]

# جل و بەرگ و دەمامك لە شانۆی یۆنانیدا

نووسینی : ئەحمەد سالار

جلوبەرگ وئارایشت ودەمامک . هەروەک سەما و گۆرانی . لەکەرەسە ،سەرەکی وسەرەتاییەکانی هونەری درامان ، تەواوکەری ئەرک و فرمانی دەقوئەکتەرو لایەنە بنەڕەتیەکانی هۆیەکانی گەیاندن ودەربڕینن ، دەگەڕێنەوە بۆ رۆژان سەردەموساتەکانی بەزم ورەزمە ئاینیەکان،ئەو دەمانەی هێشتا وەکو دراما دۆخی تەواوەتی نەگرتبوو، نەگەیشتبوە رادەی خۆگرتن وپێکهێنان ئەو کاتانەی لەدوتۆو ناواخنی رایی کردنی بۆنەکاندابوو، لەداب ونەریت وعەنعەناتە ئاینیەکاندا ، کەواتە هەلقولاوی ئەو سەرچاوە گیانی ئاینیانەدا ، کەلەدلو دەروونی یۆنانیەکاندا چەسپی بوون، کەدلشادانی کۆمەلگاکە بەخۆشی جەژنی رەز رنینەوەوە سەرشەقام و چەقی گۆرەپانەکان دەکەوتن ، بەکەژاوەی رازاوەو رەنگینەوەو سەماوشایی و هەلپەرکێیان بوو، وئەلقەی خرۆشی سەرمەستیان دەبەست وگۆرانی و بەیت و بالۆرەیان دەوتەوە، وبەسەر دیۆنیزیۆسی خۆیاندا هەلدەدا ، هەرچۆن خوای مەی بوو، بە رادەیەک سەرگەرم و بەجۆش دەبوون تا رادەی ئالورە بوونێ ، کەتێکەل بەخوادەبوون ،وبەمەرامی چێژی خوایانە دەگەیشتن ، بەوشێوەیە چەشنەها ئەفراندنی بێ سەروسەرحەد سەری هەلدەدا ،لێرەوە هونەرەکان ئەو بارو بۆنانەیان کردەوارەی هەنگار نان . تاچاخەکانی شەشەم و پێنجەمی بەرلەزایین، کەژیان و هونەریان هاوتابوونەوەو گەیشتنە

پلەیەک کەپێشتر مرۆڤ بەخۆیەوە نەدیبوو، لەو رۆژگارانەدا کەشانۆ بوونی سەلماند، ئەو کەرەسانەی هاوکاریی بۆنەکانی جاری جارانیان دەکرد، رێگایەکی تایبەتی نوێیان لەبوارەکانی دەربرینو بیروجوانیا گرتەبەرو برەویان پێدرا، چ دەمامک وچ ئارایشت وبەرگ ... هتد .

گەلێ راوبۆچوونی جۆراوجۆر دەربارەی کاروئەرک ورەچەڵەکی ئەو توخمانە هەیە، هەروەها لەلایەنەکانی جوانکاریو هێمایی و مەبەستە سەرەکیەکانیانەوە. لەرووی سەرچاوەوە، ئەگەر جلوبەرگ وەربگرین ، یەکەمیان یادگارە دێرینەکانە، کەتاک وتەرا لێرەولەوێ لەدێرین خانەکاندا پارێزراون ، وەکەگوڵدان وپارچەسیرامیک، و نەخش ونیگارەکان ، لەگەڵ ئەو ئامازە بۆ کردنانەی لەدەقە شانۆییەکانی ئەو سەردەمانەدان ، یان باسکردن وناوهێنان لەملاوئەولای پانتاییەکانی مێژوودا ، دوەمیان بۆچوون بەهۆی بەڵگەی جیاجیاو رونکردنەوە زانستییەهاو چەرخەکان .

ئەو سەرچاوانەش هەرجێگای مشت ومڕ لەسەر کردنن ، بۆنموونە ئەو پارچە سیرامیکانەی بینراویی شانۆییان لەسەرکراوە مێژوونوسێکی وەک ( ئوسکارگ ، براکت ) لەکتێبەکەیدا کە بەناوی ( مێژووی شانۆی جیهان )ە دوودڵە لە راستێتی ئەو گوڵدانە سیرامیکیە کۆنانە بە بەڵگەی ئەوەی کەزۆربەیان دوای سەدەی پێنجەم دروست کراون ، ولەلایەکی دیشەوە سەکۆی شانۆیان تیادا دەرنەکەوتووەو بەرگی هەمەچەشنەش لەبەری کەسانی ناو وێنەکانیان دایە .

گرنگترینی ئەو سیرامیکە وێنەدارانە کە وێنەکانیان بەبینراوی شانۆیی دەچێو بەڵگەش باس ونا وەرۆکەکانیانە ، کەکت ومت پەیوەندی بە رووداویی ناو شانۆییەکەوەیە وەک ئەو پارچەیەی بەگوڵدانی ( ئەندروماک ) ناسراوەو بۆ کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەمی بەر لەزایین پارچەیەکی تر کەمێژووەکەی بۆسالی(۳۷۰)ی پێش زایین دەگەرێتەوە، لەوبەشەیدا کەبەچاکی ماوەتەوە ئەکتەرێکی تیادایە دەمامکێکی بەدەستیەوە گرتووە، یان ئەو وێنەیەی کە لە شاری ( تارنتۆم) بینراوەتەوەو ئەکتەرێکی تەراژیدیایی تیادایە دەمامکێک بەدەستیەوەیەو پارچە بەرگی بەدەستەکەی تریەوە،و یادگارەکەش بۆ سەدەی چوارەمی بەر لەزاین دەگەرێتەوە، گەلی یادگاری دێرینەی تر بینراونەتەوە .

دووەم بەڵگەمان دەقە شانۆییەکانە ـ کە لە هەندێکیاندا ئامازە بۆ جلوبەرگ دەکەن ، بۆ نموونە لەشانۆیی ـ ئەلسست ـ ی ـ یۆرپیدسدا ، کەلەپای مەرگی ـ پایدەوە بەرگی رەشیان پۆشی ، بێگومان رەش پۆشی نیشانەی تەعزیەباری بووە لەلای یۆنانیەکانیش، هەروەها لەشانۆنامەی ( ئۆدیب لەکۆلۆن )و شانۆنامەی ( فیلوکتیس )ی ( سۆفۆکلیس ) یشدا دەست نیشانی سیپالی بەری قارەمانانی کراوە، هەروەها لەشانۆیی (ئافرەتە پاراوەکان ) چ لەلای ئەسخیلۆس وچ لەلای یۆرپیدس ئامازەیان بۆ جلوبەرگی کیژانی داناوس کردووە، لێرەدا ئەم نموونەیەی شانۆییەکەی ( یۆرپیدس ) بەیاد دەکەین :

پادشا : ئەمانەی رووی زارم تێ کردوون لەکوێوەهاتوون ؟ کە بەرگێکی جیاواز لەیۆنانیان پۆشیووە، جلوبەرگی بێگانەیان لەبەردایە ؟ جلەکانتان لەهینی ئافرەتانی ئاراگوس و هیچ لایەکی دی یۆنان ناکات ... هتد .

کۆرسی کیژان : دەربارەی جلوبەرگەکانمان راستت فەرموو...؟ بەڵام چۆنی لەگەڵتا بدوێین.؟ وەک هاوولاتیەکی ئاسایی ، یان وەک نێردراوێک

کەگالۆکی هێرمیس ی پیرۆزی بەدەستەوەیە ، یان فەرمانرەوای شار ؟(١)

سێیەم سەرچاوەمان مێژووە ، بەتایبەتی مێژووی جلوبەرگی کەرووبەکی ژیارو شارستانیەتە ،گەلێک سەرچاوەهەن چ بەنووسین ، چ بەباس ، چلەبەیت و حەقایەکاندا ،و چ لەهونەرە شێوەکاریەکاندا کە یادگاری ئەو رۆژانەن ، بەتایبەتی لەهونەری پەیکەرسازیدا ، بەلام ئایە شانۆکە باس و خواسەکانی لەداستانە دێرینەکانەوە هەلینجاوەو خاوەنی هەلومەرجی تایبەتی بووە ، تاچ رادەیەک پەیوەستی بەکارهێنانە ریالیسی‌یەکەبووە ، هەر چۆن لەتوخمەسەرەکیەکانی دیدا ، بۆنموونە لە زمانی شانۆدالەئاستی زمانی رۆژانە بالاتربووە وەک لەتەراژیدیایی‌یەکانی ـ ئەسکیلۆس ـ دا ئاشکرایە ، کەواتە ئەبێ دەوروخولی ئەو سەرچاوانە بدەین کەراستەوخۆ پەیوەستی بوونە درامی‌یەکەن . هەرچۆن کەرەسەکان خۆیان لە خۆیاندا چوونەتە بارودۆخێکی نوێو تایبەتمەندی شانۆوە ، دەمامکی گەورەوزەق ، بەچەشنەها شێوەو جۆر ، پیلاوی بەرزوچەکمەئاسای درێژ ، جلوبەرگ بە شێوەیەکی جیاواز ، سینەقەلغان ئاسا ...هتد .

تێکرای گەواهو بەلگەکان ئەوەیان سەلماندووە کەبەر لەبەکارهێنانە شانۆیی‌یەکە ،بەمەستێکی پوختی ئاینی بووە ، بابەتی بەپێی بۆچوونە نوێیەکان ، کەزیاتر پەیوەستی بۆنەو جەژنە دیونیزیۆسیە گوندیەکانە ، کەپاشماوەی رۆژانێکی گەلێک دێرینە ،( فیتوپاندولفی ) لەکتێبەکەیدا ( مێژووی شانۆ) ئاماژەی بۆئەم راستیە کردووە ، بەوەی کەچۆن لەکاتی کەژاوەرایی کردنی بەخت کردنا ، دەموچاویان بەتلپەی مەی رەنگ دەکردو بەگەلامێو شێوەو روخساری خۆیان دەگۆری،هەروەها چۆن چۆنی دەمامکی تایبەتیان بۆ رەخساندنی بۆنەکە سازکردووە ، چەشنەها جۆرو جیاواز لە شێوەو رووی مرۆڤ ، بەپێکەنیناوی و نەترساو

بەلکو ناوەندی ئەو دووجۆرە ، تائەو رۆژەی ( تیپیس ) هات وروخساری مرۆڤانەی بەدەمامک بەخشی و کردیە کەرەسەیەکی گرنگی شانۆکەی، دوای بەدوای ئەم هونەرمەندە ( فرینیکوس ) هات و شوێن پێی هەلگرت ، سەرەرای ئەوەی دەمامکی شێوە ئافرەتانەی هێنایە ئاراوە ،ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە( ئەسکیلوس ) شانۆی بەگشت‌کەرەسەو تەواوکەرەکانیەوە بردە قۆناغێکی نوێو زیندووەوە برەوی پێ بەخشی بۆنموونە بە لایەنی دەمامکەوە بەرەنگەکراوەکان رەنگینی کردو هەروەها بەبەکارهێنانی رەنگە دژ بە یەکەکان زیاتر زەقی کردو واتای زیاتری بۆ دەربرین پێ بەخشی .

دەمامک : Mask، رووپۆشێکە وێنەی دەموو چاوی سەیروجیاوازی لەسەر نەخشێنراوەو دروست کراوە ، رووبەکی دی بەپۆشەرەکەی دەبەخشێ چ مرۆڤیانەو چ بالدارانە یان ئاژەلیانە .... وەیا دێوودرنجوئەنجندەو ئەوانەی پەیوەندیان بەخەیالاتە میتافیزیکیەکەوە هەیە ...هتد .

بەهۆی ئەو دەمامکەوە لایەنە سەرەکیەکانی کەسەکە دەسن نیشان دەکرێت ، فیزیۆلۆژی وبایۆ لۆژی و سوسیالۆژی ... زۆر لەدێرینا بەکار هێنراوە . دابونەرێتی بووە ، هێماوهێماکاریەک، کاتی عەنعەناتە ئاینی‌یەکە پەرەسەندو هەردوو ردکدرو وجەکەی لێ کەوتەوە ، تەراژیدیاو کۆمیدیا ، لەودەمەوە رێگای شانۆی گرتەبەرو لەلای رۆمانیەکانیش بەکاردەهێنرا ، لەقماشی ( نیل ) یان فلین یان تەختەی تەنک دروست دەکرێت ، دەموچاوو سەری دادەپۆشی وتاخوار کەردنی دەگرتەوە ، بەپرچێکی پڕ دادەپۆشرا گەلی جاریش ریشێکی درێژیان بۆدەکرد ، دەمێکی گەورە لەداویشەوە بەشێوەی بۆری تابتوانێ دەنگ کدورەکات ، چەشنی بلندگۆ ، دوو کونیشیان لە شوێن چاوەکانیا بۆ دەکرد ، ناوچەوانێکی پان و

بەرز پرچەکانیشی بەملاولایدا لەشێوەی ژمارە(٨)دا دەهاتنەخوارەوە ، قەوارەی دەمامکەکان گەورەتر بوون لەسەری مرۆڤی ئاسایی بۆ ئەوەی نمو بنوێنێو چاکتر بگەینی بەم گەورەکردنەیان دەووت ( ئونگوس ) .

دەمامک واتە(Mask) بەزمانی یۆنانی پێیان دەووت پروسوپون (prosopon)یان(prosopeion) بەلاتینیش هەر وشەی (presona) یان بەکاردەهێنا وشەی پێر بەتاکی (per) (ئەوە) دەگەیێنێ و (sonat) یش واتای بەرز دەدات بەدەستەوە . تێکرا دەنگ بڵندکار یان بلندگۆ دەگەیەنێ ، ئینگلیزەکانیش و فەرەنساویەکانیش وشەی ماسک (Mask) یان بۆ بەکارهێناوە .

گەر ئاوڕی بیینەوەی چەشنەکانی دەمامک بدەین سێ جۆری سەرەکی هەبوون ، یەکەمیان دەمامکە ئاینیی‌یە سەرەتایی‌یەکە ، بەهەردوجۆرەکەیەوە ، دەمامکی تایبەت بەمردووان ، ودەمامکی تایبەت بەزیندووان . دووەمیان دەمامکیجەنگیانە کەشێوەیەکی ترسناک وتۆقێنەری هەبوو ، جۆری سێیەمیان بەشە شانۆیی‌یەکەیە کەبووە کەرەسەیەکی گرنگی رایی کردنی هونەری دراما و باسەکەمانی پێوە پەیوەستە . لەلای یۆنانیەکونەکان چەند جۆری لەدەمامکی گرنگ وبەناوبانگ هەبوون ،وەک دەمامکی دیۆنیزیۆسیانە ، کەدیونیزیۆسی خۆیانی دەنواند ، هەروەها دەمامکی ( مدیۆسا )ی کەبەناوی یەکێکیەوەیە لەسێ خوشکەجۆرجۆنانیەی داستانیەکە ، کەشێوەی ماردابوون ، ئەمەش ئەگەرێتەوە بۆ ئەفسانەدێرینەکەی ، گوایە لە هەر کەسێکیان روانیبی بەبەردیان کردووە ، هەر بۆیە دەمامکێکی تایبەتی چاوەزار بووە ، جگە لەمانە دەمامکی ( زیوس ئاموون ) هەبووە ، ( زیوس ) ی مەزنەخوای یۆنان و ( ئاموون)ی گەورەخوایانی میسرییەکان ، واتە لەهەردوو خواوەندەکە تێکەڵ بووە ، هەرچۆن بەپێی داستانو ئەفسانە ئاینیی‌یە یۆنانی‌یەکانی وەک ـ داستانی ئایۆ ـ رەچەڵەکیان دەباتەوە سەر بەرپشتی ، ئەم دەمامکە بریتی‌بوو لەکەلەیەکی جووت قۆچ .

بەلایەنی شانۆوە ، بەرای شانۆناسان (٢٨) جۆر دەمامکی تەراژیدیایانە هەبووە ، وبەم جۆرەش ، دەستنیشان کراوون :

(٦) جۆر دەمامکی پیرانە ، (٨) جۆری گەنجانە (٣) کۆیلەیي (١١)ی ئافرەتانە ، هەروەها چوار جۆر دەمامکیش تایبەتی بوون بۆ ساتیرگەڕان ، بەم شێوەیە : یەکەمیان پرچ سپی ، دووەم ردێن دار ، سێیەم لووسکە ،و چوارەمیشیان بۆ پیرە مێردان .

بەلایەنی شانۆی کۆمیدیشەوە ، بەهەرسێ سەردەمو قۆناغەکانیەوە چکۆن ، وچ ناوەند ، وچ نوێ ،گەلێ جۆری بەخۆیەوە دیووە بەتایبەتی لەسێیەمین قۆناغیدا ، کە (٤٣) جۆر دەمامکی هەبووە ، تێکرایان گاڵتەجارنوێن بوون ، وبەزۆریش لەلای ( ئەریستۆفانیس )ی گەورە کۆمیدیانووس رویەکی کاریکاتۆری پێدرابوو ، زۆرجار ئاماژە بۆ ئەو دەمامکانە دەکرێن کەبۆ روخسارنواندنی (کلیون)ی زۆرداری ناپەسند دروستی کردبوون ، لەلای کۆمیدیایی‌یەکانی سەردەمی ناوەندی ، شێوە پێکنینەربوو ، وە لەرۆژانی کۆمیدیای نوێ دا روویەکی کاریکاتۆری وزیاتر ئەو نیمچە هیمایی‌یەی پێوەدا ربوو کە سەردەمەکە سەپاندبووی . لەرووی ژمارەشەوە ( ٩ ) جۆر دەمامکی پیرانەو (١١) جۆری گەنجانە ،و (٧) یش بۆ کویلە ، لەگەڵ (١٤) دەمامکی ئافرەتانە شانۆی کۆمیدیای رازاندبووەوە ، بەم شێوەیە بەرادەیەک دەمامک بوونی چەسپ وپەیوەستی بوونە شانۆییەکەبوو کە نەدەتوانرێ دەست بەردارو دابڕبێ لێی . وەک ، سزانراویشە کە ئەکتەرێک چەندەها کەسی شانۆییەکەی یاری دەکرد ، جگەلەوەی کەسانی وەک خوا

ەندان و بوونەوەرە خەیالییەکانی دوتۆی ستانە دێرینەکانی دەنواند، دەمامک دەبووە ریدەدەر چ بۆکاری ئەکتەریی و چ بۆ ئەرکی رایشت، کەواتە وەک ئەرک ئاسانکەرەو لە ەمان کاتدا خەون هێنانەدی ئەکتەر، چونکە ەمیشە ئەکتەر خەون بەوەوە دەبینی کەژمارەیەکی ۆر لەکەسانی شانۆیی یاری بکات ئەم رێگایەش ەوبری کردنە بۆی. لەگەڵ ئەوەشدا شێوەو ەحشەو بیناسازی شانۆی ئەودەمە، بەوهەموو ەرەوەی کە کەمشانۆ بەخۆیەوە دیویە، مەگەر ۆژانی ئەلیزابیسی لەو ئەندازەیە نزیک بوو ێتەوە، کەواتە بەپێی کات ورۆژەکەو شوێنەکەش ەوو گرنگی بەهۆیەکانی گەیاندن بدرێت تا ەکتەربگاتە هەموان، چ جولاندنەوەی فراوان، چ گەورەکردنی قەوارەو چ زەقی لەرەنگەکاندا و وانا لەهونەری دەمودوو دەنگدا، بەڵێ لەبەر ەوەی ئاوەربرین بەدەموچاوی رووتی مەحال بوو کات بۆیە دەمامک ئەم ئەرکەشی لەئەستۆ گرت.

ەبێ ئەوەشمان لەیادنەچێ کەبەردەوامی گەیاندنی گیانە ئاهەنگ سازییەکە، وەک لایەنێکی گرنگی هونەریانە، لەرووی گۆڕانکاریی‌ویارمەتی بێشەکەی ئەکتەر وەکو بەردەوامیەکی گەرا و ئاهەنگە بنەڕەتیەکەشە.

جل وبەرگ :

جلوبەرگ کەرەسەیەکی دێرینی هونەری شانۆیە، هۆیەکی بەهێزکەرو یاریدەدەرە بۆنەخشاندنی کەسەشانۆییەکەو دەربڕین، دەست نیشانی کات و سەردەمو شوێن وپلەوپایەو باری دەروونی خاوەنەکەی دەکات، بەڵکو هۆیەکە لەرێگایەوە ئارەزای گشت لایەنەکانی دەبین، وەک لایەنێکی گرنگی بینین گەلی مەبەست دەگەینی، گریکیەکان لەگەڵ ئەوەدا کەگوێیەکی ئەوتۆیان بەدیکۆر نەدەدا جگە لەبەکارهێنانی چەند کەرەسەیەکی ساکارو ئاسان گوێزەرەوە، گرنگیەکی باشیان بە جلوبەرگ ئەدا، بەرای شانۆناس ( فرانک م.هوار تنج ) گوایە گەواهی ئەوتۆمان بەدەستەوەیە کە لەئەندازە بەدەر گرنگیان بەجلۆبەرگ داوە ـ، پاڵەوان لەشانۆ تەراژیدییە یۆنانیەکاندا پێڵاوی بەرزودرێژی لەپێ دەکرد، وعەبایەکی دریی درێژی پەشانیا دەدا و دەمامکی دەپۆشیو بەم شێوەیە بالایەکی بەرزوبلندی دەبوو نزیکەی حەوت پێ درێژیی، بەرادەیەک کە لە مرۆڤی دوور دەکەوتەوەو دەچووە شێوەی خوایەکانەوە. لەشانۆ کۆمیدییەکانیشدا شێوەیەکی سەیروهێنەرە پێکەنین و گاڵتەجاڕی بەکەسەکانی دەدرا، رۆژبە رۆژ بڕەو بەجلوبەرگ و تەواوکەرەکانی دەدرا، بەم شێوەیە مێژووی جلوبەرگی شانۆی بەر دەوام بو تا ئەو رۆژانەی جێگرەوی هاتەجێ وەک ئارایشت لەبری دەمامک... ئەمەش دەگەڕێتە وە بۆسەدەی ( رێناسانس ) واتە بوژاندنەوە رای زۆربەی شانۆناسان وایە کەبەرگی ئەکتەری تەراژیدی لەشانۆی یۆنانیی کۆندا لەدووبەشی سەرەکی پێکهاتبوو، یەکەمیان کراسێکی کورتی رەنگین کەپێیان دەووت ( پیلیکۆس )ودووەمیان کراسێکی ئاودامان بەمەشیان دەووت (ئیپلیما ) جگە لەبەکارهێنانی ( کوسرونوس ) لەگەڵ ( ئونگۆس ) کەبەمەبەستی بۆشناغی پێدانی ئەکتەرەکە بەکاریان دەهێنا، بەڵێ بەروانکەیەکی ناوداریان لەسینەدەکرد وەک سینەقەلغان،واتە ( پرۆستر نیدیۆن ) جگە لەورگی ئاخنراو کە لە سەر سکیان دەبەست ،وپێیان دەووت (پروگاستر یدیون ) ، گەلێ جار کراسێکی تریشیان بەسەرا لەبەردەکرد کەبە ( سوماتیون) ناودەبرا، کە سەراپای لەشی ئەکتەرەکەی دەپۆشی، جورێکی تریش هەر کراسی ئاودامان هەبوو، واتە ( پیلیوکوس ) کەجوتی قولی درێژی سەرقۆل دارهو لەسەر سینەشیان سینەبەندێکی چەرمینەیان

دەبەست ( ماسخالیستی ) تاهێزو بزرگی بە خاوەنەکەی ببەخشێ .

لەبارەی عەباوە چەندجۆری چەشنەها رەنگ، درێژونا وەندی وکورتیان بەکاردەهێنا ، ئەوجۆرو چەشن ورەنگانەش پەیوەندی بەپلەوپایەی عەبا بەشانەکەوە هەبوو ، بەهەمان شێوەش جۆری کراس پەیوەندی بە لەبەرکەرەکەیەوە هەبوو ، بۆنمونە: ( کروتوس ) کراسێکی درێژی رەنگ زەردبوو ، ئەم نیشانەبوو بۆ ( دیۆنیزیوس )یان( کیتیس ) کە رەنگ ئەرخەوانیەکی سووربا وبوو ، تایبەتمەندی شاهان بوو ، شاژنەکانیش ( کسیتیسا )یان دەپۆشی کەکراسێکی سووربوو ، وە چەمکێکی درێژی لەدواوە لێ دەخشا ، لەگەڵ ئەمەشدا سپی ساکاری داوێن ئەرخەوانیشیان لەبەردەکرد ، کەبە (پیریوفیروس ) ناودەبرا .

بۆ زۆربەی کەسەخواییەکان بەرگی ( ناڤار ) بەکاردەهێنرا ئەوبەرگەی کەپەیامبەرەکانیش دەیانپۆشی ، بەرگێکی سپی بێ گەردو ساکارو لەخوریی شێکراوە دروست دەکرا و لەلەشی ئەکتەرەکەوە دەپێچرا . بۆ جەنگاوەران وراوچیان وکەسانی دی ، هەریەکە بەپێی پێشەو کارەکەی ئامێری یان هێماو نیشانەیەک بەکاردەهێنرا کە کارەکەی پێ بناسرێتەوە . هەربۆیە نێچیرەوان و جەنگاوەران ( خلامیدا ) یەکی ئەرخەوانییان بە دەستەوە دەگرت وپێشیان دەووت ( ئیباڤیتس ) .

وەک باسمان لێوەکرد جلوبەرگی ئەکتەرانی تەراژیدیا بەرازاوەییو جوانکاریی و گەورە نوێنی لەجلوبەرگی بابەتی کۆمیدی جیادەبویەوە ، ئەو جیاوازیەش چ لەرووی بایەخ پێدان و چ گەڕانەوەی بۆ بالاّ بڵندیی بابەتەکەی ئەگەر بێینە سەرباسکردنی.پۆشینی ( ساتید)ی(سیلینی) یەکان کەدەست وپێوەندانی ( دیونیزیۆس ) ی ئەگرتەوە ، گەلێک ساکار و جیاوازبون وەک بارو لایەنە ئاینییە سادەو بێگەردەکە .

بۆ (ساتێر)ییەکان ، شەرواڵێکی خوری بوو لە ناوقەدا دەجەرێنراو کلکە ئەسپێنەی پێوەدەکرا کەهێمای ئەبدامی نێرینەیی بوو ، جگەلەمانە ( خورتابوس ) کەکراسێکی تا بان ئەژنۆبوو لە ژێریەوە شەرواڵێکی درێژ لەپێدەکرا قاچ وقولی ( سلینی)یەکانی پێ دەشارایەوە و زۆرجاریش کەولێکیشیان بەسەرشانداەدا . لەسەرو ئەمانەشدا دەلوا کراسێکی نەخشین ( سیرایون ) کەرەنگینیش بوو لەبەربکرێ ، ئەوسا پێی دەوترا ( ڤینیکون ئیماتیون ) .

بەلایەنی جلوبەرگی کەسانی کۆمیادیا نوێنەوە هەروەک خاسیەتی بابەتەکە زیاتر نزیکوپەیوەستی جەرگەی ژیانە رۆژانەکەبوو ، بۆیەدەبوو بەهەمان شێوەو جلوبەرگیانەوە ، کەراستەوخۆ لەژیانەوە وەرگیرابوو بەکاربهێنرێ . بۆیە ( ئەرستۆڤانیس ی مەزن نووسەرو دەرهێنەرو داهێنەر لەجیهانی کۆمیدیادا بەم هەنگاوە هەڵساو هات ولەپێناوی لایەنە گاڵتەجارییەکاندا مەبەستەپێکەنینهێنەرەکەیدا کەمێ گۆڕانکاریی تیادا دروستکرد ، تا نزیک بە شێوە کاریکاتۆری بخولقێنێ ، بەڵێ چەند جۆرە بەرگێکی بەناوبانگیان هەبوو ، لەو بەرگانە ( ئەمفیماسخالۆس ) کەبەرگێکی پیاوانەی قولداربوو ، تایبەت بوو بەئازادان،و (ئەکزۆسیس) یش کراسێکی تاک قۆل بوو کۆیلەکان لەبەریان دەکرد .

لەکۆمیدیا هەروەک تەراژیدیا هەرکەسەهێمایەکی تایبەتی بۆ ناسینەوەی پلەوشوێن وپیشەی هەبوو ، بۆنموونە بۆهەر خواوەندو نیشانەیەکی تایبەتی قەلغان بۆ جەنگاوەران ، شمشێروکەوان ، بۆ قارەمانان ، سەولەجان بۆ شاهان ، گالوک بۆ پیران ، بەگشتی هیمای هاوبەش وەک :

سور بۆ لاوان ، سپی بۆ کۆیلە ، خۆلەمیشی ورەش بۆ مشەخۆران ، سەوزوشین بۆ بەساڵاچووان ،

جیاوازیەکی تر لەنێوانا ئەوەبوو پیرانی ناو تەراژیدیا داردەستێکی راستیان بەدەستەوە دەگرت ، بەڵام بۆ پیرانی نێو کۆمیدیا دارێکی خواروخێچ ، هیمای نزاکاران و پاراوەکان ئەو جیلکەوچلە دارانەبوو کەشێتاڵی سپی پێوەبوو و بەدەستیانەوە دەگرت ودەیان شەکاندەوە ، بۆ کەسانی مزگێنی دەر یان بۆ ئەوانەی بۆ جەژن یان لێوەی هاتبوونەوە ، تاجەگولینەیان لەسەر دەنا ، کاتێکیش کۆیلەکە بۆ کوچ وگەشت بەوای سەروەرەکانیانەوە بوون کول بەکول بوون یان کەلوپەلیان لەسەرشان دەنا ، بەوەدا دەناسرانەوە جوتیارەکانیش تیلایان بەدەستەوە دەگرت و کەولیان دەپۆشی و توورەکەیان هەڵدەگرت . مشەخۆرانیش قاپەڕۆن وکەول .

لەبارەی کالەوپێلاوەوە ، وەک زانراوە لە شانۆی تەراژیدیدا ئەکتەر پێلاوی بەرزی لەپێ دەکرد کە لەداروتەختەی چەند رەنگ دروست دەکرا وتایبەتمەندی ئازادەکان بوو ، پێیان دەووت ( کوثورنوس ) ، کۆیلەکانیش سۆلی نزمیان لەپێ دەکرد . دکتۆر جەمیل تکریتی لەکتێبەکەیدا ( قراءەوتاءملات فی المسرح الاغریقی) لەوبڕوایەدایە کە ( ساتێر )یەکان بەپێ خاوسی نمایشیان دەکرد . هەرچەندە لەشانۆی کۆمیدیدا پێلاوی ئاسایی بەکار دەهێنرا ، لەو کەوشانەی کە بە جۆری پیاوانەیان دەووت ( ئفادۆس ) لەگەڵ ( ئکونیکە )و بەژنانەکانیشیان دەوت (کۆسۆرنی)و برسیکە ) .

لەبارەی کلاویشەوە بەزۆری رێبواران ونێردراوان لەسەریان دەکرد . بەپێی عیرف وعادەت گەر ئافرەتیش بچوایەتەدەرێ بەقۆچکەی پاڵتۆکەی سەری دادەپۆشی کەبە ( کریدمنوون ) ناودەبرا . بۆ رازاندنەوەی سەر گەلێ رازیندەرەوە بەکار دەهێنرا و هونەری تیادا دەنوێنرا . وەک ئەو تۆرە تەنکەی پرچی کۆدەکرایەوە ، واتە ( نیکروفالوس ) یان ئەو دەسرۆکەیەی لەناوچەوانیان دەبەست کە ( میسرا )یان پێ دەووت ، هەروەها چارشێو یان پۆشەشیان بەکاردەهێنا کە لەپشت ملەوە بەسەر روخسارا دەهاتەوەو پێیان دەووت ( کالوبترا ) .

( ڤیتوپازدولفی ) زانای شانۆناس ئامازەی بۆ گرنگیی وحەقیقەتی ئەم هێماکاری و نیشانەدارییە کردووە کەجون تەراژیدیای بەتایبەتی بایەخدار تر کردووەو ریالیستیەتی بەهونەری شانوو نمایش کردن بەخشیوە . لەئاکامیشدا ئەو راستیەمان لە بارەی بەکارهێنانی ئەم کەرەسانەوە چنیەوە کە یەکەم چوونەوەو سەر رەچەڵەک و بۆنەو ئاهەنگە ئاینییەکان و دووەم هەنگاویشە بۆ نزیککردنەوە تاباشتر بگات بەوەرگرەکان .

سەرچاوە :

- جیمیس لافر - الدراما ازیاءها ومناظرها - ترجمة مجدی فرید - مراجعه - سعد الخادم قاهره-١٩٦٣
- تحیة کامل حسین - تاریخ الازیاء وتطورها الجزء الاول - قاهره .
- د. محسن الخشاب - تیاتروالقدیم - قاهره ١٩٧١
- اسکار. گ . براکت - تاریخ تئاتر جیهان - ترجمه - هوشنگ ازادی - جلد اول تهران ١٣٦٣شمسی
- فرانک م . هوایتنج - المدخل الی الفنون المسرحیه - ترجمه - کامل یوسف ، رمزی مصطفی محمود الساع ، درینی خشبه ، مراجعه ، حسن محمود سعید خطاب - تقدیم سعید خطاب - قاهره - ١٩٧٠
- فیتوپاندولفی - تاریخ المسرح - ترجمه الاب الیاس زحلاوی - ج -١- دمشق ١٩٧٩
- د. جمیل نصیف التکریتی قراءوتاءملات فی المسرح الاغریقی - بغداد - ١٩٨٥ .




ئەحمەد قەرەنی

**دیمەنــی ئێکــــێ**

**دیکور** ( شانۆ ، جهەکی چیایی‌یە، گوندەکی بچووك ل کێلەکا شکیرمکی ئاسێ ۰۰۰ پەیکەرەکی زڤروکی ئەسمەرەکا کراس‌کەسك فستان سور، ئیلەك زیرین و شالەکا سپی لپشتی ۰۰ ل ناڤەراستا دەبی شانویی‌یە، جوت کەزی ل سەر ملان‌دا هاتینە خـــــواری. دەستی چەپی دایە بەر پەرچەماخوە ب وی نیازی کو هەلدەتەڤە ۰۰۰ )

**چەتین** : ( کلاڤەکی تەحتی لسەری‌یە و کەپەنەکی لبەر ، تێتە ژوور ، خوە بۆ ئەسمەرێ دچەمینیت ۰۰۰ جهی خوەل نیزیـــــك پەیکەری دگریت و دروونتە خوارێ ، بلوورا خوە لبەر شتا خوە تینیتە دەری و ئاوازەکا نەرم لی ددەت ۰۰۰ )

**قسمکەر** : (دیارنی‌یە ، بەس دەنگێ وی تێ ۰۰ )

ئاواز ژ پەیڤی راستگوترە ۰۰ چیروك ، روودان ، داســـــتان، سەرپیهاتی پی تینە دەربرین ، راستیا هەرە پێشینا مللەتـــی مەد سەلیقەو سازبەندیاوی دا خویایە ۰ دەولەمەندیا مە دڤـــــی رەوشی دا نیشانی رەسانەتی . پابەبەرزی ، پیشڤەروویــــــی، مروڤحەوینی‌یا مەنە ۰۰ لی ساخڤە کرن ، دویڤچوون . ڤەکولیـــن دکێمن ، ئان هەر نی‌نە ، لەوما ئەڤ سنکەپێ‌یە دکاروانی ژینـــی دانەیا رەوا و عادلە ، لێ ئەمێ بێ یەکو دوو حەق و حسێبێن وێ ددەین ۰

کورد ، دکارن ب بلووری ، دگەل یەکو دوو باخڤن‌و سەرپیها-تیین کەڤن ژی ڤەگیرن ۰۰

ما دەربرینا هەستان و ڤەگێرانا بوویەر و روودانان ب رێیـــا موزیکی!! نە بلندترین پەیسکا مەعریفەت و بلیمەتیێ‌یـــە ۰۰۰

ئەم خەلکی چیاینەو دەسپێکا ژینا مە ژی وەکو یا هەموویـــــان شڤانەتی بوویە ۰ دی گوهـ بدەنە ڤی شڤانی کاچ ئـــــــــاوازن دلورینیت ۰۰۰ چێ دبیت هوونین نهو دناڤ باژار ڤانیـــــــا مودرەن‌دا دژین نزانن ئەوچ دبێژیت ۰۰۰ بەلی هەر شڤانەکی کورد ل چیایی گارەی ، ل دەشتا هەڤلیری ، ل شنگالـــــــــێ ، ل جزیرێ ، ل دێرسمێ ، ل ئەلەگەزێ ، ل سومایێ ، ل بوکانـــێ، ل هاورامان ۰۰ نهو بێتە ڤیرە دی ژومرا ڤان ئاوازان شروڤەکەت و بیژیت :

ئەڤ شڤانەیێ دبیژیتە پەزی خوە بەلاڤبن و بچەرن ۰۰
ئەڤە بیریڤان هاتن ، ژ دوور ڤەرا دیارن
ئەڤە نیزیکبوون و ئەوا هەنی یا ژهەموویان جوانتر ئەزی براموسم
ئاخ چبکەم ئەو دلبەرا کولپەری خوە نادەتە دەستی من ۰۰
هەرۆ حەسرەتا من ئەڤەیە ۰۰۰ دلبەندی وێ مە ۰۰ لێ بیریڤان تێن و دچن هەچکو ئەوب ڤی ئاگری ددلی من دا نزانن ۰۰ لێ حالی مە هەژارا هەر هوسایە ۰۰

**چەتین** : (ئاوازەکا دی هیدی دەسپی دکەت )

**قسمکەر** : هەر کەسانی دژینا کوردەواری و ئاواز و سەلیقیـــــن وان‌دا شارەزا بیت . نهو درانیت کو ئەڤ شڤانەیێ دبیژیت :

هەر سال بهارا وەلاتی من هوسا یا شینە
ئیڤارە دي بەس بچەرن
بیریکی سەررەڤیڤان دێ سەری خوە بهەلینە
بەسە ٠٠ ئەڤە روژەکادی یا خەمگین
لسەر مەدا بوری ٠٠ دا بچینە ڤە ٠٠٠

(ئاواز بەردەوام دبن ٠٠)

**قسەکەر** : شڤانو دي ئاوازان بلورینە
کوردا ژ خەوا گران بهەستینە

ئەرێ ٠٠ براینۆ دەسپێکا مەیا درستە و ئەم مللەتەکـــــی حوامیر ، خوە جھ ، ئاشتی پەریسین ٠٠٠ لی بەردەوامبوون یــا ئەو ویپێویستە ٠٠ ئەو ئەرك و کاری مەیی ئەڤرۆیە ٠٠ بەلـــی دومکرنا ڤان بزاڤان کا ٠٠ کا؟؟
ژینامە گەمیەکا وندایە
مانەوەختە ب کەنارەکی رابگەهینین ٠٠
مانەوەختە ،مانەوەختە
ئەڤ پەیڤە دگەل ئاوازا بلویری دووردەکەڤن، و دگەل داکیشانا پەردێ پەیڤ نامینن لی ئاواز بەر دەوام دبن ) ٠

**دیمەنی دوویی**

( دگەل دومکرنا ئاوازان ، پەردە ڤەد بیت ، دیکور هـــەری سەری یە تەنها گوند مەزنترە ٠٠)
**رەشو:** ( زەلامەکی ناڤسال چوویە ، سوهن خورتە ، جلکین کاری گونداتیی لبەرن ،کلاڤ و دەرسوکەکا ریڤن ، شەروال و فوتکەکـــی دڕیای ٠٠ تیتە نیڤا دەبی شانۆیی و پر حیبەتی دگەل ئـاوازان دچیتە خواری ٠٠)
هەی لۆ هەی لۆ ، هەی لی ٠٠٠ ( دور پەیکەری دزڤریت ودەست پێ ددەت ٠٠)
**قسەکەر** : ( ئەڤ ئاوازە پر ژ دلی رەشوی خوەش تین ،چونکـــی سەر پیهاتیا گەلەکین وەکو وی یین هەژار ڤەدگێریت کو چـاوا بابکالکی وی یی بەرێ ژ بەر ئەگەرەکا خویندارێ ژ بـــازاری خوە ل باکوورا وەلاتی هاتینە بەر کێلەکا ڤی چیایی مەزن و خوە جھ بونە ٠٠ ئانکو فەرمانا مالباتا وان هاتبوو راکرن ٠ فەرمـان، پەیڤەکا بچووکا کریار مەزنە ، پرانیا فەرمانێن سەبـــارەت ب کوردان دەرکەتین ژ بو ڤرکرن و سوتن و تالانان بوونە چ ژ ئالێ سولتان و پاشایان ڤە، ئان ژی گەلەك جاران چاخی دوو ئوجاغان شەر کربا ، دافەرمانین یەکو دوو راکەن ، ئانکو بریارا ڤرکرنـــا یەکو دوو دەن ٠٠٠ لەوما ، نها ، پەیڤا فەرمان دناڤ فەرهەنگـــا کوردی دا ب رامانا نەهیلانا یی بەرامبەرتی زانین ٠

نها ئەڤ ئاوازە یا دبیژیت :
خوین هاتە ریژتن ، خەلکـــی کاچ و کلوسکین خوە هەلگرتن و زار ی خوە دانە بەراهیا خــــوە ،

جیهانەکا بی سەرو شوین ڤوناخا وانە ٠ حورمەتبلندیا مروڤـــی و ئەڤینیا وەلاتی ژ ریزگرتنا خوینی یە ٠٠ چونکی ئەوکاکلا ڤـــی ئاخی و ژێدەرا ژینی یە ٠٠
ئاخ ٠٠ خوین ل دارو بەران نەکەڤیت ٠٠
و ئاواز تێنە گورین ونزم دبن ٠٠)

**رەشۆ:**
ئەی یارۆ
دێ بلورینە
دیروکا خەمان ژ خەلکیرا ڤەگێرە ٠٠
روودانین وێ
دستارەکی جوانی هێرە ٠٠
جوتیارەکم
ژڤێ ئاخی سرست بوومە
هندی هەمە
هەر عاشقی
چیایین خوەمە
( هیدی خوە دچەمینیت و
٠٠٠ ب هەردوو لە پان هندەك ئاخـــــی
د هەلگریت )
چما هەچیی ئاخەك هەیی و
قووەت نەیی
دەر بەدەری کولانایە ٠٠ ؟؟
دیلی ئیش و زیندانایە
هەر چەن سالان
میڤانی میری مرنی و کریتیایە ٠٠

( دەستین خوە هیشتا دگڤیشیت و هندەك ئاخ دبەردا دڕژییت٠٠)
هو خەلکینو
چاخی من پەسنا یارا خوە دکر
من دگوتی
چەن بیهن خوەشی هندی ئاخی
رند و جوانی هندی ئاخی
تام شرینی هندی ئاخی
و چاخی من پەسنا ئاخا خوە دکر
( دەستین خوە دگڤیشیت ، هەتادگەهنە یەك و ئەو ئاخ هەمـــوو دڕژییت ٠٠)
من دگۆتی
تو ئەڤینی ، چەن شرینی بەر دلی من ٠٠ وەکو یاری
تو روناهی ، چەن نیزیکی ژ چاڤین من ٠٠ وەکویاری
( هیدی درونیتە خواری و ل سەر چوکا دەمینیت و دەستیـن وی یین بلندن وەکو دوعا کرنی ٠٠)

**بەدرخان** : ( زەلامەکی سیماح خوەش و ریھ تراشی یە شالـــو شەپکین مرادخانی لبەرن ، جوت دەرسوکین ب رویســـی ل سەرینە ، کوپالەکی زراڤی د دەستی دا ، ئاڤری یین تورە بوونێ ژێ دیارن ، لەوەندی یێن خوە ڤەدکەت و د پێچیتەڤـــە ٠٠ و هنداڤ سەری رەشوی دراوەستیت )
ئەڤە چ پەیڤێن مەزنن
هوسا د ئەردی دا دچن
جوتیارەکی پیسی ریڤن

( کوپالێ خوە ل دەرسوکێن وی ددەت و تاڤێژیت)
هزر دکەت شاشکاوی پیلاڤی من وەکی هەڤن ٠٠
(ب دەنگەکی بلند دکەتە گەنی و سمپلین خوە باددەت و دهیت ؛ دچیت و خوە دزڤرینیت ) :

هوون من ناس دکەن
نەڤیی کاوەیی ئەزم
خودانی گوند و بازاران ئەزم
مەزنی کەلهـ وتالاران ئەزم
میری زەمانی ئەزم
شەرکەری دەورانا ئەزم
(دچیتە ویڤە و جارەکا دی دراوەستیت ) :
کی جارەکی خویك نەدایە ؟
من فنجانەکی خویناوی ژ سەیی خوەرا نەئینایە ..!؟
کی جارەکی دزیەك کریە و
یان تالانەك ژ خوەرا بریە ؟
ئەگەر سی پشك ل بەر دەری من نەداتایە ..!؟

جیّ مەجیّ جوانییّ یە
کەنگی جوانەك هەبوویە و
من شوخ و شەنگیاوی نەکێشایە ونەپیڤایە ..!؟
ئیڤاریەکی لبەر بەژنامن نەرازایە ..؟
( تیت و دچیت و سمیلین خوە باددەت ، هیدی رەشو پاشگـــەر دبیت .. )
هوون من ناس دکەن
شەپال ماك و خودان خاك و رەسەن پاکم
ملکی خوە ب نیڤا دنیاییّ نادەم
ژ ترسا خوەدی نەبا
جو جاران پیلاڤی سولتانا ماچی ناکەم ..!

(دەستیّ بەدرخانی ب سمیلین وی ڤەنە .. سیّ زەلامین چەکدار تیتە ژوور ، دبەر هەڤن خوە پاڤینە بەدرخانی لی ئەو پشـــــت و پشت دچیت و هیبەتی گازی دکەت ) :
خائین رەشو
خائین چەتین
خائین بەکو
ئەڤە روژا قەومانی
روژا غیرەت و مەیدانی
( رەشو و چەتین و بەکو وکومەکا زەلامان لپشت دراوەستن ، لی ئەو نیزیکی پەیکەریّ ژفروك دبیت و شلاّ سەی ل پشتـــــاویّ ڤەدکەت و بلند دکەت ) :
تەسلیم ، تەسلیم
سەر بەختی هەوە تەسلیم تە ... سلیم
(ئەو شاپا زەلامان ب سەریکدا دچیت و پاشڤە دچن ..)
( ئاوازا سترانا بابی لالو دەسپی دکە )
پەردە تیتە ڤەکیشان

دیمەنی سی یی

( دگەل دومکرنا ئاوازان ... پەردە ڤەدبیت .. دیکور لمیلانە کا بنار چیایی یە ، ژ دوور بازارەك دیارە . ئەسمەر بەهتی یە . سی سەرباز و یەکی ئەفەندی ویڤەتر ب بەترانیڤە درووننشتی نە سوحبەتەکا توند دکەن ...چەتین ورەشو و بەدرخان لبـــــەر خزمەتا وانن ، دوو ژن تیّن و دچن هەر وەکو خزمەتکاریـــــــن خزمەتچیيانە . )

( کابرایەکی دەفەکا ب ملی ڤە و ژ رەخی شانوّیی تیتـــــە ژوور بلەز دبوریت . )

عەگید: ( جحیلەکی بەژن بلند و سەرکوتە ، شەلوالەکـــارەش وکراسەکی نەقلی سپی دبەر دایە ... دووسی جاران تیت و دچیت ... )
دنیا تەلهـەکا بیبەختە و ئەز نیچیرم ،
بێلە خوە دناڤ پوراتەدا ڤەشیرم ،
دبیدەنگیا رەشاتیی دا
هەر ئاسوبا لی بنیرم
جوانیاتە روژ هەلات و روژ اڤابین وی دەریّ-
نە ..
مینا سدنتین بانە و روما
تەڤ ئالین وی باخچەوریّ نە ..
( شوون پی دژڤریت و دنیرتە ئەسمەری ..)
روگەها کەش
تاجا سەری ژنەکا رەش
(سیڤەکی ژ بەریکا خوە دەر دبیت ...)
چ جارەکا
سیڤا عشقی
من ئاڤیی لسینگی تەدای
سەری روژییّ ل هەوا ڤەدگرت ..

سیڤ دپەرتی
من دەندك د هەلکرتن بوّ ڤانەکادی ...
( زکور وی سیڤی ل سینگی ئەسمەری ددەت ... دگەل دەنگی هەر دووژن سەر سوورما دمینن . چەتین و رەشو وبەدرخـــــــان چاڤەری دکەن .. ئەو جار زەلام تینە پیش و بزاڤا گرتنـــا وی دکەن .. لی ئەو خوە نادەنە دەست و وەکو ماسیی ل نـــــاڤ دەستان دا دچیتە دەری . مستەکا ئاخی دهەلگریت و ماچـــی دکەت و تاڤتە ناڤچاڤین وان . ومستەکا دی ژی هەر وەســا .. ئەو زەلام سندی پی خوە دکیشن و پشتین خوە ددەنە یـــەك و وەکو کوران لدویڤ دکەڤن و وەکو بالیە سەما گەرم دبیت وچـــو زەفەراب عەگیدی ڤە نابەن ... چەتین و رەشو و هەر دوو ژن ژی خوە ددنە دگەل وی . و هوسا دبنە دوو جوین ، دوو سەنگـــەر ... سەما خوەشتر دبیت و ئەو زەلام پاشگەز دبن و درەڤـــــن و ل دەبی شانوّیی دەر کەڤن بەس دەستین وان دمینن .

سەما ب کوتایی دهیت .. دەستان دناڤ یەکدادگـــــرن و بلند کەن
ئاواز تینە ڤەبرین و پەر دەژی تیتە ڤەکیشان .

تیبینی :

١- ئالیکاری ساز بەند دکاریت دەستکاریی د ئاوازان دا بکەت ، ئان ژی تشتین نوی دانیت . هەلبژارتنا ئاوازان لدویـــــڤ گونجاندنا دیتنوکان بیت .
٢- دەر هینەری ئازادە .. کو ئەو ئەسمەر چ پەیکەر بیت ئـــان کچکە کا زیرەك و دەستهەل بیت وی دەوری ببینیت .
٣- سەما بالیە و ئاوازین ب کیرهاتی کو دگەل بینە لیــــدان تشتەکی فەرە .

# دیلاکر واو





## قوتابخانەی رۆمانتیکی لە هونەردا

نووسینی : دارا محمدعلی

شاری پاریس هەر لەچەرخی نۆزدەمەوە ببوو بە مەڵبەندێکی جیهانی هونەری . هەروەکو شاری ( فلۆرەنسە ) لەچەرخی پازدەدا و شاری ( ڕۆما ) لەچەرخی حەڤدەمەوە ، هەروا بێتەوە مێژووی فەرەنسا لەوەتی شۆرشی فەرەنسا بەرپابووە چەند زنجیرەیەک لەباسای شۆرشگێرێتی بەچاوی خۆیەوە بینیبوە ، بگرە هەر لەقوناخەکانی هەوەڵیەوەو لەسالانی (١٨٣٠ – ١٨٤٨ – ١٨٧١) شەپۆلەکانی هونەریش یەک لەدوای یەکەوە ئەم قوناخانەی گرتە باوەش و نشوونمای پێ کرد .

یەکەم شەپۆلی هونەری کەڕوویدا شۆڕشی هونەری هونەرمەند ( دیلاکروا– ١٧٩٨ –١٨٦٣) بوو ، کە لەدژی هونەرمەند ( داڤید )و قوتابخانەکەی کلاسیکی نوێ (New Classic) وەستا .

لەدایک بوونی :

ئۆژێن دیلاکروا – EvqeneDeíacroíx - ساڵی ١٧٩٨ لەدایک بوو . دایکیشی ( ڤیکتۆریا ئۆبێن )کەساڵی ١٨١٤ دونیای جێهێشتووەو مردوە .

هونەرمەند دووبراو خوشکێکی لەخۆی گەورەتری هەبووە . ( هنرییت – هاوسەری ( رایمۆند دی ڤێرنیناک ) حاکمی لیۆن بووە . شارل هنری – کە بوو بەژەنەراڵ وبارونی ئیمپراتۆریەت . هنری

سەربازبوو و لەتەمەنی (٢٣) ساڵیدا لەشــــەری ( فریلاند ) هاتە کوشتن .

گومانێکی زۆر لەوەوە دەکرێ کەوا ( شــــارل دێلاکروا ) باوکی ڕاستەقینەی دێلاکراوی هونەرمەند و هەلگری ناوی بێ . بەڵکو پەنجەی ڕاستــــی بـۆ ( تالیران ) رادەکێشری کە هونەرمەندی بلیمەت و بەهرەدار کوڕی ئەوەو ناوبراو باوکــــــــی حەقیقەتیتی ، چونکە ئەوەی زانراوە ( شــــارل دێلاکروا ) بەدەم دەردێکی پیسەوە دەیناڵانـــدو دەتلایەوە ، بۆیە لەساڵی ( ١٧٩٧) دا کەوتۆتــــە ژێر مەقەست وچەقۆو کێردی نوژداروپزیشکـــان

بەڵکو بتوانن دەردەکەی بن بڕبکەن و رزگـــاری ببی . بەلام هەموو هەوڵدانێکیان بێ سوود دەبێ دیمەن وروخساری شارل بەدەم ئەم دەردەوە هــەر وەکو ژنێکی سک پڕبێ ئاوا دیاربوو هەتا ژیانـــی سێکسی سروشتی لێ قەدەغەکرابوو. پازدەساڵــــی رەبەق هەرلەبوونی منداڵی سێیەمی ( هنری)یەوە ، ئەو دەردە تاڵە یەخەی بەرنەدا و سەرجێوبالینگا نی ژنو مێردایەتیش ئەوە هەرهیچ .. کەوابــــوو شتێکی زۆر دوورە واقیعە شارل ببێ بەباوکــــی هونەرمەند ( دێلاکروا ) ئەمەو هونەرمەندی مـــەزن هەر لەژیانی منداڵی‌یەوە تووشی چەندەها کۆسپ و تەگەرەو کارەساتی سەیر سەیر ببو . بەتایبـــەت ئەوەی کەباسمان لێوەکرد ئەمە ببــــوو بـــە مەسەلەیەکی دەروونی کوشتینەرو بەخاڵێکی رەشی ڕۆژانەی ژیانی . ئەو کەسەرەهەرمایەوە تالەگەڵ گیانی خۆیدا بەخاکا سپاردی .

دێلاکروا خاوەن لەشێکی لاوازو بێهێزبـــــوو ، جارێکیان هەندەی نەمابوو بەهۆی ئاگــــرەوە بفەوتێ . دووجارانیش لەخنکانی ئاوەوە رزگاری دەبێ . هەروا هونەرمەند نزیک بوو لەسێـــدارە بدرێ و بەبێ مەرام بخنکێندرێ !! کەرەتێکیــش ژەهری بەهەڵە خواردۆتەوە. لێرەدا دەڵێین هیچ



جێگەی سەرسورمان نی‌یە پاش ئەو هەمو کارەساتا هونەرمەندی لاو تووشی دڵەخورپێو شکانـــــەوە تەنهایی نەبێ و سەرومێشکی ببێ بە کێلگـــــە خەیال وتەلیسمی سیحرێکی بێکۆتایی !!!

لەنامەیەکیدا بۆ سۆلینی ( Soulier )ی هاورێ کەتێیدا باسی ڕۆژانی گەنجێتی خۆی دەکا و دەڵێ ( لقێکی لاوازی دارستانە ، دوورە پەرێزو کەوتۆ ژێربالی مەرحەمەتی باووبۆرانەوە ) هەروالــــە بوارەدا دێتەگفت و دەربارەی خۆی دەڵێ(هەردەم سەرلێشێواو وەکو منداڵێکی بێ هێزوولاواز) بەلا دەفەرمووێ ( ئەم منداڵە زۆر باش دەیزانی لــە ژیاندا چی گەرەکەو کەچی دەورووپشتی بەبلاشاییەکی گەورەو پڕ لەنهێنی‌یەوە پەرژین دراوە ،سەربارێ ئەوە رکەی گرتووە کەببی بەمرۆڤێکی هونەرمەند زانا !!! . ئەوهەمووبارە سایکۆلۆژیە جـۆراو جۆرەو ئەو هەموو کارەساتە ناهەموارو دژوارانە ئەو کەلە هونەرمەندە بەهێزو توانایەی لــــە وەدەرکەوت کەتادونیا ماوە دەمێنێ شانازی بـــە بەرهەمە نایابە مرۆڤایەتیەکانی‌یەوە دەکـــرێ

هەروەکو بۆ دلیری بلیمەت گووتیەتی : ( بەبێ دێلاکروا زنجیرەی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی پچڕپچڕە هەتاهەتایە!!! ) بەڵام لێرەدا پرسیارێک سەر هەڵدەداو دەڵێ :-

کێبوو ڕێی بۆ ئەم شۆرشە هونەرییە کە قوتابخانەی ڕۆمانتیکی بوو، خۆش کردو هاتەکایەوە، بێ سێودوو گومانی تیدانیە کە قوتابیانی هونەرمەند ( داڤید ) David و بەناوبانگەکەیان ( ژیدیکو- Gericault )و ( گرۆس Gros ) بوون . بەڵام یەکەم هونەرمەند کەوا فووی لە بلوێری ڕۆمانتیکیەت کرد هونەرمەند ( ژیریکۆ ) بوو وتابلۆی ( مێدۆزا ) - Meduse ) لەمێژووی هونەریی نوێدا بەیەکەم تابلۆی ڕۆمانتیکی لە قەڵەم دەدرێ .

بەڵام پێش ئەوەی ئالای ڕۆمانتیکیەت لە دەستیا بکەوێ ، هونەرمەندی مەزن ( ئوژین دێلاکروا ) ی ڕەفیق ئالاکەی قۆستەوەو بۆماوەی چل(٤٠) ساڵی ڕەبەق ڕووبەرووی قوتابخانەی ( کلاسیکی نوێ )ی هونەریی ڕاگرت ..

## کارتێکردنی هونەری :

دێلاکروا تەمەنی بیست ویەک(٢١) ساڵان بوو کەچاوی بەتابلوی ( میدۆزا ) کەوت ، ئەویش لە ساڵی (١٨١٩) بوو لەنووسینی ڕۆژانەی خۆیدا باسی لێوە دەکاو دەڵێ :- ئەم تابلۆیە سەودا سەری کردم، شێواندمی ، هەڵی تەکاندم ). هەر لەبەر ئەوکارتێکردنەبوو دێلاکروا شاکاری ( بەلەمی دانتێی - Bargue Dante )ی وێنەکێشا ، هەروابێتەوە دێلاکروا کارە هونەرییەکانی هونەرمەندانی بەتوانا ( روبنس - rubens )و ( تیتیان - TiTien)ی زۆر بەدڵ بووەو هەر لە ژیانی هونەریی لاوێتیەوە لاسایییانی کردیتەوە . جگەلەو دوو هونەرمەندانە بەرهەمەکانی هونەرمەندی ئینگلیزی ( کۆنستابل - Constable) یش کاری خۆی تێکردوە . هەروابێتەوە هونەرمەندان ( ئەلبەرت دیورەر - AlbertDurer )و (بونگتون Bonington ) کەئەمەیان دێلاکروا کەڵکی لە هونەری ڕەنگی ئاوییەوە لێ وەرگرت و پەیوەندیەکی بەهێزیش لەنێوانیاندا هەبوو. تادەگاتە هونەرمەندان ( ڤیرونیز- veronese ) و ( گۆیا GoYa )؛ بەڵێ ساڵی ( ١٨٣٠) هونەرمەندی بلیمەت دێلاکروا بەلوتکەی هەرە بەرزی ڕەوتی ڕۆمانسی دەژمێردرا . ئەویش بەتابلۆ ناودارەکەی ( ئازادی پیش گەل دەکەوی ) ئەو تابلۆیەی کە ( ڤیکتور هوگو _ V. Hugo ) پاش (٣٠) ساڵ پەنای بردە بەر ئەم شاکارە بۆئەوەی پاڵەوانەکانی لەڕۆمانە مەزنەکەی ( کلۆڵەکان_ البؤساء) بژێنێتەوە ، بەتایبەت وێنەی شەخسیەتی(گاڤروش Gavroche)ی منداڵ کەوا لەدەربریندا لاسایی منداڵی پاریسی دەربەدەرو برسیو رووت وقووت دەکردەوە!!! پاش شۆڕشی فەرەنسی هونەرمەند دیلاکروا تاجی ڕابەری ڕەوتی ڕۆمانتیکی پێ بەخشرا ..

سەفەر کردنی :

دێلاکروا لەژیانیدا چەند سەفەرێکی کردوە، کە کاریگەر بوونە لەسەر هونەروکارە هونەریەکانی ساڵی ١٨٢٥ چوو بۆ لەندەن و چاوی بەتابلۆکانی هونەرمەند ( کونستابل ) ڕۆشن بووەوە. وەهەروا لەگەڵ کارە هونەرییەکانی ئەکسپیرا ژیاو سەردانی بێ پایانی بۆ شانۆیەکانی دەکرد.

ساڵی ١٨٣٢ رووی کردە هۆڵەندە ، بەڵام سەفەرەکەی ساڵی ١٨٣٩ بۆ باکوری ئەفەریقا بۆ ماوەی ٦ شەش مانگ وەکو هیچ سەفەرێکی پێشووی نەبوو، بەتایبەت لایەنە هونەرییەکەی و یەکەم جاری بوو کەوا ڕووبەروی ئەم هەواوکەش وواقیعە دەبێ ، گەیشتە وولاتی ( مەغریب ) ولەکۆتاییدا لەوڵاتی ( جەزائر ) جێگیربوو. چەندها تابلۆی وێنەکێشا یەکی لەم شاکارانە تابلۆی(سولتانی

مەغریب بەسەربازەکان دەورگیراوە ) کەبەشێوەیەکی هونەریی ریکوپێک خامەی رەنگینی لێ بەکار هێناوە .

جگەلەوەش هونەرمەند توانیویەتی کۆمەڵە کەڤاڵ وتابلۆیەک دەربارەی خانوبەرەو ماڵ و ئافرەتانی ( مەغریب وجەزائر ) وێنە بنەخشێنێ . شاکاری ( ژنانی جەزائر ) هێمای بەرزی ئەم قۆناخەیەتی .

دێلاکروای سەلیقەدار بەدرێژایی ژیانی بە هیوای سەفەرێکی پێتەختی هونەرو هونەرمەندانی ( رۆما ) بوو ، بەلام بەهیچ جۆرێک بۆی نەلوا تاکو سالا کۆچ کردنی ، جالەم بارەیەوە دبێژێ ( پرۆژەی سەفەرو خۆ ئامادەکردن بۆ ( رۆما ـ ئیتالیا ) لەپایزی ئەم ساڵەدا جێبەجێ کرد ، بەلام ژبەر چەند هۆو زرووفێک کە لە دەرەوەی سنوورو توانای من بوون نەی هێشت ئەو هیوایەم کەساڵەهای سالە دەست بازی لەگەڵ خەیالۆ هزرو مێشکمدا دەکرد بێتەجێ !! ) .

## ئەدەبی دێلاکروا :

دێلاکروای بلیمەت جگە لەجیهانە هونەرییە پان وبەرینەکەی . جیهانی ئەدەبیشی گەر پتر نەبووبی ئەوە کەمتر نەبووە.. نگرە هەر لە نڤیسینی رۆژانەی خۆیداکە لە (١٥٠٠) لاپەرە پێک هاتووەو سێبەشە هەروەکو ( جوبان ـ Jobin ) دەڵێ ( تەنها ئەوەیان کارێکی بنەرەتییە لەهونەری فەرەنسی )دا .

نەخاسما مەقالاتی ئەدەبی و رای دەربارەی هونەرو نووسینو شیکردنەوەو توژینەوە لەمەر هونەرمەندە بەناوبانگەکانی جیهانی کەدوو بەشە هەروابێتەوە نووسینی چەندەها چیرۆک و دەقی شانۆیی و چەند قەصیدەیەکی شیعری تادەگاتە ئالوگۆڕکردنی نامەونامەکاری کە ئەمەشیان پێنج بەشە . هونەرمەند دێلاکروا لەژیانی خۆیدا توانی بەهۆی ( پەرەمووچوپێنووس )ەوە جوانترین و بە ماناترین.شێوەی دەربرین لەکارە هونەرییو ئەدەبییەکانی برسکێنیو پیشانی بدا دێلاکروا بەرهەمەکانی ( لورد بایرون ـByron)ی رابەری قوتابخانەی ئەدەبی رۆمانتیکی ئینگلیزی زۆر ـ دەخوێندەوە . کەخاوەنی چیرۆکی ( ساردانا سال)ی لێ دروست بکات .. ئێستاکی ئەم تابلۆیە نەمرە ئەستێرەیەکی گەش وپرشنگدارە لەئاسمانی هونەری جیهانیدا .

## دۆستایەتی دێلاکروا :

هونەرمەند هاورێ و رەفاقاتیو دۆستایەتیزۆر لەگەڵ کەلەشاعیرو ئەدیب ونووسەرو هونەرمەندان هەبووەو لەگەڵ بەرهەمەکانیان ژیاوە. وەکو ( شارل بۆدلێری شاعیرو فردریک لۆبلونو ئۆگست و لۆرانس و فیلکی و فیکتۆر هۆگۆو بەلزاک و روفائیل و ستاندال و لامارتین و شاتۆبریان و رۆمان نووسڤایلدنگ وهونەرمەندانی مۆسیقا وەکو فریدریک شۆبان و بتهۆڤن و کەمەنجەژەنی بەناوبانگ ( پاگانینی) کە بە ئەهریمەنی کەمەنجە ( شیطان الکمان ) شورەتی داوەو ناسرا وە... هونەرمەند هەردەم حەزی دەکرد هاورێو رەفاقاتیەکەی لەسەر بنچینەیەکی قووڵ وراستی و دروستی بێت . هەروەکو رۆژی بۆ قوتابییەکەی خۆی خاتو ـ بابوـ (Mme Babut) دەنووسێو دەڵێ ( خۆشترین ژیان لەوجودا ، بێ برادەرێتی و دۆستایەتی هەلناکرێ ) .

بۆ ( پیرێ ـ Perret)ی هاورێشی نووسیبو: ( من هەست بەخۆشیەکی تەواو ناکەم گەر لەگەڵ برادەرێک نەبم ، .

بەڵێ ئەوانە هەرهەموویان کارێکی گەورەو تولیان لەدڵ و دەروونی دێلاکرواو هونەرەکەی کرد بەدرێژایی ژیانیشی ئەدەبی کۆن ومۆسیقای

زۆر خۆش ویستووه. هەردەم گیانی خۆی بەمۆسیقای رەسەن مەست وئاودێر کردوه.

## دێلاکرواو ئافرەت:

لەلایەنێکی تری ژیانیەوه دێلاکروا مامەلەیەکی تایبەتی هەبووه لەگەلْ ئافرەت. گەیشتۆتە رادەی پەرستن. جوانی لەش ولاری ئافرەت سەرخۆشی دەکرد زۆرجاران ئافرەتی بە( داستانێکی ئەشەنگ )ەوه ناودەبرد. ئیف دی فلورین،نوسەری ئەرەنسی هاوچەرخ دەلێ: ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کەبەژیانی هونەرمەندا تێپەربوونە دەگەنە سەدوسێ ( ١٠٣) ئافرەت و لەگشت چینێکی کۆمەلدا بگرە هەر لەئافرەتی ئەشراف و خانەدان و بۆر ژواو هەژارو کرێکارو سەماکەرو باژنات و هونەرمەندان و کچانی شەوو جوان و ناشیرین. جگە لەئافرەتانی ولاتەکەی، پەیوەندی لەگەل ئافرەتانی سەر بەرەگەزوتیرەو هۆزو میللەتانی ترەوەش هەبووه. وەکو ئافرەتی ئینگلیزیو رووسی و پۆلۆنیو ئیسپانیو رۆژهەلاتی، لەهەمو روخسارو ناموبونێکەوه. یەکێ لەو ئافرەتانە کە پەیوەندییەکی روحی لەگەلدا هەبووه هاوولاتی خۆی بوو ئەویش نوسەری بەناوبانگ ( جورجصاند)ە.

## کارە هونەرییەکانی هونەرمەند:

تێکرای کارە هونەرییەکانی دێلاکروای بلیمەت کەئەلفرید رۆبو ـ لەکتێبە نەهەنگەکەیدا لەسەر دیلاکروای نووسیوه، ژمارەیان بەم جۆرەیە:ـ

(٨٥٣) تابلۆی زەیتیو (١٥٠٥) تابلۆی پاستیل و ئاوی و (٦٦٢٩)نیگاری ئامادەکراو واتا(ا سکیتیچـ Sketch)و(١١١٤) تابلۆی گولراو واتاگرافیک ) هەروا لەدوایی خۆیدا (٦٠)دەفتەری جێهێشتوه کە پرن لەرەسم ونیگاری هەمەجۆر..

هونەرمەندی لوتکە دێلاکروا باوەری بەهیچ شتێک نەمابوو تەنها بەوهێزوو توانایەی کە بۆکار کردن و نیگارسازی تەرخان کردبوو. هەروەکو ( جورج صاند ـ )ی نووسەر ئاگادار دەکاتەوەو دەلێ ( تاکو سەرەمەرگم هەردەبێ لەکاردابم). لەنووسینی رۆژانەیدا دەفەرموویێ ( دلخۆش دەبم ئەوکاتەی کەخوم لەناو توژینەوەو کارکردندا نغرۆدەکەم )

## هونەرمەند لەسەرە مەرگیدا:

وێلاکروای هونەرمەندی بەتواناو سەلیقەدار کەمێک پێش مردنی( جینی لوگیوی ) ی خزمەتکارو کارەکەرەکەی بەپرۆژەیەکی یەکجار زۆر ئاگادار دەکاتەوه، بۆ رۆژانی داهاتووی هونەرەکەی بەلام مخابن نەخۆشییەکەی تەنگی پێ هەلچنێ و بوو بەهۆی مردنی، لە(١٣) سیزدەی مانگی گەلاوێژی سالی (١٨٦٣) و لەتەمەنی(٦٥)سالیدا بۆ دواجار سەری نایەوەو ئۆغری دوایی کرد.....


سەرچاوەکان :ـ

١)النقد الادبی ـ اندریه ریشار ـترجمه صباح الجهیم.

٢)قصه الفن الحدیث ـ ساره نیومایر/ تعریب مسیلس یونان.

٣) محاضره الفنان شاکر حسن ال سعید.

٤) اوجین دێلاکروا من خلال یومیاته/ زینب عبدالعزیز.

٥) اوجین دێلاکروا / العدد(١٥). حسن کمال

٦) الرواق / العدد(١٥).



# ئەحمەدی حەمەمەلای باوك و هونەرمەند و نیشتمان پەروەر

نووسینی : ووریا ئەحمەد حەمەمەلا

## پێشەکی

کاتێ مامۆستا کەریم شارەزا کتێبی ( سێوە )ی بەچاپ دەگەیاندو داوای کرد نۆتەی چەند گۆرانیەکی مامەسێوەی بۆ بنێرم، هەرئەو کاتە پێی گوتم:- ( بەنیازم نامیلکەیەک لەسەر رۆل وکاریگەی ئەحمەدی حەمەمەلا، بۆسەر ئاوازی کوردی بەچاپ بگەیەنم، چونکە ئەحمەدی حەمەمەلا، لەکۆیە یەکەم گۆرانیبێژ بووە، هونەری ئاوازوگۆرانی کوردی ، لەکۆری ئایینیو مەولودی پێغەمبەرو لەسەر مەحفەل و منارەو گومبەتی مزگەوتانەوە، هێناوەتە ناوکۆری جەماوەری میللەتو هاویشتوویەتە قالبی گۆرانی نەتەوایەتی و رامیاریەوە...تاد) مامۆستا کەریم شارەزا هەمان قسەی لەپێشەکی کتێبی گولی سەربەسی و هەندێ بۆنەی جیاجیای دیکەشدا دووبارە کردۆتەوە. (١)

مامۆستا ( تایەر ئەحمەد حەوێزی ) یش لەبەرگی دووەمی کتێبی مێژووی کۆیە ، نووسیویەتی: ( لەو سالآنەی دوایی‌دا ، مەلا حەوێز ئاغاو وەکو ئەمین ئاغای ئەختەر، شەوان لەدیوەخانەکەیانا گۆیندەیان دادەناو گۆرانی خۆش خۆشیان دەگوت و مێزیان بۆ دەڕازاندنەوە، ( سێوە )و (مەلائەسعەد ) و ( ئەحمەدی حەمەمەلا )و هی‌دی بەشداریان دەکرد، باروبووی ( سێوە )و ( مەلا ئەسعەد ) یان دەکرد ( مەبەستی ئاغاکانە ) بەلآم ئەمە زۆر دەوامی نەکرد، جەنگی دووەمی جیهانی بەسەردا هاتە ئەو بەزمو ڕەزمە نەما ، ( ئەحمەدی حەمەمەلا )ی دووکانداروحالٌ خۆش بوو، هەرچەندە لەئاهەنگا نا بەشداری دەکرد، بەلآم خۆی ئەگەر هەوەسی نەبا ، کەس نەیدەتوانی بەزۆر گۆرانی پێ بلێ... سێوەو مەلا ئەسعەدو تایەر توفیق پێی ناوی من چیان لەسەر بنووسم چونکو زۆر ناسراون و زۆر-

یشیان لەسەر نووسراوەو ( کاک ئەحمەد ) یش جێگەی چۆڵ نیە ، وا ( وریافەندی) کوری لە مۆسیقاو گوتن و ئاوازدانانو لێکۆڵینەوە ، دەستێکی بالای هەیەو بێ وێنەیە ... (٢)

رۆژێکیش کەدیوانی ( شێخ نوری شێخ سالح)م دەخوێندەوە بەتایبەتی کەنووسراوە : ( ئەم هونەرمەندە دەنگ خۆشە کە لەسەردەمی خۆیدا سەرگولی کۆڕو مەجلیسەکانی سلێمانیو هەولێرو کەرکووک و هەڵەبجە بووە دەنگ و لەپاش بەجێ ماوی هونەرە بەرزەکەی ، وەکو دەیان بگرە سەدان دەنگی تر نەپارێزراوەو تۆمار نەکراوە . بەپاراستنی دەنگی ( شێخ نووری ) زیانێکی گەورەی لەهونەری گۆرانی کوردی داوە .بەتایبەتی هونەری ( مەقامات ) چونکە مەقام شوناسێکی گەورە بووەو یەکێک بووە لەوشارەزایانەی زۆر بەچاکی مەقامیان ئەدا کردووە. ئەگەر لەو سەردەمەدا تۆمەڵەکەمان کۆمەڵێکی شارستانیو پێشکەوتوو بوایە ، گۆرانی گوتنی بەخەوش ونەنگی دانەنایەو بەچاوی سووک تەماشای دەنگخۆشەکانیان نەکردباو بە پەللارو توانج لەپلەوپایەی کۆمەڵایەتیانی کەم نەکردایەتەوە، ئەم زیانە گەورەیەش لەبزووتنەوەی هونەریمان نەدەکەوت کەشێخ نووری یەکێکە لەنموونەکانی، ئەوانیش هونەرەکەیان بۆچەند ئانو ساتێکی کۆڕودانیشتنی سەرمەستانەی دۆستانو ئاشنایان تەرخان نەدەکرد ئەوسا ئاسایی بوو ئەگەر دەنگی خۆیان تۆمار بکردایە ، یان بیان هێشتایە تۆماری بکەن .... ئەگەرچی شوێنەواری هونەری ( شێخ نووری ) بە شێوەی دەیانی وەکو ( دەروێش عەبدوڵلا) لەناو چووەو سڕاوەتەوە ، بەلام ئەو دەنگ و سەدایە ئیستاش لەمێشکی زۆر کەسدا یادگاری خۆی هەڵکەندووە. دەمانەوێ ئەم سەرگوزشتانە ،ببێتە هاندەرێک بۆ برایانی تر ، تائەوانیش پێش ئەوەی کارلەکار بترازێ ئەو یاداشتانەیان بنووسنەوە یاخود تۆماری بکەن .... تاد ) (٣)

خوێنەری بەرێز : ئەو کارانەی باسم کردن بەتایبەتی ئەو نووسینەی کاک ئازاد عبدالواحد بوونە هاندەرێک بۆمنو ئەو ئەرکەی بەخەڵکی دی ئەنجام نەدرا ، دەبێ من بەشانازیەوە پێی هەستم .

کێبێ لەمن لەپێشتر بۆ ( ئەحمەدی حەمەمەلا)ی باوک و یەکەم مامۆستام .

کورتەیەکی ژیانی

ئەحمەدی حەمە مەلای کوری مەلا عەبدورەحمانی مەلاپیرۆتی مەلا عەولای ـ ساڵی ١٩١٣ لەگەرەکی هەواران لەشاری کۆیە چاوی بۆ دنیا هەڵهێناوە .

ئەحمەد خۆیو هاوەڵانی دیکەی وەک ( عومەر عەبدوللا)و ( بابەشێخ ) تاپۆلی شەشی سەرەتایی دەخوێنن ، بەلام لەبەکەلۆریا دەرناچن و واز لە خوێندن دەهێنن ، ئەوکاتە دوای بەکەلۆریای شەشی سەرەتایی بەخولێکی (٦) مانگی قوتابی دەبووە مامۆستای سەرەتایی . (٤)

دڵداری شاعیر بەمجۆرە وەسفی ئەحمەدی حەمە مەلای برادەری دەکات :ـ

( ئەحمەد کورێکی باریکەلەی زەردی چاوگەورەی لووت خر ، بەلام نێو چەوانێکی پان ، هەیکەلێکی جوانی هەبوو، زۆر دەنگی خۆش بوو زۆریش تەفەنونی لەشەدە بەستن دەکرد چاو لەدەربوو دۆستداریو عەشقبازی دەکرد...) (٥) دیارە ئەحمەدی حەمەمەلا، لەخێزانێکی مەلازادە بووەو باوەگەورەی ( مەلا عەبدولرەحمان) لەئەسڵدا خەڵکی گوندی کانی وەتمانە لەسەرداواکاری ( جەمیل ئاغا ) کەقایمقامی کۆیە بووە هاتووە لەکۆیە بووە بەکاتبی ، تائەمڕۆش رەزوباخچەیان لەکانی وەتمان ماوە .

ئەحمەدی حەمەمەلا لەخێزانێکی خۆش گوزەران چاوی کردۆتەوە ، ئەوەتانی مامۆستا ( تایەر

ئەحمەد حەویزی ) دەڵێ :ـ( لەسەفەربەرلــــــک ( جلال اغا )و ( ملارشید )و ( حەمەملا) خۆیـــــان کرییەوە ، جاری یەکەم یەکی ( ٥١) لیرەیـــان دا ، جاری دووەم ( ٣٠) لیرەیان دا ... تاد ) .

ئەحمەدی حەمەمەلا دوای ئەوەی لەبەکەلۆریـــای شەش دەرنەچوو وازی لەخوێندن هێنا ، وەک باوکــی خۆی ، لەکۆنە قەیسەری کۆیە دووکانێکی کوتـــاڵ فرۆشتنی داناو کچی ( عزیز ئەفەندی هەولێـــری کە لەکویێ معلم بوو ) ، [7] خواست .

ئەحمەدی حەمەمەلاو نیشتمانپەروەریو چالاکـــــی رامیـــــاری

من بەنیازی کۆکردنەوەی زانیـــــاری تـەواو دەربارەی ( ئەحمەدی حەمەمەلا) ئەوە چەندیـــن ساڵە ، زیاتر لەجارێک بۆلای برادەرانـــــی وەک ( عەونی شاعیر ، عومەر عەبدوللا،عەبدولرەحمانە رووتەو حەمەرەشیدی شێرزادو ئێدیکەش چوویمـــە ، گەلێ کتێب و چاپکراویش گەڕاوم ، تاوەکـــــو بابەتەکەم بایەخێکی تەواوی هەبێت و لــــەدوا ڕۆژدا وەک بەڵگەنامە پشتی پێ ببەسترێ .

وەک زووتر خوێندمانەوە ، ئەحمەدی حەمەمـــەلا لەبنەماڵەیەکی مەلازادەیە ، کاک عەونی گوتـــی: ( ساڵی ١٩٣٣ باوکتم ناسی ئەوکاتەی لەمزگەوتـــە کەی بەرامبەر ماڵمان دەهات بانگی دەدا .....) . لەمەوە دەردەکەوێ تائەوکاتە ، ئەحمەد لەســـەر ڕەچەڵەکی باووباپیران ڕۆیشتووەو دیارە بـــەو پێیە خوێندنی سوختەخانەیشی بەرلەخوێندنـــــی مەکتەب تەواوکردووە . عەونیو عومەر عەبدولـــلاو دڵداری شاعیر ئەدەب دۆست و ڕۆشنبیر بوونـە .. چونکە ئەوان و ئەحمەدیش ئەو هەستەیان (مەبەستم هەستی نەتەوایەتی کە بەرێگەی ئەدەبەوە بـــۆی هاتوون ) سەرەتا لەقوتابخانەی سەرەتاییدا ، لە سەردەستی هەندێ مامۆستای نیشتمانپەروەری وەک ( رەمزی رەحیم) کە خەڵکی کەرکووک بووەو باسی شۆرشەکانی کوردی بۆ قوتابیانی کردووە جارجارە بەو پێیەی دەستی شاعیری هەبووە ، شیعـــــری نەتەوەیشی بۆ خوێندوونەتەوە ئـــەم کـــــارەی مامۆستایانی نیشتمانپەروەری وەک ( رەمزیرەحیم عەبدوڵلا عەزیز ، عەبدوڵلا سامی ، عەلیاگـــــە زەکی هەناری ، سابیر ئیسماعیل و.. تاد) ڕۆژ ، لەدوای ڕۆژ گیانی نیشتمانپەروەری لـــەدڵـــــدا چەسپاوتر کردوونەو دواجار لەیەکتری نزیـــــک کردونەتەوەو بوونەتە برادەری گیانی بەگیانـــیو هەردەم پێکەوە هەڵس وکەوتیان کردووەو چاویـــان بەکەسانی نیشتمانپەروەری ئەوساکە کەوتــــووەو بیروڕایان گۆڕیوەتەوە ، ئەمە نەک هەر لەنـــاو شاری کۆیە بەڵکو لە هەولێروکەرکووکو سلێمانیش لەهەولێر کەسانی وەک:ـ مستەفا عوزێری ، فتـــاح جبار ، عیززەدین فەیزی ، تائەو ڕادەیــــــەی شەوانیش لەکۆری شەراب ومەی نۆشین دا ، کۆبوونـە تەوەو شیعری نەتەوەییان خوێندۆتـــــەوەو کـــۆ کردوتەوە ، جگەلەوە هەرچی گۆڤارو ڕۆژنامـــەو بڵاوکراوە هەبووە ، پەیایان کردووە ، عەونـــــی شاعیر گوتی :ـ ( بەهۆی گۆڤاری ـ گەلاوێــــژـەوە گەلێ هەڵبەستی نەتەوەیی وەک ( شیرین بەهـارە ) و ( ئیش کەئیستا رووی لەهەورازە )و .... تــــاد دەگەیشتە دەستمان .)

واتە ئەم هاورێیانە لەسیەکانا خاوەنـــــــی ئەمجۆرە بیروراو هەستە قووڵە نەتەوایەتیـــــە بوونە ، کاک عەونی گوتی : ( لەسیەکانا هەچکەسێ کردەوەی چاک وپڕبەزەیی نیشان دابایەوبکردایـە دەیانگوت ، ئەندامی حیزبی هیوایە ، ئەو حیزبە بە ( حیزبی هیوا ) ئەوکاتە رێکخستنی بەتینـــی نەبـــوو .)

کاک عەونی لەڕۆژنامەی هاوکاریدا لەحەفتاکان گوتوویەتی : ( ساڵی ١٩٤٠ جوومە حیزبی هیـــواوە بەم بۆنەیەوە دەڵێم : زۆرجار منوکاک عومـــەر

عەبدوڵلاو کاک ئەحمەدی حەمەمەلاو مەلا حەســـەن سەعیدو یوونس رەئووف ـ دڵدار ، بیرمـــان لـەوە دەکردەوە کەچەک بکرین بۆ شۆرش بەرپاکردن..تادا(٨)

کاک عومەر گوتی : ( رەفیق حیلمی هاتە کۆیـەو بە ( ئالآ ـ بەیداخ ) و بەقورئان سوێندمــــان خوارد کەخیانەت نەکەین ، ئەمە وەک حزبی هیوا )

کاک عەونی گوتی : ( ساڵەکانی چل لەکۆیەئاهەنگی نەورۆزمان کرد... یەکەم ساڵ لەسەر شووران،ئەو شوێنەی ئێستا کراوەتە مەحکەمە ، من نواندنەکەم ئامادە کردبوو کەتەمسیلی کاوەی ئاسنگەروزوحاک بوو . ساڵی دواتر لەشاخی مشکە باخچەی حەمــــە صدیق نەورۆزمان کرد... یەکەمجار لەو نەورۆزەدا ئاگر کرایەوە... خەڵکی پاشکەوتوو رەخنەیـــان لەئاگر کردنەوە گرت وگوایە ئێمە ئاگر پەرستــی دەکەین ، یەکێک لەبرادەرانمان میزێکـــی بـــە ئاگرەکە داکردو.. رووی کردە خەڵکی و گوتــی: ( بۆیە وامکرد تابزانن ئێمە ئاگر پەرست نین ، بەڵکو یادگاری بۆنەیەکی نەتەوەیی دەکەینەوە.)

رووتە گوتی:ـ( من ئەندامی کارگێری پیشـــەی کرێکاران و کاک ئەحمەدی حەمەمەلا کارگێـــری پیشەی بەزازان ـ کوتاڵ فروشان و مام رەسوولـی حەمودەمین کەباپچی ئی قوتابیان بوو / ئەمە لە کاتێک دا لەهەموو کۆیەدا ، پارتـــــی(١٧ـ١٨) ئەندامی هەبوو. )

کاک عومەر گوتی : ( ئەوساڵەی حەمەپاشا لـــە کۆیە قایمقام بوو منوباوکت و ساڵح شەمـــس (٣) مانگ وحەفدە شەو لەهەولێر لەبەندیکراین، ئـەو کاتە ( سەعید قەزاز ـ موتەسەریفی لیوای موســـڵ بـــوو .)

* کاک عەونی گوتی : ( ساڵی ١٩٤٣ منوکاک ئەحمەد و حسامالدین طیب ) گیراین ورەوانەی کەرکـــوک کراین ، ناردمان بەدوای ( عەونی یوسف ) وبـــە هۆی ( مەلا سدیق ) کەخاڵی حسامالدیـــن بوو و رەئیسی مەحکەمە بوو ( تمییز ) مان بـــۆکــــرا ، گیراوی دیکەی کۆیەوسلێمانیوشوێنەکانـی دیکـەی زۆر لێ بوو ، ئێمەش لەگەڵ ئەوان وەک نەفی کراو لەئوتێل بووینو رۆژی دووجاران دەچووینە پۆلیس خانە ئیمزامان دەکرد... مانگێک ماینەوەو بـــە هۆی ( مەلا سدیق )ەوە بەربووین ... ئەوانـــەدی (٦) مانگ مانەوە .

* رووتە گوتی: ( تایەر تۆفیق لەکۆیە گەڕایـەوە من لەبەغدابووم، گوتی : عومەر عەبدوڵـــــــلاو عەونی شاعیرو ئەحمەدی حەمەمەلاو ساڵح شەمـــس هەمووی لەمووسڵ حەپسن ... کەچــوووم بـۆلایـان پیاوێکی خەڵکی سلێمانی ناو ساڵح بەهێزی مێشکو بازوو وکاک ئەحمەدیش ( شیرین بەهارە )ی دەگوت

* کەمال کەریمی ئامۆزام گوتی : ( ئەحمەدی مامم و عومەر عەبدوڵلاو کاک عەونی شاعیر ) لەلایـــەن حکوومەتگومان لێکراو بوونو هەمیشە بەندونەفی دەکران ، لەکاتی شەڕی جیهانی دووەم لەهەولێـر نەفی بوونو لەئوتێل ( فەرەح) دەنوستن و رۆژی، جارێک دەچوونە پۆلیسخانە مۆریان دەکرد.

* دواجاریش ساڵی (١٩٦٣) لەسەردەمـــی حـەرەس قەومی بەعسیان ، لەگەڵ زۆربەی رۆشنبیـــران و فەرمانبەرانی کۆیە ، زیاتر لەساڵێک لەبەنـــدێ هاویشتران ئەم جارەیان لەبەر ئازاروئەشکەنجەی بەعس ، تووشی گەلێ نەخۆشی دەروونیو ئیفلیجــی هـــاتە چەندین ســاڵ کەوتە ناوجێو سەرەنجـــام لەرۆژی (٩)ی ئاداری ساڵی ١٩٦٩دا هەر بەهـــۆی ئەو ئازارو بەندو لێدان و ئەشکەنجەیـــــــەی بەعسیان ، سەری نایەوە. ئەحمەدی حەمـەمـــەلای نیشتمانپەروەر پەیوەندیو برایەتیو هاوهەڵوێستی لەگەڵ ئەم بەرێزانە هەبوو :ـ

مامجەلال و عەلی عەبدوڵلاو عومەر دەبابـــــەی رەحمەتیو گەلێکی دیکە. گەر هەموو شتێک بنوسم ئەوە بێشک کتێبێکی دەوێت ، بۆیە شتێکتـان بـە نموونە بۆدێنمەوە تاهەندێ زیاتر شارەزایبرادەی کوردایەتی ئەحمەدی حەمەمەلا بین :ـ

ساڵی (١٩٦١) سەرەتای شۆرشی ئەیلوول پێشمەرگە کۆنترۆلی شاری کۆیەی کرد ڕۆژی (١١)ی ئەیلوولی ئەوساڵە دووفڕۆکەی مێگ کۆیەیان بۆر دومان کرد کرێکارێک کوژراو ( حەمەبگرەز )برین دار بوو. کاتێک سوپا گەیشتە کۆیە خەڵکی بێ دەسەڵات و ژنو منداڵو نەفام، لەخۆشی ئەوەی سوپا هاتەوە کوێەوچیدی کۆیە بۆردمان ناکرێ پێکەنینو خۆشییان دادەباراند، کاتێکی چووم بەحسابی خۆم ئەم خەبەرە خۆشە بۆ باوکم ببەم باوکم لەسووچێکی سەربان بەرامبەر ئەو شەقامەی سوپاکەی لێوە دیار بوو، ڕاوەستابوو وەک باران فرمێسکی دادەباراند؟! تاسام... نەمزانی مەسەلەچیە... لەدایکم پرسی : گوتی: باوکت دەڵێ کورد تیاچوو ... بۆیە کەوتمە بیرکردنەوە... بەدەست خۆم نیە ، ئێستاش جار هەیە ئەو دیمەنەم دێتەوە یاد...

ئەحمەدی حەمەمەلای هونەرمەند :ــ

---

ئەحمەدی حەمەمەلا هەرچەندە لەدانیشتەکانی ناوشاری کۆیەو جاربووە لەدەرەوەی کۆیەش گۆرانیو مەقامی گوتووە، بەڵام قەت بەزۆر لێ کردن نەیگوتووە.

ئەحمەدی حەمەمەلا خاوەن بەهرەیەکی هونەری بەرز بووە .... بەهرەکەی لەگەلێ لایەنی هونەری دا دەردەکەوێ ، یەکەمجار بەدەیان شیعری شاعیرانی کوردی لەبەربووە، توانای هەبووە بە خەتە جوانەکەی بیان نووسێتەوە جگەلەوە خاوەنی دەنگێکی زوڵاڵو کاریگەرو لەهەمان کاتدا نەرمو پرسۆز بووە. دیسان توانای ئاوازدانانی هەبووە

* کاکە عەونی گوتی : ( یەکەم کەس ـ شیرین بەهارە ی گوت ، باوکت بوو، شیعرەکە لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکرایەوە ... )

مامۆستا ( مەجید ئاسنگەر ) یش بابەتێکی لەژێر ناونیشانی ( کۆیە ـ لەبەر ڕۆشنایی هەڵبەستێکی عەونیدا ) لەگۆڤاری کاروان دا بڵاوکردوتەوە کە عەونی تێدا دەڵێ :ــ

ئەحمەد بەئای شیرینی بەهار
خۆشتر لەئاوازی هۆزار

لەپەراوێزیشدا مامۆستا ( ئاسنگەر )نوسیویەتی خوالێخۆشبوو ، ئەحمەدی حەمەمەلا باوکی هونەرمەند ـ وریا ئەحمەد ـەو زۆر دەنگخۆش بووەو هونەرمەندێکی ڕەسەن بووە.(٩)

ئەو ڕۆژەی کاک عەونی خوا عافووی کات ، لە ماڵی خۆیان لەکۆیە میوانداری کردین لێم پرسی ئەم بەیتە شیعرە چی دەگەیەنێ: ( گوتی ئەمە بۆ مێژووە کەئەحمەدی حەمەمەلا یەکەم کەس بوو شیرین بەهارەی بەم شێوەیە گوتووە.)

* کاک عومەر گوتی : ( شیرین بەهارە یەکەمجار ئەحمەدی حەمەمەلا گوتی ... ئەو کاتە هەمو کەس نەی دەویرا بیلێ ... ( ئیبراهیم ئەحمەد ) خاوەنی شیرین بەهارە، هاتە کۆیەو لەگەڵمان دانیشت گوێی لەئاوازی شیرین بەهارە بوو شاگەشکە بوو، منوئەحمەدو سەمەد مەنجەڵ ... لەگەڵیدا چووین بۆ سلێمانیو لەسەرچنار دەعوەتی بۆکردین .. هەر لەسلێمانی لەتەکیا دەعوەتمان بۆکرا ، منوئەحمەد، ( دەماغم وەزنە مان گوت پیاوێک بەناوی ( عیزەتی فاتە ـ عیزەت مەدفەعی ) گوتی : ( ئەگەر زەوق هەبێ هەرلە کۆییانە ...).

* ڕووتە گوتی : ( ساڵەکانی ٩٤٥ ـ ٩٤٦) کەپرێک لەچاپخانەی خۆم ، ئی سەرتەمتەمان ، لەسەر حیسابی خۆیان ، بۆ کردبوون ، لەناوڕەزانهەندێ شەوان کاک ئەحمەدو کاک عومەرو کاک عەونی لەگەلێ برادەری دی ، دەیاننارد خواردنوخواردنەوە یان بو دەهات ، هەندێجار تارۆژهەلات دەمانەوە جێکاکەش دیاروبەرچاو نەبوو، ئنجا کاک ئەحمەد لەو دانیشتنەدا ئاوازی بۆ شیعرەکانی کاک عەونیو شیعری دیکەی وەک شیرین بەهارە دادەنا

---

* مامۆستا کەریم شارەزا دەڵێ: ( ئنجا برایان هۆمەر عەبدوڵلاو خوالێخۆشبوو ئەحمەدی حەمەمەلا کە دوولاوی رۆشنبیر بوون بەدووقۆڵی گورانی ( لەمەیدانی بەهارە شارەکەی کو)یان پێشکەش کرد.) [10]

* کاک عەونی گوتی: ( ئەحمەدی حەمەمەلا نەک هەر شیرین بەهارە بەڵکو گەلێ شیعری دیکەیشی دەگوتن و ئاواز بۆ دادەنان ، بونمونە شیعری ( ووتم ئەی کچ ) کەشیعری منە، یەکەمجار بە مەقام دەیگوت و دوایی دەیکردە ئەو بەستەیەی ئێستا تایەر تۆفیق لەئێسکەدا بەتۆماری گەیاندووە. دیسان شیعرێکی پێنج خشتەکی من لەسەر شیعرێکی ( مەیلی ) بەناوی( واچرای کوڵمت ) هەر باوکت ئاوازی بو دانابوو ،هەروەها شیعری ( ئیش کەئیستا رووی لەهەورازە سەرەولێژی نەکەی ...)ی فەزلی کە لەگۆڤاری گەلاوێژەوە وەرمان گرتبوو هەر باوکت ئەوشبوە گوتنەی بو دانا.)

* مامە ڕووتە گوتی: ( کاک ئەحمەد دینەمۆی کۆرو دانیشتنەکان بوو، گوتنەکانی تەئسیری لەهەموان دەکردو زیاتر گیانی نیشتمانپەروەری لا توندتر دەکردن.)

* کاک عەونی گوتی : ( ئەحمەدی حەمەمەلادەنگخۆشی ئیمەبوو ئەو شیعرانەی ئێمە پەسەندمان دەکردن ئەو دەیگوتن ... کاک عومەر عەبدوڵلا بەشداری لەبەستەکانا دەکردو گەلێ جار لەمەجلیسی ئێمەدا سێوەو مەلا ئەسعەدیش بەشدار دەبوون.)

* کاک عومەر گوتی : ( ئەو شیعرەکی بمانزانیایە بۆنی نیشتمانپەروەری لێ دێت و شێوەیەکی جوانو و مەعقوولیشی هەیە، باوکت شیعرەکەی بەدەستەوە دەگرت و دەی گوت ، ئێمەش بۆمان ( دەگێرایەوە دەسەندەوە ) بەم شێوەیە تاشیعرەکە دەهاتە بەرمان ....)

* تایەر تۆفیقی نەمریش لەمبارەیەوە دەڵێ : ( جارێ هەرزەکار بووم لەساڵی (١٩٣٦)ەوە دەستم بەگۆرانی گوتن کرد. ئەوسا باغو سەیرانگاکانی کۆیە مەڵبەندی شادی و ئاوازو گۆرانی کوردی بوون و شیعری شاعیری کوردی وەکو نالی و کوردی و حاجی قادری کۆییو بێخودو سافیو مەیلیو راجیو ٔزەکیو دڵدار لەباربوونو لەلایەن گۆرانی بێژە ناودارەکانی کۆیەی وەک سێوەی هونەرمەندو مەلائەسعەدو ئەحمەدی حەمەمەلاو گەلێ هونەرمەندی دیکە دەگوتران و ... ) [11]

دواتر دەڵێ : ( کۆری دانیشتنو رابواردنی ئەوسای ناوباخو ڕەزانمان بەزۆری لەگەڵ هونەرمەندو هونەر دۆستانی وەکوو عومەری مامعەولاو ئەحمەدی حەمەمەلاو عوسمان عەونیو ... تاد بوو[12]

ـ ئەحمەدی حەمەلا جگە لەدەنگخۆشیو ئاوازدانەری مەقامزان یاخود مەقامناسیش بووە ، خاڵە حەمە رەشیدی شیرزاد گوتی : ( ساڵانی (٩٣٠)جارێکیان غەزەلێکی سەعدی شیرازیم خوێندەوە، ئاگام لێبوو کاک ئەحمەد تا لەگوتنی غەزەلەکەبوومەوە راوەستا ، هەر ئەو ڕۆژەش تووشی هاتمەوە گوتی: حەمە ( منی زۆر خۆش دەویست و هەر بە حەمە بانگی دەکردم ) دەنگت زۆر خۆشە، ئوسوڵی (سەبا) شت زۆر چاک خوێند بۆچی نایەیتە ناو کۆری گوتن ....) .

دیسان مامۆستا کەریم شارەزاش لەکتێبی ـ مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندی کورد دەنوسێ: ( ئەحمەدی حەمەمەلای مەقامناسی کورد ، لە مەلبەندی کۆیە .... تاد) .

زیاد عەلی بەرزنجی لەبابەتێکدا کە لەژێر ناونیشانی ( کۆیەو مەقامو گۆرانی کوردی )دا[13] نووسیویەتی دەڵێ : ( ئەم رێبازەش لەسەردەست و لەرەی دەنگی خوالێخۆشبوو ئەحمەدی حەمەمەلا ١٩١٣ ـ ١٩٦٩ـ خولقاو مامۆستا تایەر تۆفیق

سوودی لێ وەرگرتوو بەسوار چاکی ئەم ڕێبـــازە دائەنرێـــت ).(١٤)

وەک تێگەیشتین باوکم ئاوازی بو گەلـــــێ هەڵبەستی نیشتمانپەروەری داناوە بـۆ نموونـــە (شیرین بەهارە) و (ئیشکە ئێستا ڕووی لــە هەورازە ...) و (ووتم ئەی کچ) و (واچــرای کوڵمت) و گەلێکی دیکەداناوە ، هەر بۆ نمونـە شیعریک هەبوو ئێستاش لەگوێما دەزرنگێتـــەوە محمود ئاغەی کاکەزیادی زۆری حەز لێبوو دەڵـێ:

ڕۆژی واریکەوت کەرێگام کەوتە ماڵی یارەکەم
دیم کەوەستاوە لەدەرگانەونەمامێ گوڵ بەدەم
....... تـــاد .

وەک گوتمان و تایەر تۆفیق خۆیشی پێی لێنـا ، کە ئەو گوتنانە زۆربەی لەسێوەو مەلا ئەسعـــەدو باوکمەوە فێربووەو دواتر لەئیسگە بەتۆمـــاری کەیاندوونە .... بەڵام لەهەمان کاتێشدا وەنەبێ تایەری نەمر دەستی ئاواز دانان و داهێنانـــی نەبووبی هەر بۆنموونە : یەکەم کەس شیعـــــری (ساقیا)ی گوت تایەری نەمر بوو دوای ئـــــەو گۆرانی بیژان (کەریم کابان)و (محەمەد جەزا) و (ناسری ڕەزازی) و ئی دیکەش بـــە هەمــــان ئاوازەکەی تایەری نەمر دووبارەیان کردەوە .

ئەمڕۆ بەدەیان شێوەگوتن و ئاوازم لەیـــــاد ماوە ، کە بەمناڵی و هەرزەکاری ، لەباوکمـەوە بیستوومن و فیریان بوومە بو نموونە :ـ

(گۆرانی ئامین ئامین ، کوڵبەیـــی ئەحـــزان ، بۆ فریبی عاشقان ، لەسەر شەوڕۆژی دانـــــاوە شەوێ نانوم ، ئاهویار ، دووڕەشماڵی ڕەشکوکـە ، ناوی هەمینە ، ڕەنگی زەردم ، بازان باز قەتار دەماغم وەزنە ، بەوبەو یادوست ، یار زەینـــەب .... تـــاد .)

بۆچی دەنگی ئەحمەدی مەلا بوئێمە بەجێ نەما ؟

---

ئەحمەدی باوک و نیشتمانپەروەر گەلێ جــــار دەیگوت : (لە (ژ . ک) ەوە بۆ کوردایەتـــی لەگەڵ هاوەڵانم دەستبەکار بوومەو دواتر (هیوا) و ئنجا (پ . د . ک) .

بەو پێیە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەحمەدی حەمە مەلاو برادەرانی ، بۆ بەرژەوەندی گەلونیشتمـان خەباتیان کردووەو حەپس و تێهەلدان و نەفـــی کردنیش نەیتوانیوە دڵیان بلەرزێنێو چاویــــان بترسێنـــــێ .....

دیارە وەک رووتە گوتی :(ئەحمەدی حـەمەمـەلا گەر مەجلیسێکی بەدڵ نەبوایە ، قەت مومکین نەبو گۆرانـــی بڵـــێ ....)

یان مامۆستا تایەر حەویزی نووسیویەتـــــی : (ئەحمەدی حەمەمەلا هەرچەندە لەزۆر ئاهەنگـــان بەشداری دەکرد ، بەڵام خۆی ئەگەر هەوەسی نەبـا ، کەس نەیدەتوانی بەزۆر گۆرانی پێ بڵێ ...(١٦).

منداڵ بووم شەوێک لەماڵی کاک عومەرعەبدوڵـلا دەعوەتێکی گەورە بوو ، ئەوشەوە برادەرانــــــی هونەرو نیشتمانپـەروەری باوکم ، حەمەگەمحانیان بەخۆوگشت پێداویستیەکانی تۆمار کردن هێنابـوو ئامێری تۆمارکردنیان شاردبووە ، تاوەکو دەنگـی بەتۆمار بگەیەنن ... کاتێ دەست بەگوتن کـــرا ، باوکم خۆی گوتەنی کزەیەکی بوکرد ... هــــەرزوو هەستی بەمەسەلەکە کردو یەکسەر پیلـــــی منــــی ڕاکێشاو دانیشتنەکەی بەجێهیشت ، هەرچەنـــــدە دوامان کەوتن و هەوڵیان دا بیگەرێننەوەو دڵـی ئاشتبکەنەوە بێ فایدە بوو ... بەڵێ تا ئـــەو ڕادەیە ڕقی لەوەبوو ، دەنگی تومار بکرێت .... هۆیەکەشی ئەوەبوو ، دەیزانی کاتێ دەنگی تۆمـــار بکرێت ، لەچایخانەو شوێنی گشتی لێدەدرێـــت و ئەوکاتە خەڵکی بەچاوێکی دیکە سەیری دەکەن ... (شێخ نووری شێخ ساڵح) یش هەر لەبەر هەمـــان هۆ وەک ئەحمەدی حەمەمەلا دەنگی بۆئێمە جێنەما ، دیلانی شاعیریش بەمدوایە کەس نەیدەویرا باسی

گۆرانی گوتنی لەگەڵ دابکات و پێی بکرایە ئەو چەن گۆرانییە تۆمارکراوەی هەشیبوو دەیسرینەوە ئەویش هەر لەبەر هەمان هۆ بوو .

لەکۆتاییدا ... دەڵێم خۆزگە توانیبێتم بەشێک لەقەرزەکانی ئەحمەدی حەمەمەلام دابێتەوە، ئەو پیاوەی بەدەیان شیعری کوردی و فارسی لەبەربوو لەمەجلیس و کۆریکی بەهەوەسی با بەدەیان قسەی خۆش و نوکتەومەتەل و حەکایەتی سەیروسەمەرەی دەگێرایەوە ... هەتاپێی بکرایە، بەهانای خەڵکییەوە دەچوو، پاشملە باسی کەسی بەخراپە نەدەکرد... گەر شتێکی بەرامبەر کەسێک هەبوایە رووبەروو پێی دەگوت و گلەیی ئاراستە دەکرد.

هەزار سڵاو لەگیانی پاکت بێت ئەی باوک و هونەرمەندو نیشتمانپەروەر، خۆزگە ئەمرو بۆ چەن چرکەیەکیش بوایە چاوت دەکردەوە، چونکە ئەو ئاواتە دێرینەی کەخۆت و هاوەڵانت بردتانە ژێر گڵ سوپاس بۆ خوا و خوێنی شەهیدان ئەمرۆ هاتوتە دی ... خۆزگە بەچاوی ...ژتان کۆبونەوەکانی، یەکەمین پەرلەمانی میللەتەستەم دیدەکەتان دەدیت ...

پەراوێزو سەرچاوەکان :


١- تایەر تۆفیق / گوڵی سەربەستی / بەشی یەکەم . چاپخانەی ( دارالفاق عربیە ) ساڵی ١٩٨٣ هەولیر ئەمیندارێتی رۆشنبیری و لاوان، ل . ( ٩ ، ١٠ ) .

٢- طاهر احمد حوێزی / مێژووی کۆیە، بەرگی دووەم/ بەشی یەکەم/ چاپخانەی نەمیر بەغدا ١٩٨٤ . ل.(٢٧١).

٣- شێخ نوری شێخ سالح / ئازاد عبدالواحد کۆی کردۆتەوەو ساغی کردۆتەوەو لەسەری نووسیوە. بەرگی یەکەم . بەشی یەکەم چاپخانەی ( دارالجاحظ ) بەغدا ١٩٨٥ .لاپەرە ( ١٣٠ ، ١٣١ ) .

٤- دڵدار/پێشەکی نووسینو ئامادەکردنی عبدالخالق علاالدین / چاپخانەی دارافاق عربیە - ١٩٨٥ . ل . ( ٤٥ ).

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل .( ٤٣ )

٦- سەرچاوەی ژمارە (٢) ل . (١١٧) .

٧- سەرچاوەی ژمارە (٢) ل . ( ١٨٢ ).

٨- رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١٣٧) رێکەوتی ١٩٧٢/١٠/٧ .

٩- مەجید ئاسنگەر/ گ . کاروان . ژمارە (٨) ی ئایاری (١٩٨٣) لاپەرە (٢٨ - ٣٠ )

١٠- رۆژنامەی هاوکاری رێکەوتی ١٩٧٦/٣/١٨ بەداخەوە ژمارەکەیم نەماوە .

١١- سەرچاوەی یەکەم .ل.( ١٤ ) .

١٢- دیسان سەرچاوەی ژمارە (١) ی لاپەرە (١٥) .

١٣- کەریم شارەزا / مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندی کورد. چاپخانەی حوسام/ بەغدا ١٩٨٢ ل . ( ٦١ ) .

١٤- پاشکۆی عیراقی ژمارە (١٣٠) رێکەوتی٩٠/٣/٢٨

١٥- ژ.ک پارتێکی کوردستانی بووەو ناوی تەواوی ( ژیانەوەی کورد) بووە، دیارەپێشر پەیدابوونی حیزبی هیوا بووە .

١٦- سەرچاوەی ژمارە (٢) ل . (٢٧١)

١٧- رۆژی شەموو رێکەوتی ( ١٩٨٩/٧/٢٧ ) بۆ ئەم مەبەستە چوومە لای کاک عوسمان عەونی شاعیر و نیوەرۆی ئەورۆژە لەماڵی خۆیان من و ( فتحالله عبدالله )ی خەزورمی میواندارى کرد. شایانی باسە ئەمساڵ رۆژی ١٩٩٢/٧/٢٠، کوچی دوایی کرد.

١٨- رێکەوتی ٩٨٤/٨/٢٠ دیسان لەگەڵ ( فتحالله عبدالله )وە، چووینە گوندی ( سوسی)ی دۆڵی سماقوولی ... بۆ دیتنی کاک(عومەرعبدالله) و چاوپێکەوتنەکەشم بەکاسێت تۆمارکردووەو لای خۆم پاراستوومە، ئەو پیاوە وەک زووتر گوتم زیاتر لە(٣٥) ساڵ لەگەڵ ئەحمەدیحەمە

مەلاّ وەک برا وابووە... شایانی باسە ئەو پیاوە ڕۆژی ١٩٩٠/٥/٢١ کاتێک دەهات ئەو نووسینە تەواو بکەم کۆچی دوایی کرد ..... چونکە ئەم نوسینە جاری یەکەم ( تنضید )یشر کرابوو، لەراپەرینەکەدا بزربوو، ئەمەیان جاری دووەمە دەینووسمەوە. ئەوکاتە گەلێ شتم نەدرکاندبوو، کەچی ئەمڕۆ لەسایەی خوێنی شەهیدان و پەرلەمان و ئەنجوومەنی وەزیرانەوە، بەشانازیەوە نووسیومن .

١٩- هەمان ڕۆژ کە بۆلای کاک عەونی چوومە کۆیە واتە ٩٨٩/٩/٢٧ هەر ئەو ڕۆژەش چوومەدیدەنی مامە عەبدولرەحمانە ڕووتە. بۆ هەمان مەبەست، دوای ئەوە تائەمڕۆ زیاتر لە جارێک لەگەڵ مام ڕووتە دانیشتوومەو گفتوگۆم کردووە.

٢٠- دیسان هەر بۆ ئەو مەبەستە ڕێکەوتی - ١٩٩٠/٥/٢٧ چووم بۆ دیدەنیخاڵە حەمەرەشیدی شێرزاد لەهەولێر لەگەڕەکی ڕووناکیوئەویش هەر ئەمساڵ کۆچی دوایی کرد واتە ( ١٩٩٢).

٢١- ڕۆژی چوارشەم ڕێکەوتی ٩٨٩/٨/٣٠ بۆهەمان مەبەست چوومەلای کەمالی کوڕی مامە کەریم .

٢٢- جگەلەوەی باسم کردن پرسیارو سۆراغم لە گەلێک کەسی دی کردووە، کەپەیوەندی دوورو نزیکیان لەگەڵ باوکی ڕەحمەتیم هەبووە... هەتا پرسیارم لەدایکی خۆیشم کردووەو بۆ ئەم مەبەستە رای ئەویشم وەرگرتووە.

٢٣- ئەحمەدی حەمەمەلا لەکۆیە لەقەبرستانی عارەبیان ناژراوەو گۆڕەکەی وا لەوێیە.

٢٤- لەشەستەکانا ( جەمالی ئامۆزام ) ناوی ( حەمەمەلا)ی بابەگەورەمی، لەدەفتەری نفووسدا، کردە ( محەمەد ) ئەوکاتە من و کوڕە مامەکانم بەوکارە گەلێ کەیف خۆش بووین، بەلاّم ئێستا گەر بۆم بلوێ دەیکەمەوە ( حەمە مەلا) .

# پەڕەکە

# TURBINE

ئەندازیار- حەمە قادر

پەڕەکە ئەو ئامێرە گرنگە زۆر مەزنەیە، کە لە یەکەم ڕۆژی داهێنانییەوە هەتا ڕۆژانی ئیمرۆ و لە دوارۆژێکی زۆر دووری تریش دا ڕۆڵی پڕ فەڕو بەرەو هەرمێنی بەردەوامە و لە فەرهەنگی زانیاری و زانست دا جێگایێکی بەرزو پڕشنگداری هەیە و بەپێی گۆڕانی ڕۆژگار و سەردەم گۆڕانی بە سەردا هاتووەو بە شێوەیێکی زۆر چاک ئەو ئەرکانەی جێ بە جێ کردووە، کە لە پێناویدا داهێنراوە، و هەنگاوی فرە گەورە گەورەشی بە پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤایەتی داوە و بە ئاشکرا کاریگەری لە ژیانی ڕۆژانەمان دا دیارە و شۆڕشێکی ئەو تۆشی لە پیشە سازیدا بەرپاکردووە، کە کەم ئامێرو ئامراز توانیویانە خۆیان بدەن لە ئاستی. مێژووی داهێنانی ئەم ئامێرە تەمەن درێژە، بە تایبەتی پەڕەکەی ئاویی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر دوورو، باپیرە گەورە لێهاتووە هێژاکانی ئێمەی کوردیش توانیویانە ئەم ئامێرە نایابە لە شێوەی ئاشی ئاودا دروست بکەن و لە زوربەی زۆری شارو گوندەکانی کوردستان دا بە چاکی بە کاری بهێنن و کەڵک و سوودی لێ وەربگرن. بەلاّم پەڕەکەی هەڵم لە بنەتای سەدەی ڕابوردوودا و لە ساڵی ١٨٨٢دا لە لایەن ئەندازیاری کارامەو بەهرەداری سویدی «گۆستاف دی لاڤال - Gustaf de Laval» ەوە داهێنراوە و بەکردار بەکاری هێناوە و توانیویەتی تیایدا ڕاستەوڕاست ماتەوزەی هەڵم زۆر بە چاکی بگۆڕێت بۆ جووڵەوزەو ڕاستەوخۆ ئامێری تری پێ بخاتە کار. بەگشتی کاری سەرەکی پەڕەکە خولاندنەوەی ئەو ئامێرانەیە کە

پێوەی بە سترانەتەوە. ئەم خولاندنەوەیەش بە هۆی ئاو، هەڵم، یان گازەوە دروست دەبێت. هەندێك ئامێر و ئامراز بە بێ بوونی سوراندنەوە ناتوانن ئەرکی خۆیان جێ بە جێ بکەن و بزوتنەوە بوتە بنەمای جێ بەجێ کردنی کاریان. بۆ نموونە بەرداشی ئاشی ئاو هەتاوەکو نەسورێتەوە توانای هارینی دانەوێڵەی نی‌یە. بەبێ ئەو سورانەوەیە لە ئاشی ئاودا کار ئەنجام نادرێت. لێرەدا بۆ خولاندنەوە، بەرداشی سەرەوە بە پەرەکەیەکەوە دەبەسترێتەوە، هەر چ کاتێك پەرەکەکە خولایەوە بەرداشەکەش پێ بە پێی ئەو دەسورێتەوە و کاری بە سوود دێتە بەر هەم. یان لە پەیداکەری کارەبایی‌دا، دروست بوونی کارەبا پێویستی بە خولاندنەوە هەیە، بەبێ خولاندنەوەی تەمۆ Rotor ی پەیداکەرەکە، کارەبا دروست نابێت. ئەوەی ئەرکی خولاندنەوەکەی لە سەرشانە، پەرەکەیە. وەستاندنی پەرەکە، وەستاندنی کارەبایە. جاری ئەوتۆ هەیە توربها بە پەرەکەوە دەبەسترێتەوە بۆ هەڵ هێنجانی ئاو یان شلەیەکی تر. دیارە توربها هەتا نەسورێتەوە ناتوانێت کار ئەنجام بدات. لێرەش دا پەرەکە بەو خولاندنەوەیە هەڵدەستێت.

جگە لەم بوارانە، پەرەکە لە زۆر لایەنی گرنگی تردا بە کاردێت وەك: فروکە و ئامێری پەستاوتن و...هتد.

ئەوەی شایانی باسە ئاشی ئاو نموونەیەکی ساکاری ئامێری پەرەکەیە، کە لە سەردەمی رابوردووی دێرین دا مەبەستە سەرەکی‌یەکەی هارینی باراش بووە. وەستاندنی پەرەکە بوتە هۆی ئاڵوزی خەڵکی و شەکەت و ماندووی کردوون وگیروگرفتی زۆری بۆ ناونەتەوە، ولە رۆژانی ئیمروش دا، کە دەژمێرێت بە سەردەمی تەکنەلۆژیا و ئادەمیزاد لە سایەی زانست دا هەنگاوی زۆر گەورەی بەرەوپێشەوە ناوە، رۆڵی سەرەکی پەرەکە هێنانە بەر هەمی وزەی کارەبایە. لە زوربەی زۆری نیستگەکانی دروست کردنی کارەبادا، پەیداکەری کارەبایی راستەوخۆ، یان ناراستەوخۆ بە بستی پەرەکەوە دەبەسترێتەوە. لە کاتێك دا پەرەکەکە دەسورێتەوە، پەیداکەرەکەش شان بە شانی ئەو دەسورێتەوەو کارەبا دروست دەبێت، ئەو کارەبایەی دەژمێررێت بە شادەماری تەکنەلۆژیا و ئەو زانستە بێ سنوورەی ئیمرۆ لە ئارادایە. بێ گومان لای هەمووان ئاشکرایە تا چ رادەیەك کارەبا تێکەڵ بە ژیانی رۆژانەمان بووە و تا چ ئەندازەیەك بوتە پێویستی‌یەکی زۆر گەورەی ژیان. هەموو وەستاندنێکی پەرەکە لەو نیستگانەدا، کوژاندنەوەی کارەبایە، وە هەموو داگیرساندنێکی ئامێرو ئامرازێکی کارەبایی بەبێ ئەوەی پێی بزانین بارەو دەخرێتە سەر پشتی پەرەکە. جا ئەگەر بمانەوێت لەم هەڵوێستەدا دەرگا لەسەر پەرەکە والا بکەین وتیشکێك رووناکی بخەینە سەر پێویستە بە پێناسەکەی دەست پێ بکەین، لێرەدا دەڵێین: پەرەکە ئەو ئامێرەیە، کە بزوتنەوەیەکی سوراندنەوەیی تێدا دروست دەبێت بە هۆی گۆرانی تەوژمی سێلاوی ئەو شلەیەوە کەپێی‌دا تێ‌پەر دەبێت. یان بە شێوەیەکی تر، پەرەکە ئەو بزوێنەرە سەرەکی‌یە یە، کە بزوتنەوەیەکی سوراندنەوەیی تێدا دروست دەبێت بە هۆی ئەو هێزە چەقە تاودانەوەی کە لە ئاکامی گۆرانی رێبازی هورروژمی ئەو هەڵمەوە دروست دەبێت، کە بە خێرانیکی بەرز لە بوسکەوە فجوق دەکات. یان پەرەکە ئامێرێکی تەموداری پەرەکاوی‌یە تیایدا ماتەوزەی هەڵم یەکەم جار دەگۆرێت بۆ جوولەوزە و لە بوسکەدا بە خێرانیکی بەرز دەر دەفرتێتە دەرەوە، پاشان لە تەمودا دەگۆرێت بۆ وزەیەکی میکانیکی و بست دەسورێنێتەوە. بەگشتی ساکارترین پەرەکە لەم پارچە بنەرتیانەی خوارەوە دروست بووە:

١ـ تەمۆ Rotor or Disc هەندێك پەرەکەیەك تەمۆی هەیە، و هەندێکی تریان خاوەنی زیاتر لە یەك دانەیە.

٢ـ پەر ـ BLade

٣ـ بست ـ shaft

٤ـ بوسکە ـ NozzLe

٥ـ سیوسکە ـ Bearing

ئەم پارچانەی سەرەوە بەم جۆرەی خوارەوە کوکراونەتەوە و پەرەکەیان پێك هێناوە:

تەمۆ بریتی‌یە لە پەچپکەیەکی پان، بەشێوەیەکی توندو تۆڵ و بەچاکی لە سەر بست شەتەك دراوە. لێواری دەرەوەی تەمۆ بەدرێژایی چێوەکەی پەربەند دەکرێت، واتە بە پەری چەماوە دەتەنرێت. بەتەنیشت ئەم پەرانەوە بوسکەی یەك لە دوای یسەك چەسپ کراوە. بۆ ئاسان کردنی خولاندنەوە و هەڵگرتنی بست و تەمۆ، سە رەتا و بنەتای بست لە دوو سیوسیوەدا دادە نیشێت، بروانە وێنەی ـ١ـ ئەم وێنەیە بریتی‌یە لە ساکارترین

قۆنـاغی پەرەکە. لێرەدا سەرتا سەری بنەتای سەرەوەی تەمۆ «٤» پەری چەمـاوەی لێ بەسـتـراوە «١٠». بست «٣٠» بە نیـوە راستی تەمودا تێ پەڕ بووە، و دوو سیو سیوە «لە وێنەیکەدا نی‌یە» بستی راگیرکردووە. ئەوەی شایانی باسە بوسکەکان بە گۆشەیێکی دیاری کراوی لە بار وگونجاو بەرامبەر بە پەرەکان دادەنـرێن. بۆ ئەوەی زیـاتر باسەکەمان بدەینە بەر رووناکی تەمـاشـانیکی وێنـەی ـ٢ـ دەکـەین. ئەم وێنەیە بریتی‌یە لە پەرەکـەیێـکـی سێ قۆنـاغـی. واتـە خاوەنـی سێ تەمـۆیـە، کە بریـتـین لە «٣، ٦، ٨» و لە سەر یەك بسـت «٩» تونـدو تۆڵ قایـم کراون. دوو دیـوار، یان دوو دابڕی کانزایی «٤» ئەم سێ تەمۆیەی لێك جیاکردۆتەوە وسێ بۆشـاییـان لە ناو لەشی پەرەکـەکـەدا دروست کردووە. گوێـزانـەوەی هەڵم لە نێـوان ئەم بەشـانـەدا لە رێگای ئەو بوسکـانـەوەیـە، کە بە درێژایی چێوەی ئەم دابرانە دروست کراون. هەڵم بە پەستانێکی بەرزەوە دەرواتە ناو نۆکەندی «٢» وە، پاشان دەرژێتە بوسکەی «١» وە. لێرەدا پەستانی هەڵەکە دێتـەخوارەوە و خێراییکەی بەرز دەبێتەوە، بەم خێرایی‌یە زۆر بەرزەوە هەڵەکە خۆی دەکات بە پەرەکانی تەمۆی ژمارە «٨» دا. پاش ئەوەی هەڵـەکە لەم پەرانەوە دێتە دەرەوە خێرایی‌یەکەی دادەبەزێت بۆ «C2». بەڵام لە کاتێك دا هەڵەکە بە بوسکەی ـ٧ـ دا تێ پەڕ دەبـێت جارێکی تر دەکشێت و سەر لە نوێ خێرایی‌یەکەی بەرزدە بێتەوە، ئەمەش هۆیێکە بۆ جێ بە جێ کردنی کاری بەسوود لە پەرەکانی تەمۆی ناوەراست دا کە «٦٠».

لە قۆناغی سێ‌یەمیش دا هەمان گۆڕان لە وزەی هەڵەکەدا روو دەدات، لە پاشـان دا پەستـانی هەڵەکە بە تەواوەتی دێتەوە خوارەوە لە رێگای بەشی (٥)وە خاڵی دەبێتەوە.

گۆڕانی پەستان و خێرایی هەڵەکە لەم پەرەکە سێ قۆناغی‌یەدا لە رووکاری تەختی سەرەوەی وێنەی ـ٢ ـدا روونکراوەتەوە. کروکی هاتنە خوارەوەی پەستانی هەڵەکە بە ئاشکرا دەبینرێت. بێ‌گومان هەڵەکە بە بەردەوامی دەکشێت و قەوارەکەی گەورەتر دەبێت. لە بەر ئەمە تەماشا دەکەین بوسکەو بەرزی پەرەکان (قەوارەیان) قۆناغ دوای قۆناغ گەورەتر دەبن. ئەوەی شایانی باسە بە هۆی پەرە چەماوەکانەوە رێبازی هەڵەکە دەگۆڕێت و هێـزێکی چەقـەتـاوەدان بە پێی گۆڕانی رۆیشتنی هەڵەکە لە هەرێیك لەو پەرە یەك لە دوای یەکانەدا دروست دەبێت. لە ژێر زەبری بەرئەنجامی ئەو هێزانەدا پەیتا پەیتا تەمۆ دەسورێتەوە. سوڕانـدنـەوەی تەمۆ، خۆی لە خۆیدا سوڕاندنەوەی بستە. ئەوەی گرنگە گۆڕینی رێبازی هەڵەکەیە. خۆ ئەگەر هاتوو ئەو رێبازە نەگۆڕرا، ئەوا هیچ هێزێك دروست نابێت و تەمۆ جووڵە ناکات. بۆ ئەوەی زیاتر ئەم لایەنە روون بکەینەوە تەماشانیکی وێنەی ـ٣ـ دەکەین. لە ـأـ دا هێزی چەقە تاوەدان یەکسانە بە سفر، چونکە رێبازی رۆیشتنی هەڵەکە نەگۆڕا. بەڵام لە ـبـ دا چونکە رێبازی هاتنە دەرەوەی هەڵەکە دەگۆڕێت، لێرەدا هێزەکە دروست دەبێت و لە ئاکـام دا خولانـدنەوە پەیدا دەبێت. بێ گومان پەرەکە لە سەر هەمان بنەما کاردەکات.

پەراوێز

سیو سیوە ـ Bearing

لە لاپەرەـ ٨٧ـی گۆڤاری کاروانی ژمارە ـ٥٢ـدا، لە لایەن کاك «مـولود قادر بێخـاڵی»یـەوە نووسینێکی زۆر چاکی فولکلۆری دەربارەی «ئاشی ئاو» بڵاوکراوەتەوە.

لە وێدا ئەو ئامێرەی بەرداشەکە دەسوڕێنێتەوە پەرەکەیە. لەو نووسینەدا ناوی هەندێك لە پارچەکانی پەرەکە هاتووە، کە لە کاتی خۆیدا باپیرە گەورەکانمان ناویان بۆ دۆزیونەتەوە وئێستا پێویستمان بە داتاشینی زاراوە نی‌یە بۆیان. لە لاپەرە ـ٩٣ ـ دا وێنـەیێـك نیشـانـدراوە. لە ژێـر تەمـۆی ئەو وێنـەیـەدا بەردەگەورەیە و بست بە ئێویدا تێ‌پەڕ بووە ولە ناو چاڵێك دا لە سەر خوانـە دانیشتـووە. ئەو چاڵە شوێنی «Bearing»ی ئێستـایـە، کە مام «محمود اسماعیل احمد» بە «سیو سیوە» ناوی دەبرد. ئەم مام محمودە لە دایك بووی ساڵی «١٩٣٠»ە وخـەڵکی گوندی عەسکەرە و نزیکەی ٢٠ ساڵ لە ئاشی ئاودا کاری کردووە، و ئێستا لە کارگەی جگەرەی سلیمانی کرێکارە.

سەرچاوەکان

1- Power Plant Engineers Guide BY- FRANK D. GRAHAM

2- FundamentaLs of heat engineering and hydrauLics BY- A. CHER-NOV N. BESSREBRE NNIKOV.

3- Power Plant Theory and design 2- edition BY- PHILIP J. POTTER

گۆڤـاری کاروانـی ژمـارە ـ٥٢ـ - 4



## لە یادی نەمراندا



# اسماعیل شاویس نووسەرو نیشتمان پەروەر

طاهر صالح سعید

لەنێو ئەم گەلی کوردەی ئێمەدا چەندین کەڵە پیاوی دڵسۆز بەخاک و نیشتمانەکەیان هەلکەوتون ئەوەندەی رۆژگار دەرفەتی دابن و هەڵیان بۆ رەخسابێت . خزمەتی گەورەیان بەگەل ونەتەوەی خۆیان کردووەو هەرگیز کەمتەرخەمیان نەکردووە .

یەکێک لەوگەورە پیاوانەی مێژووی ئەم گەلە خۆکرو کۆڵ نەدەرە هەردەم شانازی پێوە دەکات و لەبیری ناکات . نووسەرونیشتمان پەروەر مامۆستا ( ئیسماعیل حەقی شاوەیس )ە . ئەو پیاوە مەردو بەجەرگەی تائەو رۆژەی بۆ دوواجار دڵەگەورەکەی لەلێدان کەوت و ماڵاوایی لەمژیانە کرد. لەرووی ئەموئەودا جەنگا . لەپێناو خۆشبەختیو سەرفەرازی میللەتەکەیدا . بۆ گەیشتنیش بەئامانجەرەواو پیرۆزەکانی زۆر سزاو دەربەدەری و زیندانیو دورخستنەوەی چەشت .

ئیسماعیل شاوەیس لەتەک ئەوەدا کەسەربازێکی ناسراوی رێگەی نیشتمان پەروەرێتیو کۆڵ نەدانو نووسەرێکی بالای دنیای نووسین و بلاوکردنەوە بو کەچی کەمتر بایەخی پێدراوەو ، لەوەش کەمتر ناوی هێنراوەو بیرخراوەتەوە. کە دەبو تەواو بەپێچەوانەی ئەوەوە بووایە .

هیوادارم ئەم بەسەرکردنەوەیەی ئێمە ببێتە هاندەرێک لەبەردەم قەلەمی بەبڕشتی هەموو ئەو کەسانەدا کەئەوکارە بەپیشەوکاری خۆیان دەزانن .

### مێژووی ژیانی : (١)

ئیسماعیل حەقی شاوەیس ناوی تەواوی ئیسماعیل

عەلی رەسول ئەحمەدە . لەسالی ١٨٩٦ ز بەهـــۆی ئەوەوەی کەباوکی لە ( موسل ) ئەفسەر بووە ،لەوێ لەدایک بـــووە .

لەسالی ١٩٠٣ تا وەکو سالی ١٩٠٨ لەقوتابخانەی ئامادەیی رەشیدییەی عەسکەری لەسلێمانیو بەغدا خوێندویەتیو بەروتبەی ئەفسەر دەرچووە لەسالـــی ١٩٠٩–١٩١٢لەقوتابخانەی جەنگ لەشام خوێندویەتی.

لەسالی ١٩١٣دا بەشداری شەری ( بالقـــان )ی کردووەو لەشاری ( سلانیک ) بەدیل گیراوە. بـــە دوایدا چووە بۆ ئەستەنبول و لەسالی١٩١٣–١٩١٤ بەشداری جەنگی جهانی یەکەمی کردووە .

لەمانگی شوباتی ١٩١٨دا گەراوەتەوە بۆسلێمانیو ئەودەمەش شەر لەنێوان ( شیخ مەحموودی حەفید )و ئینگلیزدا بەرپابوو بو .

لەسالی ١٩١٩دا نوێنەری کوردستان بو بۆگفتو گۆکردن لەگەل ژەنەرال ( فرایزەر )و مێجەر (سۆن) ی حاکمی کوردستان . دەربارەی مەسەلەی کـــوردو باری کوردستان . ئەوەبو لەوگفتوگۆیەدا هەموو ئەو تاوانانەی پووچو ریسواکرد کەئینگلیزەکـان دەیانخستە پاڵ گەلی کورد. لەوەش زیاتر گشـــت لێپرسراوییەکی ئەو وەزعەی خستە ئەستۆگەردنـــی ئەوان و پێی وتن ( دەتووانن کوردستان داگیـــر بکەن . بەلام هەرگیز ناتوانن بچنەدڵ ودەروونـــی گەلی کوردەوە ) .

لەوەرامی ئەو قسەیەدا پێی دەڵێن ( کاتێـــک ئێمە موزەکەرەی ئیستیقلالی کوردستانتان لەگەلدا دەکەین . کەناوچەی سلێمانیهان تەسلیم بکـــەن و ئەسیرەکانمان بەساغوسەلامەتی بدەنەوە دەست . )

ئیسماعیل شاوەیس دەنووسێت ( ئەوەی ئیعلانـــی شەری کوردستانی کرد ئێوە بوون . ئێوە مەسئولن بەرانبەر هەر خەسارەتوزیانێک کە لەئەنجامـــی ئەو شەرەدا رووی دابێت .)

هەروەها دەنووسێت ( ئەبێت بەپـــــێی ئـــەو موعاهەدەی؟ئێمەوئێوەدا بە ئیستقلالی کوردستـــان موحافەزە بکرێت و چی خوێنێک رژاوە حکومەتـــی کوردستان و ( شیخ مەحموود )ی مەلیکی کوردستان مەسئول نییە بەرانبەری .)

دوواجار دەنووسێت ( گوناهی ئەو خوێنەی رژا ، لەئەستۆی ئێوەیـــــە ).

لێپرسراوانی ئینگلیزی ئەورۆژە بەوە قایـــل نابن پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە دەبێت ئـــەوان هەموو شتێک بن و شۆرشی کورد بدرێتە دەســـت ئەوان . چونکە ئەوان لەشکری کۆک و بەهێزیـــان هەیەو لەوەش زیاتر دەتوانن سوپای دی لەبەغداو بەسرەو تەنانەتگەر پێویشتی کرد لەهیندستـــا نیشەوە بێنن . ئەوسابەئاسانی دەتوانن دەســـت بەسەر سلێمانی و کوردستان دابگرن .

ئیسماعیل حەقی شاوەیس لەوەرامی قسەکانـــی ئەوان دا دەڵێت ( مەسئوولیەتی جەنگی دوێنـــێو ئەمرۆ لەمل وگەردنی ئێوەیە ).

جەنەرال فرایزەر دەڵێت : کەوایـــە بـــۆ دیل وبەندەکانتان کوشتین ؟ بۆ دەستان گرت بەســـەر پارەوپوولێکی زۆرمان دا ؟ بۆ چەک وجبەخانەیەکی زۆرمانتان برد ؟

شاوەیس پێی دەڵێت ( پارەو پوول و چەک و جبە خانەی ئێوە دەست ئێمە کەوت و وەک ( غنائـــم )ی حەرب بۆخۆمان رەوابینی .

بەلام بۆ مەسەلەی دیل وئەسیرەکانتان هەرگیـز وەک ئێوە دەڵێن وانییە. نەکوژراون ونەلەناوبش چوون . بەپێچەوانەوە معامەلەی ئێمـــە لەگـەل ئەواندا معامەلەیەکی ئینسانییانەیە.

بەو وەلامانە ، بەتایبەت وەلامی دواییـــان زۆر دڵ خۆش دەبن . چونکە تائەوکاتە لەوان وادەبێت ئەسیرو دەستبەسەرەکانیان کوژراون و لەنـــاو چـــــوون .

هەر لەوساڵەدا ، واتە لەساڵی ١٩١٩دا لەرێگەی

( تەبریز )ەوە چووەتەوە بۆ تورکیا و لەساڵی ١٩٢٥دا بەشداری جەنگی ( ئاراس قارس ) و بەپلەی یوزباشی لەریزی سوپای تورکیادا هاوبەشی شەری سەربەخۆیی تورکیای کردووە.

لەساڵی ١٩٢٧دا گەراوەتەوە بۆ عیراق وبۆتە مامۆستا. هەر لەهەمان ساڵ و چووە بۆ پاریس. لەساڵی ١٩٢٨دا گەراوەتەوە بۆ عیراق و چووەتە ریزی سوپاوە. بەڵام هەرزوو ئینگلیزەکان لەریزی سوپادا دەریان پەراندووە. بەبیانووی ئەوەی هێرشی بردووەتە سەرشای عیراق.

لەساڵی ١٩٣٣دا دووبارە چووە بۆ ( پاریس )و لەساڵی ١٩٣٥دا چەند:چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ پیاوانی ناودارو رۆژنامەکانی ئەوێدا ساز کردووە بەهیوا ومەبەستی بەرچاوخستنی رووی گەشی شۆرشی کوردستانی تورکیا. واتە شۆرشەکەی شیخ سەعید.

لەساڵی ١٩٣٦دا لەسەردەمی ( یاسین پاشا )دا گەراوەتەوە بۆ عیراق و کراوەتە قایمقامی ( ئاکرێ ) و دووای هەشت مانگ بەسەر ئەو کارەیدا فەسل کراوە.

لەساڵی ١٩٣٩دا بۆجارێکی کە گەراندوویانەتەوە سەرئیشو کردوویانەتە قایمقامی (رانیە-مەخموور) دیسان هەر لەوساڵەدا دەستی لەوەزیفە کێشراوەتەوەو دوورخراوەتەوە لەوەش زیاتر لە بەندیخانە توند کراوە. ئەم بەندیخانەو ئەو بەندیخانەی پێکراوە. لەوانە سلێمانی، بەغدا دیوانییە ، رەمادی.

مارف جیاوک[٢] لەو ووتارەیدا کە لەچلەی پیرەمێردی شاعیردا خوێندیە دەڵێت ( لەدووای شەری گەورەی پێشوو، کە ئینگلیزەکان بەدیلی بردمیان بۆ ( بۆرما ) خوالێخۆشبو مەحمود جەودەت و ئیسماعیل شاوەیسیان هێنا . کەوتینە رازوگلەیی دەردی کوردایەتی ).

لەساڵی ١٩٥٢بۆ ساڵی ١٩٥٥ ئەفسەری ئیرتباتی ( دەربەندیخان ) و ( کۆمپانیای دومیز بالو)ی ( دوکان ) بوە. بەدووایدا بۆ ( شامیە ) دوورە خراوەتەوە. ئینجا ئر بۆ ( دیوانییە ) پاشانیش بۆ ( رەمادی ) نێردراوە .تاساڵی ١٩٥٦ لەوێ ماوەتەوە. لەساڵی ١٩٥٩دا بۆجارێکی تر ئەفسەری ئیرتیباتبووە.

لەساڵی ١٩٦٩دا بۆجارێکی تر گیراوەتەوە.

* * *

( ئیسماعیل حەقی شاوەیس )[٣] لەساڵی ١٩٣٧دا بەکۆمەک لەتەک کۆمەڵێک لەنیشتمان پەروەرانی ئەوسای کورد دا ( کۆمەڵەی برایەتی کورد ) یان دامەزراند. ئەو یەکێک بو لەئەندامە چوست و چالاکەکانی ئەو کۆمەڵەیە. زۆرجار بەنیاز و مەبەستی پەیوەندی کردن بەکوردە دیارونیشتمان پەروەرەکانی کەرکوک و دەوروبەری کەرکوکەوە لە هاتوچۆدا بووە.

* * *

ئیسماعیل حەقی شاوەیس وەک چۆن نیشتمان پەروەرێکی گەورەو دیار بووە. هەربەو پێیەش خوێندەوارێکی چاکی سەردەمەکەی خۆی بوەو یەکێک بوە لەو روناکبیرانەی زۆری خوێندوەتەوەو کەمی نوسیوە. لەسەرەتادا یەکەم سەرچاوەی خوێندنەوەو خۆرۆشن بیرکردنی بریتی بووە لەزمانی تورکی و فارسی . بەڵام بەدامەزراندنی حکومەتی عیراق دەروازەیەکی تری بۆ کراوەتەوە کەئەویش فێربوونی زمانی ئینگلیزی بووە. دەربارەی فێربوونی زمانی فەرەنسیش بەهۆی چوون و مانەوەی لەپاریس و ئینجاش لەئەستەمبول بەباشی فێری ئەو زمانە بوە. لەم رووەوە مێژوو نووس دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد دەنووسیت[٤] ( هەروەها مێژوونوسی ناسراو، محەمەد ئەمین زەکی و

ئیسماعیل حەقی شاوەیس و چەند کوردێکی تری عیراقی بەهۆی خوێندن وکارکردنیانەوە لە ئەستەنبول فێری زمانی فەرەنسی بوون .)

رۆژنامەی ( تروشاک ) واتە ( ئالا ) کەزمانی حالی داشناقیەکان بوەو حیزبێکی ئەرمەنی بوە هەندێ نامەو وتاری گرنگی ناوداری کورد ئیسماعیل حەقی شاوەیسی بڵاوکردۆتەوە (٥) .

ئیسماعیل شاوەیس لەسەردەمی ( شێخ مەحمود )دا یەکێک بوە لەوروناکبیرانەی لەشێخەوە نزیک بوە هەر لەو سەردەمەدا بوە کە نازناوی (شاوەیس) ی بۆخۆی هەڵبژاردووە . کاتێک کە لە (بێستان سور) بوە . بەڵام وەک نووسین شتێکی ئەوتۆی نەبووە . تا ساڵانی شەستەکەئەوەبو بەتەواوی لەسەر گۆڤاری ( رۆژی نوێ ) (٦) سەقامگیر بو وبەردەوام نوسینەکانی بۆ ئەوان دەنارد ، کەم ژمارەی ئەوگۆڤارە رێدەکەوت نووسینی ئەوی تێدا نەبێت .

چاپکراوەکانی نووسەر :

١- قسەی پێشینان کۆست ولۆبۆن
٢- پروپوچی پێشینان و مەتەڵ

شتێک دەربارەی ئەودوو چاپکراوە:

یەکێک لەکتێبۆکەکانی - وەک خۆی دەنووسێت- قسەی پێشینان کۆست ولۆبۆن لە(٧) بریتیە لەکۆمەڵە پەندێکی پێشینانی کوردوبیانی . کۆی کردونەتەوە و لەساڵی ١٩٣٣ دا لەبەغدا ، چاپخانەی ( أیتام ) بەچاپی گەیاندووە .

لەپێشەکیەکی کورتدا کەلەژێر ناوی ( دوو سێ قسە )دا بۆی نووسیوە دەڵێت : قسەی پێشینان ، حەیف ومەخابن لەلایەن خەڵک و تێگەیشتوانەوە وەک جاران بەکار ناهێنرێن و زۆری فرێدراوە . وەلەناو گەڵدا ون بووەو بزریش ئەبێت . لەم قسانە هەرچیەکمان دەست کەوت لەم کتێبوکە نووسی .

ئەمە هەر بۆکورد نەنوسراوە . چونکە لەدنیادا هەر کورد نیە . غەیرە کوردیش هەیە . ئەوانیش برامانن . ئێمە بەوانەوە . ئەوانیش بەئێمەوە بەیەک مەنفەعەتەوە بەستراون . وەبەمچەشنە ئینجا ئەتوانین بەگیانێکی ئاسوودە بژین .

ئینجا هاتووە ئەو پەندانەی دابەش کردوون بەسەر پەندی سیاسی (٢٢) پەندی ئەدەبی و ئیجتیماعی (٢٠٤)پەند . پەندی ئیقتصادی ( ٦٨ ) پەند . گاڵتەوگەپ ( ١١٩) پەند .

پاشان دێتەسەر قسەی پێشینان کۆست ولۆبۆن گۆتەی مەزنان و فەلسەفیەکان . کەبریتیە لە گۆتەی پیاوانی مەزنی دنیا . لە (٥٩) لاپەڕەدا .

دووەم چاپکراوی ( هەندێ پروپوچی پێشینان و مەتەڵ) لەساڵی ١٩٣٨دا لەچاپخانەی ( نجاح )لە بەغدا بەچاپی گەیاندووەو بڵاوی کردۆتەوە .

ئەمیشیان بریتیە لە ( ٤٨) لاپەڕە : تێکرا لەم باسانەی خوارەوە دەدوێت:
خورافیات ، ئاداب وئیجتماعیات ، ئاگر ، حەیوانات ، بۆلەش ساغی .
پاشان دێتەسەر بەشی ( مەتەڵ ) .

* * *

ئیسماعیل حەقی شاوەیس ، نیشتمان پەروەرێکی خاوێن ومرۆڤێکی ئازا وبەجەرگ بو . روناکبیرێکی دنیادیدەو لەخۆبوردوو بو . ئاگربو لەرووی داگیرکەردا . تێکڕای ژیانی دوورخستنەوەو دەربەدەریو زیندانی بو . نەبوونیو دەست بەتاڵی زۆر بەخۆیەوە دی . لێرەولەوێ بەکرێکاری ووێنەگرتن خۆی ژیاندو سەری بۆکەس شۆڕ نەکرد .

ئیسماعیل شاوەیس رۆژی چوارشەممە رێکەوتی ١٩٧٦/١٢/١٢ بەهۆی وێستانی دڵیەوە چاوی لێک ناو مالاوایی لەمژیانە کرد . دووای ئەوەی لاپەڕەیەکی پڕ لەشانازی وشکۆمەندی بۆخۆی و بۆئێمە جێ هێشت .

### سەرچاوەکانی ئەم باسە:

١) نامەیەکی تایبەتی دەربارەی مێژووی ژیانی کەبەمێژووی ٣ی ئاداری ساڵی ١٩٧٦بۆماموستا ( عبدالرقیب یوسف )ی ناردووە. لەوەرامی نامەیەکی ماموستای ناوبراوداکە بەمێژووی ١٩٧٦/٣/٢ لە ( بەعقوبە )وە بۆی رەوانە کردووەو، داوای مێژووی ژیانی لێکردووە .
یەکێتی نوسەرانی کورد - لقی سلێمانی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی / ١٩٧٢ کورێکی فراوانی بۆ رێزلێگرتن لەسێ نوسەرو شاعیری پایەبەرز لەهۆڵی ( یانەی فەرمانبەران ) ، سازکرد. کەبریتی بوون لە ( ئیسماعیل حەقی شاوەیس ، رەمزی مەلا مارف ، عەلی کەمال باپیر ) لەوکورەدا ماموستا شاوەیس ئامادە نەبو، بۆئەو مەبەستە سکرتێری رۆشنبیری ئەوسای لقی یەکێتی نووسەران لەسلێمانی ( نووسەری ئەمباسە ) پێشتر یدەنی کردو گەلێک زانیاری دەربارەی مێرووی ژیانی ئەدەبیو سیاسی لەخۆی وەرگرت ولەبری ئەو لەوکۆڕەدا پێشکەشی کرد.

٢) یادی پیرەمێرد، لاپەرە (٥٦)مارف جیاوک لەسەر حسابی یانەی سەرکەوتن و لەژێر چاودێری علاء الدین سجادی لەچاپ دراوە .ساڵی ١٩٥١ ، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا .

٣) دەست نووسێکی خوالێخۆش بوو ( مەلائەسعەدی مەلاخالیدی مەحوی ) .

٤) کردستان فی سنوات الحرب العالمیە الاولی الدکتور کمال مظهر احمد- صفحە (٧٧)

٥) هەمان سەرچاوە . لاپەرە (٢٧٥)

٦) ئەو نووسینانەی بۆ ( رۆژی نوێ ) ی نوسیون بەتەکلیفی تایبەتیو لەسەرداوای ( کامەران موکری ) شاعیر بووە. کە ئەودەمە ئەندامی دەستەی نووسەران وسەرپەرشتکاری گۆڤارەکە بووە. زۆربەی نووسینەکانیشی بابەتی مێژووی ، بوون . لەوانە :

١- شەڕی قۆچ گیرەکان - بەزنجیرە .
٢- ناودارانی کورد - مەلاسەلیمە فەندی ( رۆژی نوێ ) ژمارە (٨) تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٠ .
٣- میر عبدالرزاق بدرخان - ژمارە ( ٧ ) ، تشرینی یەکەمی ساڵی ( ١٩٦٠ هەمان گۆڤار .
٤- خەباتی گەلی کورد لەرۆژەکانی جەنگی گێتی یەکەمدا لەدەرەوەو ناوەوەی کوردستان ژمارە (٩) کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٠) - هەمان گۆڤار .

٧) ئەم کارەی ماموستا ( شاوەیس ) سەبارەت بە ئاوردانەوەو بایەخ پێدان بەووتە بەنرخەی پێشینان . بەیەکەم هەوڵێک دادەنرێت کە درابێت لەمەیدانی کتێبی سەربەخۆدا . هەر چەندە لەم بارەیەوە جاروبار لەرۆژنامەو گۆڤارەکانی پێش ساڵی ١٩٣٣ هەندێ هەوڵی سەرەتایی دراوە .
بەر لەوکۆششەی ماموستا (شاوەیس ) بەبیست ساڵێک ( شوکری فەزلی ) شاعیرو منەوەر .لە ساڵی ١٩١٣دا چەند پەندێکی کوردی تۆمار کردووەو بەپەندی عەرەبی بەراوردیان کردووە.
بروانە گۆڤاری ( رۆشنبیری نوێ ) ژمارە(١١٢) ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٦. (پەندی کوردی) ئازاد عەبدول واحید .

٨) بیری نوێ ژمارە ١٩٢و١٩٧ مانگی پێنجوشەشی ساڵی ١٩٧٦ .

٩) اسماعیل حقی شاوەیس واهتماماتە المبکرە بقضایا الفولکلور . رۆژنامەی ( العراق ) رۆژی ١٩٧٦/٧/٥ .

رەخنە

# پانتایی پرسیارو تێڕامانی وەستاوو لە شیعری (لوتکە)ی کەریم دەشتیدا

نووسینی عەتا قەرەداغی

کەریمدەشتی بەکێکە لەوشاعیرانەی کەلە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە هەستی بەقەیرانی شێوازوئەزموونی ( روانگە )یی لەشیعری کوردیدا کردوو و لەسەر ئەوبنەمایەش هەوڵیداوەشێوازێکی نوێ، ئەزموونێکی نوێ کەتوانای هەڵگرتنی پرسیارەکانی ئێستای مرۆڤی کوردی هەبێت بدۆزێتەوە. کەریم لەسەرەتاوە زیاتر خۆی لە تەمومژو تێکشکاندنی زمان دەئالاندو ئەمەش وای دەکردکە (مانا ) لەنێو پرۆسەی تێکشکاندنی زمان دا ون بێت وئەودەمەش دەق لەرووی دروستکردنی پرسیارو جیهانبینییەوە بەرجەستە نەبێت ، بەڵام هێدی هێدی کەریم لەبازنەی تێکشکاندنی بێنەمای زمان دوورکەوتەوە ئەمەش بەرەو ئاسۆیەکی تری پاڵنا ، ئاسۆی بنیادنانی دەقی خاوەن پرسیار ( تەمە سپییەکانی رۆحو کۆمیدیای باو...) چەند دەقێکی تریشی راستی ئەم قسەیەمان دەسەلمێنن هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم ئەوەنییە کە بڵێم کەریم توانیوویەتی ئەزموونێکی نوێ بنیادبنێو بەوپێیەش گوتارێکی نوێی ئەدەبی بخولقێنێ .

بەڵام دەشتی لەریزی هەرەپێشەوەی ئەو دەنگانە دانریێت کەدەنگی دوای ( روانگە)یان( شێرکۆ ) حیساب دەکرێن ، کەریم لەوچەند دەقە زیندووەی کەفرێی داونەتە پانتایی سیوسیو رۆشنبیری کوردییەوە هەوڵی دۆزینەوەی شێوازێکی نوێی شیعری داوە کەتوانای هەڵگرتنی پرسیاری نوێی مرۆڤی کوردی هەبێت ، ئەمئاستی تێروانینەش سەرەتای دروستکردن درزێک بووە لەئەزموونی ( روانگە )دا ، درزێک کەلێیەوە پانتایی بەرەو قەیران چووی ئەو ئەزموونە ئاشکرادەبێتەیەکێک لەخەسڵەتی دەقەزیندووەکانی کەریم کەراستەوخۆ پێچەوانەی ئاراستەو ئەزموونی روانگەیە ئیش کردنە لەودیووی سنووری ئایدیۆلۆژیای سیاسیەوە ئەمەش دەمانگێرێتەوە بۆ خالێکی گرنگتر ئەویش ئەوەیە کەئیش کردن لەودیووی سنووری ئایدیۆلۆژیای سیاسیەوە مانای هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ( پرسیارەکانی تری ) مرۆڤ ، پرسیارەکانی وجودو حەقیقەتی بوونو بەرجەستەکردنی ئەو پرسیارانە لەسنوورێکدا کەسیاسەت پەی پێ نەبردبێت . ئیش کردنیش لەو بوارەدا واتە رەتکردنەوەی بەئاگاییو موتلەقی رەهاو گەیشتن بەنەستونائاگاییو تێروانینی رێژەیی بۆ هەموشتەکان ، دیسان کەریم هەوڵیداوە زیاتر لە چەمکی ئەفسانەو جوانییەکانی شوێنو حەقیقەتی پرسیارە گەوهەرییەکانی مرۆڤ نزیک بێتەوەو گەران لەدوای جیهانبینییەکی لەم جۆرەش تا سنورێک بۆتەهۆی شکاندنی شێوازی روانگەیی بەڵام نەیتوانیوە شێوازێکی تایبەت و خاوەن سیفاتی تایبەتی بنیادبنێ، بەڵکو زۆربەی کات لەگومانی گەرانەوە بۆ ( شێوازی روانگەیی ) یان دابران لەوشێوازەدابووە . دیارە هێشتائەزموونی شیعری کەریم هێند ی بەسەرداتێنەپەریووە هەتا بریاری کۆتایی لەسەر بدرێت بۆیە من وای بۆ دەچم ئەگەر زیاتر لەدوای شیعریەتودۆزینەوەی

یاری نوێو بەواتا جیهانبینی نوێ و بەو ەش شێوازی نوێ بگەرێت ئەوا دەبێتەیەکێک دەنگە دیارەکانی شیعری کوردی ، من لێرەدا ولدەدەم یەکێک لەشیعرە کورتەکانی لەرووی تراکتوری پێکهاتنییەوە بخوێنمەوە بەوهیوایەی ای شیکردنەوەی شیعرەکە هەندێ لەوبۆچونانەی ەرەوە لێیان دوام بۆ خوێنەری ئازیز ئاشکرا ت .

دەقی شیعرەکە:

دەق : کەریم دەشتی
کات : ساتەوەختێ جاوێدان
شوێن: مەیلەکەتی هزر

لوتکە

تۆزێ ئاسمان ، تۆزێ زەوی
تۆزێ هامونی بەرزەڕێ
تۆزێ لوتکەی کپ ونەوی
هێندێ مەلو هێندێ تروسکەی سەرشێت و
یاوەشی با
ەودای نەهەنگی هزریان دارماڵی ئازار کردوە
ئەوەمن دواسواری پێشەنگ کوژە
کزنگ وئاسۆ تێکەڵی یەکدی ئەکا
ئەمشێری ناخی ئەمناوەی پڕ لەبروسکە کردووە
دێوی زلی چاخ نخونی لەت لەت ئەکا
تۆزێ درەخت ، تۆزێ هەناسەم پێدەوێ
تۆزێ سێبەر ، تۆزێ خەنجەر
تۆزێ تێڕامان ودامان ، تۆزێ وونبوون
خۆهەڵواسین بەدارکاژی سەوزی مەژی
تۆزێ زیندەگیم پێدەوێ بۆ خود کوژی
نەختێ مەرگ ونەختێ زیندەگی پشکۆبار
تۆزێ خنکان ، تۆزێ مەلەوشەختەزانی
لەسیتەما پشکۆرێژن بۆ دەروازەی جاوێدانی .

بکەری شیعرەکە ( من ) لەساتەوەختێکدا دێتە ئاخافتن کەشاعیر لەدەرەوەی دەقەکەدا ناوی دەنێ ساتەوەختی ( جاوێدان ). کەدیاریکردنی کات لەوشێوەیەدا بۆخۆی دەلالەتێک هەلدەگرێت و لەکاتی ئاسایی جیای دەکاتەوە ، ئەمەش گرنگی پێدانی کاتە کەپەیوەستی پێکهاتنی خودی بکەرە ، بەلام کاتی ( جاوێدان ) نەبۆتە زەمەنی جوڵەو پرۆسەی نێو شیعرەکە بەڵکو وەکو کاتێک ماوەتەوە کەپرۆسەی بەرهەمهێنانی شیعرەکەی تیا ئەنجام دراوە .

لەبەردەوام بوونی جوڵەی شیعرەکەدا ئەوە ئاشکرا دەبێت کەکات لەشیعرەکەدا کاتی تێرامانە کاتی تێرامانیش خوردبوونەوەو گەڕانەوە بۆ دنیای ناوەوەی خود بەرهەم دێنێت . بەواتا (بکەر ) لەساتەوەختێ گەڕانەوە بۆ ناوەوەوغائیب کردنی دەرەوەدا دێتە دواندن ، گەرچی دروست کردنی حاڵەتی تێرامان بەمەبەستی گەیشتنە بە دەرەوە ، واتە ئامادەکردنی زەمینەی دەرەوە بە مەبەستی دابین کردنی پێداویستییەکانی ( من) بۆ فۆرمەلەکردنی ( خود ) و پیادەکردنی ویستەکانی ئەویش دوای ئەوەی کەسیفاتی ( بوون) وەکو ئەفریدەیێک مسۆگەر دەکات .

سەرەتای دەقەکە کراوەیە بەرووی دنیایەکی نەناسراودا ، زەمینەیەک کەهیچ ناسنامەیەکی ئاشکرای نییە ، بەڵکو لەبۆشاییەک پێکهاتووە ، ئەوەش ئەو دەلالەتە بەرجەستە دەکات کەبکەری شیعرەکە لەباری تێراماندایە ، باری تێڕامان مرۆڤ لە (کات )ی ئێستای تێرامانەکەو لە (شوێن)ی تێرامانیش دەکاتەوە ـ واتە ( خود ) دەبێتە خودێکی پەرت بوو . لەشوێن ولەکات . ئەمەش دەلالەتی نامۆبوون هەڵدەگرێت کە لەبارێکی تردا ونبوونی ناسنامە دەگەیەنێت . ( خود ) بەناخی شتەکاندا دەچێتە خوارێو شۆردەبێتەوە ، لەوێرا لەئەنجامی ئەو خوردبوونەوەیەدا لەناسینی

ناوەوەو بەوپێیەشی پێویستییەکانی دەرەوە بۆ تەواوکردن و هاوسەنگ کردنی خۆی تێ دەکات. لێرەوە ( من)ی بکەر کەلەخودی خۆی رادەمێنێت دەگاتە ئاستی خوێندنەوەی جەستەی خۆیی و لەوێشەوە دۆزینەوەی پێداویستییەکانی ئەو جەستەیە. کەپێموایە حالەتی تێرامان لەئەزمونی روانگەو ( گوتاری مانەوە)دا نەیتوانیوە بەو ئەندازەیە جێگای خۆی بگرێت. بەڵکو بە پێچەوانەوە حاڵەتی بریاری خێرا و خودسپاردن بە یەقین لەو ئەزموونەدا بالادەست بووە ، لێرەوە کەریم لەئەزموونی خۆیدا هەنگاوێک بەپێچەوانەی ئاراستەی ئەزموونی روانگەوە دەنێ ، لەباری یەکەمدا ئەم ( پرۆسەی بەرەو دابران چوون و تەماهی نەکردنەوە لەگەڵ وێنەی باوکدا ) واتە گوتاری روانگە تارادەیەک تایبەتمەندی بەدەنگی کەریم داوە، بەڵام دواجار نەبۆتە دابرانی تەواوەتیو بەوپێیەش ببێتە ئەزموونێکی نوێ ( من )ی بکەری شیعرەکە لەئەنجامی تێرامان و گەرانەوە بۆناخی خۆی دەرک بەدەرەوە دەکات و تێدەگات بۆ فۆرمەلە کردنی (خود)و گەیاندنی بەئاستی پراکتیک کردن چی پێویستە ، لەوێرا ( هزر) پنتی دروستکردنی جولەیە ، بۆیە دەرک کردن لەوپنتەوە ئاراستە دەکرێ و پێداویستییە کانیش کاریگەری لەسەر ئەو پنتە دیاری دەکەن، ئەوەی ( من ) دەیخوازێت بۆتەواوکردنی (خود)و گەیاندنی بەئاستی جولەوپراکتیک . لەرابردووەوە بۆ ئێستا ( هزر ) یان دووچاری ئازارکردووە ،یان لەبارێکی تردا حالەتێکی نائاسایان لەوپنتەدا ( هزر) دروستکردووە کە خودی شاعیر بە ( مەملەکەت ) ناودێری کردووە ، ئەمەش دەلالەتی ئەوە بەرهەم دێنێت کە لەتێروانینی شاعیرەوە ( هزر) پانتاییەکی یەکجار گەورە داگیر دەکات ئەمەش لەروانگەی روانین بۆ خوێندنەوەی مێژووی ( من )و ئامادەبوونی لەدەرەوەی دەقەکەدا ئەوە

بەرجەستەدەکات ، ئەگەر ( هزر ) پانتاییەکی فراوانی داگیرکرد واتە ئامادەبوونی ( من ) وەکو خودی بکەری شیعرەکە مسۆگەر دەبێت . نا ئامادەبوونی ( هزر ) ناکردەییو بەوپێیەش نا ئامادەبوونی ( من ) دەگەیەنێت . هەر لێرەوە بارێکی هاوشان لەنێوان ( کات وشوێن )دا بەپێی ( من)ی بکەر پێک دێت کەزیاتر ئەو دیاری کردنەی شاعیر دەگەیەنێتە حالەتێکی شیعری و لە دەرەوەی دەقەکەوەیان گوازیتەوە بۆ ناوەوەی دەقەکە ئەویش لەهاوشان بوونی( ساتەوەختی جاوێدان / مەملەکەتی هزر)دا خۆی دەبینێتەوە. ئەگەر ( هزر ) فاکتەری ئامادەو جولە دروستکەر بێت ئەوا مێژوو دەبێتە ( ساتەوەختی جاوێدان ) ئەوەش ئەوە بەرجەستە دەکات کە ( من )ی بکەر بەکاریگەری بەگرنگی وەرگرتنی زەمەن ( کات) دەگاتە ئاستی تێرامان و لەحالەتی تێرامانیشدا داوەکانی خەیال فراوان دەبن و مەودای دۆزینەوەی ( هزر) ئاشکراتر دەبێت ، کەواتە لێرەدا ماهیەتی ( من)ی بکەری شیعرەکە ئاشکرا دەبێت کەکەسێتییەکی سەوداسەرە لەدوای دۆزینەوەی ناسنامەیەک دەگەرێت ، ئەوناسنامەش دۆزینەوەی ( یەقینێک ) دەگەیەنێت ، بەڵام ناتوانێت بەرەهایی شتەکان وەربگرێت بۆیە تێرامان دەبێتە حالەتێک هەردەم تێیدا دەمێنێتەوە ، لێرەشەوە بەرەوگەرانی بەردەوام دەجولێت و ( هزر ) رۆڵی کاریگەر دەبینێت لە دروستکردنی پرۆسەیەکی هەمیشە لەجولاندا بۆ دۆزینەوەی توخمە پێویستەکانی( خود ) و فۆرمە کردنی خۆی .

( من )ی بکەر لەرستەیەکدا ناسنامەی خۆی پێشکەش دەکات ، ئەویش دوای تێرامان دەگاتە ئاستی دان پیانان ( ئەوە منم دوا سواری پێشەنگ کوژە ) ، حاڵەتی دان پیانان سەرەتای ئاراستەیەکە لەپرکێشی کردن بۆ ئاشکراکردنی

شکستەکان ، چی شکستی فەردی ( تاک ) بێت یان شکستی کۆمەڵایەتی . لەودیوی سەرەوەدا دەلالەتێکی تەواوی مێژووی پەیوەست بەکەسێتی نەتەوەیی کورد دەردەکەوێت ( من ) وەکو خودی بکەر تا راستەوخۆ خۆی لەنێو قەوارەیەکی گەورەتردا پێشکەش دەکات ، بەواتا دەبێتە توخمێک لەنێو ئامادەبوویەکی بەرفراوانتردا کە (ئێمە) یە ئەویش لە ( دواسواری پێشەنگ کوژە )دا دەردەکەوێت کە بکەر پێکهاتەیەکی دەستەجەمی هەیە ( کۆمەڵە سوارێک ) . ئەگەر مەبەست ( لەسوارانی پێشەنگ کوژە ) کاروانی کوردان بێت کەچۆن لێتێک چوونی کاتواتە نەناسینی کات دەبێتەهۆی لەبا وچونیان ئەوا دەلالەتی ئەوە بەرهەم دێنێت کە زەمەنی هەستان وگوڕی بەرەو بزافی نەتەوەیی ئێمە لەکاتی خۆیدا بەئاکام نەگەیشتووە ، بەواتا نەتوانراوە کاتی لەبار بۆئەو مەبەستە دیاری بکرێت . بۆیە تاکوئێستا کاروان بەجێگا نەگەیشتووە . بەڵام لەهەمان کاتدا هەمان دێر دەلالەتێکی تریش بەرهەم دێنێت ئەویش ئەوەیە کە (من) لەو دواسوارانەیە کەروحی رابوونەوەی هەرەس پێهێناوە ، کەئەوەیان بۆچوونیکی لاوازە (من) کەخۆی پێشکەش دەکات بەهێزو پراکتیکەوە دێتەپێشو ئەوەمان پێدەڵێت کەخودێکی سادەو ساکارنییە ، بەڵکو خاوەنی ماهیەتێکی دیارەو لە توانایدا هەیە پراکتیکی گەورە بکات . بەڵام لەگەل هەموو ئەوەشدا ( خود)ی بکەر چەند بەهێزە پێویستی بەدەرەوەی خۆیەتی . سەرجەم توخمەکانی دەرەوە بەمەبەستی فۆرمەلەکردنی خۆی دەخوازێت ، ( تیرامان ودامان)ی دەوێت بۆ دۆزینەوەو لێکدانەوەی ( ونبوون) تاساتەوەختی بگاتە دنیای نائاگایی و لەوێرا پشووبگرێ و خۆی لەدنیای بەئاگایی و هزر بشارێتەوە .

دواتر (من) ی بکەر داوای زیندەگی دەکات ، زیندەگی بەمانای ژیان ، ژیانێک کەتیایدا دوو ئاراستەی جیاواز جولە دروست دەبێت ، یان بەرەو خود دروستکردنی تەواوەتی ، یان ئەنجامدانی پرۆسەی نێگەتیف یان وەستاندنی جولە کە دەبێتە جۆرە پرۆسەیەکی ( خود کوشتن ) . هەر بەدوای ئەوەدا ( من ) داوای مەرگ دەکات بەڵام داواکارییەکی موتلەق نییە ، بەڵکو کۆمەڵە دووانەی ( ثنائیە ) بەدوای یەکدا هاتوو لەسوتراکتوری دەقەکەدا بەرجەستە دەبن کەسەرجەم باری تێرامان وگومان دەیانخولقێنن و بارێکی هاو سەنگ لەنێوان ناوەوەی ( من ) و دەرەوەیدا پێک دەهێنن کەوەکو دووحالەتی بەرامبەر بەیەک دەوەستن ئەویش ( نێگەتیف /پۆزەتیف ) ن ، لەو بارەشدا جولە لەشیعرەکەدا دەوەستی و تەنها لەسنووری خواستنێکی دوور لەپراکتیک دا دەمێنێتەوە . بەڵام ( من ) دەخوازێت سەرجەم ئاراستەی پۆزەتیف و نێگەتیف جولە دروستکەرن بۆ ( هەورازی جاوێدانی ) . ئەگەر سەرنجی ئەو دووانانەمان دا کە لەدەقەکەدا بەرجەستە بوون ئەوا بەم شێوەیە:

( ئاسمان/ زەوی ، لوتکە/ نەوی ، زیندەگی خودکوژی ، مەرگ / زیندەگی ، هەموو ئەم دووانانەی سەرەوە ئەو هێلەگشتییە پێک دەهێنن کە سوتراکتوری شیعرەکەی لەسەر بنیادنراوەو ( من ) ی بکەر جووت ، جووت دەیان خوازی، هەتا دواجار لە ( سینەیدا پشکورژێن بکەن بۆ هەورازی جاوێدانی ). لێرەوە ئەوە ئاشکرا دەبێت کە (من) ی بکەر ساتەوەختی زیندوبوونەوەی دەوێت و بەمەملەکەتی ( هزر)دا رۆدەچێت تاکو بنەماکانی ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە ئامادەبکات واتە پرۆسەی زیندوبوونەوە . بەڵام بێ جیاوازی بەرامبەر هەر جەمسەرێکی گەشلەدووانە (ثنائیە ) کاندا جەمسەرێکی شکست یان تاریک هەیە کە ئەمەش حالەتێکی دروستی خوێندنەوەی مێژووی ( من)ی بکەرە لەپانتایی دەرەوەی دەقەکەدا

واتە لەپانتایی سیوسیولوژیدا ، کەنەیتوانیووە شکستەکان بسڕێتەوەو تەنها حاڵەتەپۆزەتیفەکان دروست بکات ، ئەمەلەلایەک لەلایەکی تریشەوە مادەم (من) لەباری تێراماندا ئەو توخمانە فڕێ دەدات و نائاگایی رۆڵی دیار دەبینێت لەبەرجەستەکردنی دەقەکەدا ناشێ حاڵەتەکانی شکست ( جەمسەرە دزیوەکان ) بسڕێتەوە. چونکە تەنها یەقینی ئامادەیی ئایدیۆلۆژی(بەئاگایی) دەتوانێ پشت لەو راستییە ئامادەیە بکات .

بەکارهێنانی توخمی فرمان بەرێژەیەکی زۆرکەم کە ١٥/١ی توخمە پێکهێنەرەکانی سوتراکتۆری شیعرەکەیە . ئەویش لەراستیدا سێ فرمانەو هەر یەکە دووجاز بەکارهاتووە . لەباری یەکەمدا کەمی رێژەی فرمان حاڵەتی تێرامان لە شیعرەکەدا چڕتردەکاتەوە ، کە بارێکی وەستاوو تاسنووری بێ جولە پێک دێنێت ، حالەتێکی لەو جۆرەش بەگوێرەی (من) ی بکەری شیعرەکە خورد بوونەوەو گەڕانەوە بۆ دیووی ناوەوەی خود دروست دەکات کە بەتێرامان کۆتایی دێت ، دیسان دووبارەبوونەوەی هەریەکە لەو فرمانانەی کە لەدەقەکەدا بەکارهاتوون زیاتر جەخت لەسەر باری تێرامانەکە دەکەن . بەپێچەوانەی دروست کردنی حالەتی هەڵچوونەوە ، بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات داخو مانەوەی ( من)ی بکەری دەقەکە لەحاڵەتی تێراماندا دەبێتەهۆی دروستبوونی پرسیاری نوێ ، یان ( من ) تەنها لەباری تێراماندا دەمێنێتەوەو توانای بەرجەستەکردنی هیچ پرسیارێکی نییە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە جارێکیدی دەگەڕێتەوە بۆ پانتایی دەقەکە دەبینین (دە) دێڕی یەکەم سەرجەم ئەو فاکتەرانە پێشکەش دەکات کەبوونەتە هۆی جولە دروستکردن لە ( هزر )ی (من)ی بکەری دەقەکەدا .تا ئەو ساتەی ( مەودای نەهەنگی هزریان دارمالی ئازارکردووە ) .

بەواتا ئامادەبوونی ئەو فاکتەرانە کەسەرچ توخمەکانی سروشتن ( هزر )ی بکەریان گەیاندوە ئاستی کەپرسیار لەخۆی بکات ، یان بەواتایەک دی لەجەستەی خۆی بپرسێت . گەیشتنی (هزر) حاڵەتی ئازارچەشتن بەرەو پرۆسەی ئاشکراکر ( دان پیانان ) ئاراستەی دەکات . لەئەنجام ئەو دان پیانانەی کە بەکاریگەری خودناسین ( هزر ) دروست دەبێت . (من)ی بکەر پێناس خۆی دەکات . بەڵام لەبەرئەوەی تێرام گەیاندویەتیە ئەو ئاستی خود پێناس کردن ( خودنمایش کردنە )و لەو بوارەشدا نەست و ن ئاگایی کاردەکەن ناسنامەی راستەقینەی خ پێشکەش دەکات .( ئەوە من دواسواری پێشەن کوژە ). هەربەدوای ئەوەشدا باسی پراکتیکەکا خۆی دەکات کەتا ئاستێکی زۆریش پراکتیکی سوپ مانیانەن ( ئەمشێری ناخی ئەم ناوەی پڕپرۆسک کردووە ) دیوی زلی چاخ نخونی لەت لەت ئەکا

لێرەوە ئەوە بەرجەستە دەبێت کە (من)ی بکەر شیعرەکە بەکاریگەری مۆتیفێک دەجولێت کەرۆح خودنمایش کردنێکی مەعنەوییە لەوەی پراکتیک بێت . ئەمەش زیاتر رۆحی خەیاڵ وتێرامان و ک کردنی نائاگاییو نەست رەت دەکاتەوەو کاریگەر ئایدیۆلۆژی و بەئاگاییو هۆش بەدیار دەخاتە ک دەیانەوێت ئەلتەرناتیڤێک بۆ هەموو ئاست ساتێکی تێکشکان پێشکەش بکەن بائەو ئەلتەر نایتیفە یان پراکتیکەکانیشی تەنها لەسنوور وەهمدابن . بەواتایەکی دی ( من)ی بکەر لێرەد دەماندا تە دەستی یەقینێک کە بەدرێژایی مێژوو دروستبوونی هەستی نەتەوەیی کوردی ئامادەبووە خۆی نواندوە ، بەڵام هەرگیز نەکەیشتۆتە ئاست پراکتیک کردن ، هەر لەسەردەمی ( نالی) یەو تاکو ساتەوەختی ئێستا پاڵەوانی شیعر چیرۆکەکانی ئێمە ، تەنانەت پاڵەوانی حیکایەت

فۆلکلۆریشمان هەر ( دیوی زلی چاخ نخونی لـەت لەت ئەکەن) ، بەلام ئاخۆ تا چەندێ تواتیویانە ئەو قسەیە بکەنە کردار؟ پێموایە بەکردارکردنی ئەو قسەیە مانای گۆرینی مێژووی ئێمەیە وەکو نەتەوە لەحالەتی شکست وهەرەس و نائامادەبونەوە بۆحالەتی دروستکردنەوەو فۆرمەلەبوون و ئامادە بوون ، بۆیە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ( من) ی بکەری شیعرەکە ئەگەرچی لەبـاری تێرا ماندایەو ئەوەش وای لێدەکات لەچەقیقەتـی خۆی پێشکەش بکات ، بەلام هەرزوو سنوورێک بـۆ خوی دادەنێت و هەمان شێوەی بەرجەم (من )ەکانی تری ئەزموونەکانی پێش خۆی بەئاشنامەیەکـی سۆپەرمانیانەوە دێتەپێش وە خۆی پێشکەش دەکات کە ئەو پالەوانەیە تێکرا مێژووی ئێمەتـــەوە دەگۆرێت ، ئەم جیهانبینینیەش مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە لەئەدەبی کوردیدا و بۆتە وەلامێکـی ئامادەی پرسیارێکی سراوە ، پرسیارێک کەدەمێکە سیفاتی پرسیاری لەدەستداوە . ئەگەر گەران لـە دوای ئەو سۆپەرمانانەی کە لەناتەوەختێکـــــی کوردتدا مێژووی نەتەوە دەگۆرن تاسنوورێکـــی ئاشکرا مۆرک و خەسلەتی ئەزموونی ( روانگـــەو) تەریقەتی شێرکۆیی بووسێت ، ئەوا مانــــەوەی بکەری شیعرەکەی ( کەریم ) بەهەمان جیهانبینینی یەوە ئەوە دەگەیەنێت کەپرسیاری کـــەریم لـەم شیعرەدا هەمان پرسیاری ( روانگە )یە ، یـــان هەمان پرسیاری شێرکۆیە ، کەپیارێنی هەمـــوو ئایندەیە بەیەقینی ئامادە ، کەلێرەدا (مـــن)ی بکەری شیعرەکە لەپێناوی یەمیینانیدا ( دیـــوی زلی چاخ نخونی لەت لەت ئەکات ) .

بەلام ( هەشت ) دێری کۆتایی شیعری کە دەبێتـە تەواوکەری باری تێرامانەکەی ( من)ی بکـــەرو بەیوەستی خودنمایشکردن بەلێ دان پیانانەکـــەی (من) دەبێتەوە . کە (من) بەلاواکاری دەست پـــی دەکات ، داواکاری بۆخود بەداواکردن ، یــــان بنیادنانی زەمەنێک بۆ پراکتیک و خودسەلماندن ( داواکاری ) دەلالەتی کەم وکوری بەرهەم دینێتە بەوا تایەکی دی روویەکی نائامادەیی و شکستـــی (من)ی بکەر نیشان دەدات کەئەمەش بەتـــەواوی پێچەوانەی بەشی پێشتری شیعرەکەیە کـــە بکـــەر سۆپەرمانێکە ( دیوی زلی چاخ نخونی لەت لـــەت ئەکا ) . ئاراستەی دووەم ئەو تروسکەیە کـــەلای کەریم دەشتی وەکو بارێکی ناتەبـــا لەگـــەل شێوازو جیهانبینینی باوی شیعری کوردیدا سـەدەر کەوتووە ، بەلام بەشی یەکەمی شیعرەکەی ئـــەو حالەتە ئامادەیە لەزۆربەی دەقەکانی کەریـــمدا کەتەماهی لەگەل ئەزموونی روانگەو گوتـــاری مانەوەدا پێدەکاتەوەو ئەمەش ئاســـۆی بەرەو گەران لەدوای ئەزموونی نوێ و خەیالی نـــوێ و مەعریفەتی نوێ بەواتایەکی دی جیهانبینینـــی نوێ تەسک کردۆتەوە .

هەر لێرەوەیە کە کەریم لەحالەتێکی شلۆقـــدا ماوەتەوە لەنێوان تەماهی کردنەوە لەگـــەل وێنەی باوک ( ئەزموونی روانگە )و دابران لـــەو ئەزموونەو بنیادنانی ئەزموونێ نوێو تایبـــەت بەخۆی . کەوەک پێشتر گوتم کەریم لەوشاعیرانەی دوای شێرکۆیە کەتاکو ئێستاش چاوەروانی ئـــەوەی لێ دەکرێت کەببێتە دەنگێکی دیار ، بـــەلام بـــە مەرجێک حالەتی تێرامان ببێتە حالەتێکی پرسیار بەرهەم هێن ، پرسیاری زیندو لەجەستەی خۆمان و لەدەرەوەی خۆشمان دروست بکات ، جیهانبینینـــی ( قەیران ) دووچاربووی روانگەیی و شێرکۆیـــی رەت بکاتەوە.. لێرەوە پێموایە کەریـــم ئـــەو شاعیرەیە چاوەروانی ئایندەیەکی گەشـــی لـــێ دەکرێت و ئاستی رۆشنبیری ( کەریم )یش مۆتیفـــی یەکەمی گەیشتن بەو ئەنجامەیە .

سلێمانـــــی

سەرەتای ۱۹۹۳

# «لەپێناو کاتێکی بە پێزدا»

پێشینان و توویانە: «سروشت قینی لە بۆشایی دەبێتەوە» ئەو شوێنەی ئێمە بە بەتاڵی دەزانین، لە ڕاستیدا بەتاڵ نییە، بەڵکو پڕە لە هەوا، بۆیە دەتوانین بڵێین بۆشایی لەسروشت دا نییە، ئەگەر ئەمە بۆ مرۆڤەکان وترابێت، ئایا چ بەهۆشمان دەڵێین؟ لەڕاستیدا هۆش لە چالاکی ناکەوێت، ئێمە هەموو کاتێ بیر لە شتێك دەکەینەوە، هەتا ئەگەر لە حاڵەتی خەوتنیش دابین ئەوا هۆشی بێ ئاگامان دەست بەگەشت و گوزە دەکات و وەکو پەرتوکێك هەموو لاپەڕەکانی ژیان هەڵدەداتەوەو بەرەو ڕووداوی ڕابردوو و ئاینـدە ڕێتـەی دەکـات و لە شێـوەی خەون دەریـ[...] دەبرێت. هۆشی ئادەمیزاد لە توانای دا هەیە سەد تریلیۆ[...] زانیـاری کۆبکـاتـەوە، کەچی گەورەتـرین کۆمپیـوتـ[...] ناتوانێت زیاتر لە بلیونێك زانیاری کۆبکاتەوە، هەر بۆیە بۆ ماوەی چاو تروکـانێکیش چییـە ڕاناوەستێت، ئینجا ئەگەر بەشتی سوود بەخش خەریك نەبێت، ئەوا بەشتی بێسوودو پرو پووچ خەریك دەبێت و دەبێتە ئەشکەوتی شەیتان و زیان بەخەڵك دەگەیەنێ!

- یەعقوب القصاب -

«تـۆرانیۆ» دەڵێ: «کات وەکو تیخە بەبێ دەنگی شت دەبڕێ» بۆیە پێویستە بە پێی بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی ڕێکی بخەین، ئێمە موڵکی کاتـەکانی ئێشـین و پێویستەبە بەرهەم و بە پێزبین، هەروەهـا کاتـە بێ ئیشـەکانیش موڵکی ئێمەنەو دەتوانین بە ئارەزووی خۆمـان ڕایان بوێرین و بیانکەینە تەرازووی هێزو توانامان لەسەر بزووتنەوەدا، کەبەبەهای کاتمان زانی، ژیانمان بەسـوودو بەبـەها دەبێت، چونکە کات سامانە، ئەو کەسەی بەسەر کاتەکانی زاڵ بێت و ببێتە خاوەن کاتی خۆی سامانێکی زۆری دەبێت و سەربەست و سەرفرازە نەك بەندەو کۆیلەیەتی، کاتـەکانی بێ ئیشی بۆ ئادەمیـزاد پێـویستن تاکـو وزەکانی ببـووژێنـەوەو نوێ ببنـەوەو بەهەرەکانی سەرهەڵ بدەن. کات سەرمایەو تەنیا موڵکی خۆتە، دەتوانیت بەکاری بهێنێت، ئەگەر سوودت لێ وەرگرنـەت، یەکێکی دی سوودی لێ وەردەگرێت، «واڵتەر سکۆت» دەڵێ: «ئاگات لەکات بێت و بە فیرۆی نەدەیت، پێش هەمـوو شتێـك بە ڕەوانی ئەرکـەکانت ڕاپەڕێنە، پاشان هەندێك پیشوبدە.» دەروونناسان دەڵێن: «بەسەر بردنی کاتە بێ ئیشـەکـان بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان و هۆشمەندانە، مایـەی گەشـەسەندنی کەسایەتیو هێور بوونەوەی دەروون سەرکـەوتنـە،» چونکـە کاتێ مەردووم بە خولیـایەك (هیوایە) خەریك بوو هەموو دەردو غەم و پەژارە لە خۆی دوور دەخات و ئێمن دەبێت و پلان دادەنێت و بەهـرەکانی دیار دەخات کە دەشێت لەکـاتـە کانی ئیش، سەبـارەت بەچـەنـد هۆیەکی[...] نەتوانێت ئەمە بکات، ئەو ساکە باوەڕی بەخۆی پتەو دەبێت [...] ڕوو لەژیـان دەکات و بەسەر کۆسپ و گیروگرفتەکانیدا زا[...] دەبێت و سەر دەکـەوێت و هەست بە ڕەزامـەنـدی دەکـا[...] هەربـۆیە «ستیفنسن» دەڵێ: «گرنگترین فەرمان کەلەسەرمـ[...] پێـویستـە جێبەجێ بکەین، ئەویش خۆش بەخت کردنمانە[...] کلۆڵترین مەردوم ئەو کەسەیە بەیانی دەچێتە دەرەوەو نازانێت بچێتە کوێ؟ نابودترین کەسیش ئەوکەسەیەکە کاتەکانی خۆی لەنێـو چایخانەو کۆڕی قسەو گۆتەو زەم و تیرو توانج گرتن و[...] پڕوپـاگـەنـدە بڵاوکـردنەوە یاخود لەسەر خوانی قومارومەی خواردنەوە یان بەگەڕان و سووڕانەوە لەسەر شەقام و کۆڵانان[...] بەسەر بەرێت. چونکە هەموو ئاژاوەیەك لەبەتاڵیو تەمبەڵی بێ[...] بەرپـرسیـاریـەتی ڕوو دەدات، مەردومی تەمبەڵ مشەخۆرەو دەخوات و بەرهەمی نییەو خۆرەی زیان بەخشی کۆمەڵەو خراپە[...] دەخولقێنێت و مێشکی بۆگەنەو دوا دەکەوێت. هەر بۆیە «ژان ژاك ڕۆسـۆ» دەڵێ: «ئـەو مەردو مەی پارەکـەی لەکـاتـە بێ ئیشـەکـانی داخـەرج بکـات، مەردومێکی دزەو دەبێت بنەبر بکـرێت.» «مـۆنسکیۆ» یش دەڵێ: «وازهێنان لە ئارەزووی بێ کەڵك مایـەی ئاسوودەیی مەردومە.» کەچی «د. ریتشارد» بە لێکۆڵینەوە دیاری خستوە کە مەی خواردنەوە ئەگەر بەکەمیش بێت بە بیرهاتنەوەی مەردوم کوێر دەکات، چونکە مەی ناهێڵێت

پرۆتینی پێویست بۆ گەشەسەندنی خانەکانی مێشك بچێت، ئەمەش دەبێتە مایەی کەم بوونیان و وون کردنی توانایان لەسەر بە بیرهاتنەوە ئینجا زەینی کوێر دەبێت.

پێویستە مەردوم خولیایەکی هەبێت و لەکاتە بێ ئیشەکانیدا خۆی پێوە خەریك بکات، «کاوکنەر» کتێبێکی داناوەزیاتر لە دوو سەت خولیای تێدایە، بۆیە پێویستە مەردوم لەخۆی بپرسێت: کام خولیا لەگەڵ هۆش و لەش و چەژی دەگونجێت و پەروەردەی دەکات و لەگەڵ ئاستی ئابووری دەسازێت و لەگەڵ پێداویستەکانی کۆمەڵ دەلوێت؟ کەمەردوم خۆی بە خولیایەك خەریك کرد، بەئارەزووی خۆیو بەسەر بەستی بیرو رای خۆی دەردەبرێت و بەهرەی دیار دەخات و هەست بەحەسانەوەو هێمنی دەکات، چونکە هەموو بیروهۆش دەچەسپێنێتە سەر خولیایەکەو بیر لە گیروگرفتەکانی ناکاتەوەو لە غەم و پەژارەی دوور دەخاتەوە. هەر بۆیە «برنادشۆ» دەڵێ: «نهێنیی کلوڵێمان لەوە دایە لەکاتی پشوودانمان بیربکەینەوە، ئایا ئێمە بەختەوەرین یان بەء؟ کەمەردوم لەسەر خولیایەك بەردەوام بوو، هەڵبەت لەم خولیایەدا بە هرەکانی سەر هەڵدە دەنەوە، دووریش نیە خولیایەکە ببێتە پیشەی، یان ببێتە مایەی داهێنانێك. «ریێشاردکرایت» بۆ خۆی سەرتاشی بوو لەگەڵ ئەوەش دا توانی ئامێری رستن دابهێنێت و کارگەی لۆکە دامەزرێنێت. «یهوبرث» بۆ خۆی ئاسنگەر بوو، لەگەڵ ئەوەش دا فێری (٣٨) زمان بوو. «ئەدیسۆن» هەر لەمنداڵییەوە یاری بەکانزادەکانی دەکرد، تاوەکو بووە خولیایەك، پاشان بووە مایەی داهێنانی گڵۆپی کارەبا.

«برنادشۆ» هیچ فێرنامەی زانستی وەرنەگرتبوو، لەگەڵ ئەوەش دا نووسەرێکی ناوداربوو و خزمەتی مرۆڤایەتی کردووە. هەربۆیە «ئادمۆنت بێرك» دەڵێ: «من لەئێوە ئازاتر نیم، بەڵکو دەترسم کاتم بەفیرۆ بروات، کات کوتاڵێکی بەکەڵکە پێویستە بەشتی سوود بەخش پربکرێتەوە.»

ئەگەر گوێ تەنیا لەبیستنی ئاوازێك وەڕس بێ، ئەوامێشکیش لە خوێندنەوەی تەنیا بابەتێك بێزارو وەڕس دەبێ، ئەگەر نوژدار تەنیا بابەتی نوژداری بخوێنێتەوەو خۆی لەبابەتی ڕێئۆنیو کۆمەڵایەتیو پەروەردەیی دوور بخاتەوە، هەڵبەت بێزار دەبێت، چونکە مێشك بەبابەتی هەمەڕەنگ و لەهەر باخچەیەك گوڵێك گەش دەبێت و دەبووژێتەوە.

«ئەنیشتاین» زانای بیرکاری بوو، لەگەڵ ئەوەش دا کەمانچەژەن بوو، «سۆمەرست مۆم»ی چیرۆك نووس و نووسەرێکی سەرکەتوو بوو، وەستایەکی لێ هاتووو هونەرمەندیش بوو. «ژان ژاك رسۆ» لەساڵی [١٧٦٢ - ز]دا بانگەوازێکی ڕوو بە ڕووی هەموو ئادەمیزاد کردەوەکە دەبێت پیشەیەکی دیاری کراوی هەبێت و خۆی پێوە خەریك بکات، بیانگەی (ڕۆسۆ) ئەوەیە، دەشێت ئادەمیزاد لە فەرمانێکیدا سەرنەکەوێت و بەختەکەی نەیهێنێ!

چوار یارەکانی پێغەمبەر (د.خ) بێجگە لە فەرمانەکانیان کەخەلیفەبوون، بازرگانیشیان دەکرد. «لوێس»ی شازدەهەم پاشای فەرەنسابوو و دەرگاشی دروست دەکرد. «پەتروس» قەیسەری ڕووسی، دارتاش بوو، «لیوناردۆ دافینشی» تەنیا هەر پەرتوکی نەدەخوێندەوە بەڵکو کاریشی دەکرد، واتە بیرو دەستی دەخستەکار.

«لابیکۆن» سوور بوو لەسەرئەوەی نابێت تەنیا هۆش بجولێت، بەڵکو دەبێ دەستیش کاربکات، «ژان ژاك ڕۆسۆ» دەیگوت: «لەسەر ئەمیل پێویستە وەکو فەیلەسوف بیر بکاتەوەو وەکو جوتیاریش کاربکات.» کەچی «فینۆبا» دەیگوت: «لەسەر هەموو مرۆڤێك پێویستە کشت و کاڵ بزانێت، تاوەکو شارەزای ژیانی جوتیار بێت و بزانێت چۆن بە ئارەقەی نێو چەوانی بەرهەم بهێنێتە کایەوە» ناوبراو دووبارە دەڵێ: «کارکردن لەش بە هێزو هۆش هێمن و فێری بەرگە گرتن و چەژ جوانی دەکاتەوەو لەسەر وردیو سەرنجدانی ڕادەهێنێت.»

باشترین خولیا بۆ مەردوم ئەوەیە خۆی ڕۆشنبیر بکات، «کارلیل» دەڵێ: «زانستگای ڕاستەقینە بۆ مەردوم کتێبەو بۆ هەموو کەسێکی خوێندەوار دەلوێت و دەتوانێت فێرنامەی لێ وەرگرێت.» مرۆڤ کە کتێبێکی مێژوو دەخوێنێتەوە، بابەتەکانی بۆ ڕۆژان و ڕووداوەکانی دێرینی ڕادەکێشن و هەروا دەزانێ لەگەڵیان دا دەژیو هەست دەکات تەمەنی درێژ بۆتەوەو ژیانی فراوان بووەو هۆشی گەورەتر بوە. سەرەڕای ئەمەش پەند لە ڕووداوەکان وەردەگرێ و ڕێبازی ڕاستییان لێوە فێر دەبێ. کەکتێبێکی جوگرافیاش دەخوێنێتەوە، هەروا دەزانێ گەشت وگوزەر بۆ ئەو وڵات و سروشتە دەکاو شارەزای دەبێو سوودی لێوەر دەگرێ، هەربەم جۆرەکە کتێبێکی ویژەیی دەخوێنێتەوە، ویژدان و دەروونی پەروەردە دەکاو ڕەوشتە باڵاکان وەردەگرێو هەست بە

بنەچەی مرۆڤایەتی دەکاو لە پێناوی دا خەبات دەکاو تێدەکۆشێ، کەچی بابەتی زانستی

رادەی زیرەکی مرۆڤ زیاتر دەکەن، چونکە بە لێکۆڵینەوەی زانستی زیاتر خوێن بۆ خانەکانی مێشک دەچێو زیاتر دەجوڵێو فراوان دەبنەوەو مرۆڤ دەتوانێت چارەی گیروگرفتی گران بکات و بەشێوەیەکی زانستیانە شیتەڵیان بکاتەوەو فێری ئەوەیان دەکات چۆن لە تەلسمەکان بکۆڵێتەوەو شارەزای بێت. خوێندنەوەی پەرتووکی پەروەردە و کۆمەڵایەتی و ئایینی رەوشتی مرۆڤ پوخت ترو کاملتر دەکەن و مۆرکێکی مرۆڤایەتی لەناو ویژدانی دا تۆمار دەکات و بە چاوێکی فراوان و بەدڵێکی کەشاوەی مرۆڤانە سەیری جیهان دەکات و بە ماڵیو حاڵی خۆی دەزانێت و بەبێ گوێدانە سنوور هەموو مرۆڤێك لەسەر رووی ئەم زەمینە بەبرای خۆی دەزانێت

ماف رەوای بۆ گشت مرۆڤێك دەخوازێ، «مارك توێن» دەڵێ: «ئەوەی پەرتوکی چاك نەخوێنێتەوە، هەروەکو نەخوێندەوارە.» پەرتوکی چاك باشترین هاوڕێمانە بۆ فێرکردن و دوور خستنەوەمان لە بێزاریو پەستیو داماوی. کتێب مامۆستایەکی دڵ نەرم و بەسوودەو قوتابخانەیەکی هێمن و بەردەوام و هەموو کاتێك ئامادەیە. پەرتوکی چاك لەکەل و پەلی نلو ماڵ بەنرخ ترە، چونکە کەل و پەل لەناو دەچێت، کەچی ئەو هەر دەمێنێت، پەرتوکی چاك خواردنی چاکی مێشکە، چونکە مێشکیش هەوەکو گەدە، خواردەمەنی باشی پێوستە، «د. صبری القبانی» نوژدار دەڵێ: «خواردەمەنی مێشك تەمەن درێژ دەکات و هۆش رەوشەن دەکاتەوە».

«هیتە» نموونەی نایابیو بەهرەمەندی بووە، هەمیشە دەیگوت: «هەموو رۆژێك لە ژیانم دا بیر لە شتێکی نوێو تازە دەکەمەوە، بۆ ئەوەی سستیو بێزاری لە خۆمەوە دووربخەم.» کەچی (محمد)ی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: «خوا ئەو رۆژەم لێ پیرۆزنەکات کە تیایدا فێری زانستێك نەبووبم»، هەروەها دەفەرموێ: «لەرۆژی قیامەت دا مەرەکەبی زاناکان دەخرێتە ناو تەرازووی خوێنی شەهیدان.» بۆیە پێویستە لە خوێندنەوەی شتی چاك نەپچڕێین و هەمیشە بەردەوام بین لەسەر خوێندنەوەی گۆڤارو رۆژنامەو گوێ بدەینە دەنگ و باس و هەواڵەکانی جیهان بۆ ئەوەی لە رووداوەکانی جیهاندا نەبڕێین و بزانین رەوتی کاروانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی دەکاتە کوێ «گاندی» دەیگوت: «ئەوەی هەموو رۆژێك رۆژنامەیەك نەخوێنێتەوە بە نەفامی دائەنێم.»

«ئارت بیکنصفیلد»ی زانای ئەمەریکی دەڵێ: «خانەکانی مێشك زیاتر لە هەموو خانەکانی لەشی ئادەمیزاد بەرگەی پیری و لاوازی دەگرن و بەخێرایی پیرنابن.» «د. میلان میشیتش»کە خانەنشین کرابوو لەتەمەنی (٧٧) ساڵیدا گەواهینامەی (دکتۆرا)ی وەرگرتەوە. ئێمە بۆچی کاتەکانی خۆمان بەچالاکیو جموجۆڵی هۆشیو سوودبەخش و بەرهەمهێن بەسەر نەبەین و خزمەتێکی پێویست بە خۆمان و کۆمەڵگەمان ئەنجام نەدەین؟! مرۆڤ بەدانیشتن و تەوەزەلیو رارایی تەندروستی خۆی دوچاری فەوتان و زوو پیربوون دەکات.

«کارلیل»ی نوژدار دەڵێ: «چالاکی پیری دوا دەخات.» فەیلەسوفێکی هیندی تەمەن درێژ دەڵێ: «پەرتوك هاوڕێو هاوشانم بووەو هەمیشە بەدوای زانستیدا دەگەڕان.»

«د. ئارنۆلدشیبل» لە زانکۆی کۆلۆمبیا بەلێکۆڵینەوە دیاری خستوەکە خانەکانی مێشك بەهۆی تەمەن درێژییەوە نافەوتێن، کەواتە با خۆمان بەزانستی هەمەرەنگ پەروەردەو رۆشنبیر بکەین تاکو ئەندیشەمان بەرزتر بکەینەوەو لە گیروگرفتەکانی ژیان دووربکەینەوە. (لویزدلی)ی مامۆستای کۆلیجی (ستیفنز) دەڵێ: «هەرچەندە مرۆڤ بەتەمەن گەورەتربێت، ئەوا زیاتر پێویستی بۆ نوێ بوونەوە دەبێت.

سەرچاوەکان

١ـ د. صبری القبانی ـ طبيبك معك. طبعة/ ١٤ دار العلم للملاين بيروت/ ١٩٧٩.
٢ـ وليم فنجر ـ ترجمة د. محمد احمد الغنام ـ كيف تستمتع بوقت فراغك؟ القاهرة/ ١٩٦٠.
٣ـ سلامة موسى ـ محاولات سيكولوجية/ مكتبة الخانجي/ مصر ـ ١٩٥٣.
٤ـ سمير الشيخاني ـ سبيلك الى السعاده والنجاح/ الطبعة/ ٣ دار الافاق الجديدة ـ بيروت /١٩٨١.
٥ـ السيكولوجية المبسطة /مطبعة النجاح / الطبعة ٣ دار الافاق الجديدة بيروت /١٩٧٨.
٦ـ سلامة موسى ـ الشخصية الناجحة ـ طبعة ٣/مكتبة الخانجي/ القاهرة/ ١٩٥٣.
٧ـ مجلة اسرتي العدد ٣٨ في ١٧/ ١٦/ ١٩٧٩.
٨ـ مجلة طبيبك العدد ٢٧٩ في نيسان /١٩٨١.

# گرویی بوون

دکتۆر رزگار مصطفی محمود

گرویی بریتییە لە پەڵەیەکی پێستیی بەردەوامی بە ئاڵوش بەهۆی مۆرانەی Sarcoptes Scabei ی لەچەشنی مرۆیی hominis روو دەدات. مۆرانەی هەرلش ٣ ـ ٤ / ملم درێژن، بەهاوینە نەبێ دیتنی زەحمەتە.
بیستا دڵنیان لەوەی کە مۆرانە لە مرووە راستەوخۆ بۆ مرۆ لە رێگەی لیکەوتنی جەستەوە دەگوازرێتەوە، نەك لەرێگەی بەکار هێنانی کەل و پەلەوە.

هەرکە مۆرانەی مێیینەی پیتێزاو کەوتە سەر پێست دەست دەکا بەهەڵکۆڵینی بوو درێك بەناو چینی کورینای پێست دا، بەرێژەی رۆژی ٢ملم. هەر رۆژێکیش ٢ یان ٣ گەرای هێلکەیی دادەنێ کەلەماوەی ٢ تا ٣ هەفتەدا توخمانە پێ دەگەن. ژمارەی مۆرانەکان لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆرێ. بۆ نموونە لە رەسکاویکی پاك و خاوێن دا کەمتر لە (١٠)و لە منداڵیکی بەشوری پیس و پۆخڵ دا زۆر لەوە زیاترن.
هۆی ئەو پەڵە داگرەی گروییی و ئەو خارشتە سەختە لەوانەیە بگەرێتەوە بۆ هەستەوەی بەرامبەر بە مۆرانە یان بەرهەمەکانی.
سیماکانی ئەم نەخۆشییە
لەوانەیە بە درێژایی ماوەی ٤ـ٦ هەفتەی یەکەم نەخۆش هیچ ئاڵوشیکی نەبێ بەلان دوایی ئاڵوش بەسەر وینەکەدا زاڵ دەبێ.

بەزۆری ئەم ئاڵوشە لە زیتر لە کەسێك دا دەردەکەون و بە شەوانیش دژوارتر دەبێ.
زۆربەی پەڵەکان لەسەر قەد trunk دا دەردەکەون بەلام ئەمانە تایبەتین و دەبێ بۆ دڵنیایی لە دیاری کردنی نەخۆشییەکە بوو درێك بدۆزینەوە. بوودرەکان بەزۆری لە لاکانی پەنجەکانی دەست و لاکانی دەست و دیوی ناوەوەی مەچەك هەڵ دەکۆڵرێن. شوێنی دیکەی باو بریتین لەئانیشك و پاژنەو پێیەکان (تایبەت لە ساوایان دا) وگۆمەك nipple وئەندامی زایەندی genitals تەنها لە ساوایان دا گرویی روخسار دادەگرێ. بوودرەکان هێلی لوولخواردووی بۆزن بەدرێژی (١)سم. دەتوانرێ بەبەکارهێنانی هاوێنە لەکۆتایی بوودردا مۆرانە ببیرێ. هەروەها دەتوانرێ جیا بکرێتەوەو بنێردرێ بۆ پشکنینی وردبینی. بوودری سەر ئەندامانی لە سەر پێستیکی سوور هەلاتووerythematons ی گری گری nodular هەڵ دەکۆلرێن.
رەوتی گرویتی
گرویتی ئەگەر چارەسەر نەکری هەر دەمێنێ. لەباری کەوبارێ ژمارەی مۆرانەکان لەوانەیە کەم بێو دیاری کردنی نەخۆشییەکە بە زەحمەت بکەوێ. سەرهەڵ دانەوەی دوای چارەسەرکردنی تەواو رووداوێکی باوەو هۆیەکەشی لەوانەیە بگەرێتەوە بۆ دووبارە تەنگاوتن لە رێگەی نەخۆشانی دیکە کە لێیەوە نزیکن و چارەیان بۆ دانەنراوە یا هەر دەست نیشان نەکراون.
ئاڵۆزکارییەکانی ئەم نەخۆشییە
● تەنگاوتنی دووەمی کیم کردن و بەدەگمەنیش هەوکردنی گرمۆلەکانی گورچیلەی بەدوادا دێ.
● لەوانەیە هەر مۆرانە کوژەکان حوبان بەوەندەی بەکار بێن بینە هۆی وروژاندنی پێست و ئەکزیما (پیزۆ)
● لەوانەیە گرێی سووری بە ئاڵوش لە ئەندامانی زایەندی و بن هەنگڵ لە منداڵان تا چەند مانگیك دوای چارەسەر کردنێکی تەواو بمێنن.
● لەوانەیە هەر لەکاتی گرویتیدا نەخۆشییە لوکانییەکانی بگوازرێنەوە.
● گرویتی قەتماخە بەستوو Crusted (یان ئەرویجی) کە لەوانەیە بە ئاڵوش نەبێ. پەڵەیەکی قەتماخە بەستووی بەربڵاو پێست دادەگرێو ژمارەیەکی زۆر مۆرانە دەبینرێنەوە. ئەوە لە کەم ئاوەزەکان یان لە کەم بەرگە immunosuppressive کان دا روودەدات.
لەوانەیە ئەم بارانە ببنە سەرچاوەی ئانەوەی پەتا epidemic ی گرویتی ئاسایی.
پشکنینەکان:
مۆرانە دەتوانرێ لە کۆتایی بوودرەکان دەربهێنرێ لە ژێر وردبین دا سەیر بکرێ. ئەگەر ئەمان توانی، دەتوانین گەراکانی لە بوودرەکان وەرگین و لە ژێر وردبین دا لەناو هایدرۆکسیدی پۆتاسیۆم دا بناسینەوە.

چارەسەر كردن:

چەند جۆرێك مۆرانە كوژ لەئاراداان كە ئەمانەن:

١ـ بەنزیل بەنزومیت Benzyl benzoate

٢ـ گاما بەنزین هێكسا كلۆرید (لیندا Lindane)

٣ـ ئیوراكس Crotamiton (Eurax)

مۆرانە كوژی دووەم لە منداڵی زۆر بچووك و نافرەتی ئاوس دا بەكار نایەت. لەباتی ٦٪ نیشتووی گۆگرد لەناو پارافینی نەرمی سپی (پترۆلاتەم Petro latum) بەكاردێ. هەموو شەوێ لەهەموو لەش دەدەرێ بۆ ماوەی ٣ رۆژ.

هەرچی لیندان و ئیوراكسە كەمتر وورووژێنە.

● تەنها نەخۆش چارە سەر مەكە. بەڵكە هەموو ئەندامانی خێزان نەخۆش بن یان نا چارە سەر بكەو هەموو ئەوانیش كە پەیوەندیی رەگەزی (لوكانی) یان لەگەڵ نەخۆش دا هەیە، ئەوجا خورشتیان هەبێ یان نا.

بە نەخۆش بڵێ شەوی یەكەم بە مۆرانە كوژەكە هەموو لەشی چەور بكا، هەر لە هێڵی شەویلاكەوە تابنەپێ یان. شەوی دووەم هەمان شت. لەماوەی چارەسەریش دا نابێ نەخۆش خۆی بشوا. خۆ ئەگەر دەستیشی شت ئەوە دەبێ یەكسەر بە هەتوان دەستی چەور بكاتەوە. شەوی سێیەم با خۆی بشواو جلی تازە بكا بەر. جلەكانی پێشووشی جوان بشواو ئوتوویان بكا.

مۆرانە دوای هەفتەیەك خۆی لەناو جلی لەبەر نەكراو دا دەمرێ.

● لەوانەیە خورشت بۆ ماوەی چەند رۆژێك یا چەند هەفتەیەكی كەم بمێنێت. ئەو كاتە چ پێویست بە بەكارهێنانی زێتری مۆرانە كوژان ناكا. تەنیا پشت بە شۆرەی كالامین Calamine ببەستە.

**فەرهەنگۆك:**

★ گرۆیی بوون: گرووبوون، گرونیتی، گرۆیی، گەری، گەروێی، گەرك، گەرڵ، گەروك، گرکە، خارشت= جرب، نقس، كلخ = Scabies.

جیای بكەوە لە:

★ گولی: جذام، برص، بلاء، داء الاسد = Leprosy.

★ مۆرانە: عث، عثة، حمكة، حلمة، قارمة= acarus, mite جیای بكەوە لە:

★ كەنە: قراد، قرادة tick

★ مۆرانە كوش: Scabicde

★ ئالۆش: خوران، خورشت، خارشت، خوروو= حك= Pruritus, itch

★ بوودر: تونێل= نقب، نفق، ثلم= burrow.

★ هەستەوەری: هەستایەتی، هەستیاری= حساسیة= hyper-sensitivity

★ دیاردی كردن: تشخیص diagnosis

★ ئاڵۆزكاری یەكان: لێ پیس كردنەكان Complications

★ پشكنینەكان: investigations

★ ئەزموونەكان: تاقی كردنەوەكان tests

★ ئەزموونگە: تاقیگا: مختبر laboratory

★ سیما كلینیی‌یەكان: Clinical features

★ نەخۆشی‌یە لوكانی‌یەكان: نەخۆشی‌یە رەگەزی‌یەكان Venereal diseases

★ كەونار: مزمن Chronic

★ رسكاو، راسال، بالق: بالغ adult

★ داگر، گشتگر، بەربلاو generalized

★ خۆجێ: localized

★ وورووژێن: مهیج irritant

★ گرێ: nodule

★ هەتوان، مەلهەم ointment or cream

★ شۆرە: غسول، غسلة lotio, lotion

★ هەوكردنی گرموڵەی گورچیلە: glomerulonephritis

سەرچاوە

Clinical Dermatology

by Hunter, Savin, & Dahl

1989, pages 168- 171

# سەدای بێداری...

ت بێخەو

دوای هەلزنین بە پەیژەکەی
سەخت و ناسۆر
بۆ لوتکەی هێوەکەی (قاف)ی
هەزاران ساڵ
کامە پەیژە..؟ کامە کوێساری کوێست و کوێر..؟
(بورج)ی رۆحی شەهیدانی سەر لە ناو خوێن..
خێڵی فریشتەی کوردستان
هێزی گیانبازی هەڵکوردمان
چەپکێ تیشکیان هێنایە خوار
دێوی رەشی شەویان راونا
تووندبوو هێزەکەی خوێن خۆر
هاوکات لە گەڵ رابوونەکەی
شکۆمەندی بێدارەوە
لە دوای مەست بوون بە سروەکەی
سەرفرازی
لە دوای دەمیان کۆڤەندو کۆڕ
بۆ بێداری بێ ووچانە سەدای مێژوو
ئاوازو سۆزێکی گەرمی دیوانانە
لە گەرەلاوژەی شەوارەی
کۆرپەکەی نوو..!
ئاڵاکانی دەداتە رەگ و
سەر چڵی زێر..
هەلدەرێژێ تێرکەوخواری
هەزاران پەندو وانەو بیر
سەدای پەنهان هەموو شەوێ
زەنگێکی ئاگراوییە و نیگەرانە
لە نێوان کاروان ولووتکە
لە پێش رەوت و هەنگاوەکان لە سووتانە
وێنەی شەپۆلەی تەونکار
هەردەروا دەگەرێتەوە
لە گەللەی باوێشکداری ئەرک و فەرمان
هەمیشە دەزرینگێتەوە
لە شەوی تار.. بروسکی مانگی کوڵانەو
وەنەوزی مەستی ئازادی دەبەزێنێ
بۆ یەکبوونی چەپکە شۆرکەکەی باپیرمان
ئەم لقە (خاچ)ەو ئەوانی تریش
بەتین دەهەژێنێ
لە پێش هەموو بارەگایەک
لە ناو هەموو هزرو رەنگێک
شریقەو شەوق دەبەخشێنێ
لە کۆنترۆڵی تەخووبەکانی هەستەوەر
ناماڵەیەو وەرس نابێ لە هاتوچۆ
لە دوای مەستی سەرفرازی بێدارەوە
دەیان تابلۆی دەنگداری پەندی
کۆن و نوێ..
لە سەر هەموو شاخ و گردێ
لە هەموو کووچە وشەقام و شوێنێو سەکۆ
بۆ گیانبازان خۆ دەنوێنن
لە ناو ئاسکی وەرزو کات
لە نۆتەی داستانەکانی دێرین و نوو
بۆ ئەم هەوارازە ئاوازی زوانی لووتکە
دێننە روو..!
لە نۆتەی جاری دوو قەڵای
دم دم و پاشانی گەورەمان
لە نۆتەی هۆرەی بەسۆز قەڵاچوالان
لە نۆتەی دەنگی تەنەری داری کەڵێو
کانی ئاسکان..
لە نۆتەی لاوکی داستانی (ئاخ)ی بارزان[1]
بۆ دواهەوێن..
لە گەڵ نۆتەی چرپەی لەرەی
ئاڵایەکەی مەهابادمان
دەگەرێنەوە بۆ شاری ئەرك وبەڵێن
بۆ قەلاکەی هەولێرەکەی پەنجاسەدەی
رۆم و عەجەم و هۆلاکۆو فاشست شکێن
سەدای ئەم هەموو نۆتانە
کێوو دیوارەکان دەبرێ
زەنگی کارە لە ناوبنکەی
ئەرك و رێکخستن لێ دەدرێ.!
تارماییەکان رسوا دەکاو
پەردەی نەهێنی لە سەررووی
داڵ و رەنگاڵە دا دەدرێ.!
بۆ بێزینگدانی سەر چەمی قەڵاتی
رەوسەی هەرمەی قەوارەمان
لە گەڵ دەستێ کشت دایکێکی
سپیاڵ سیاو بێ ماڵ و نان لە سۆزدانە.!
زەنگی هەموو کوردییەکانی
دوو ئەنجوومەنە سلاوکەی هەرێممانە
بۆ بردنەوەی ئەو گرەوەی دێرزەمانە
لە سەر لووتکەی ناو تەلەسمی دێوو درنج
بۆ هەڵمەتی یەکبوونێکی دەجار بتەو چلوە روانە!

[1] ئاخ خەڵە

# خەونی پاییز

سامی هادی

( ١ )

هناسەم ئەونیوی سیبەرە
جریەم شەویکی ئاساکە
داتی گوی لەتەنیایی گورستان دەگرم
سەمای کەلا
هەسکاوی شەوەرەنگ
دەس بەداگیرساتی ئەنک .

( ٢ )

دەبیم بلی
ئەی کچی جوان
بۆەی ئازیزان خۆشترە
یا بەرمە غاری شەپۆلان
دەبیم بلی
ئەی هەناسەی
شەوەزانی شاعیران
ووشەی ئێوە گەرمترە
یان باوەشی
پر لەعەتری کیژۆلان ؟

( ٣ )

کەمەرجانی بارانم دی
لەنێو چاوی بەفر خەوت
کسی . . .
دوا هەوالی لم ئەزانی
. . . بەمیژەی دیاراندا سەرکەوت

( ٤ )

بۆسی با ئەکەی
کاتێ هەوری پشکۆ
ئارمایی خۆلەمێش ئەدوێنێ
یان کەلای بەفرو رامانە
لەقەفەزی خوودەوە
ئاوازی ئامۆیی ئەخوێنێ .

# ئۆقیـانوسی

-١-

**بەهەموو هێزی هۆشم**
**خەوالوو نیم.. چاو بە جیق نیم**
**عەرەبەنکم نەخواردبوو.. سەرخۆشیش نەبووم**
**پر بە دەستانم**

پەردەبای گەمیـیەکەم: گەمیوکی کۆك و قشتیلۆکەکەم هەلدابوو
سیر سیر، قیبلەنـامە ورێنامە جرمجر دەخوێندرانەوە دوو سێ
دەنکە قەزوانەکەی بنی بنەوەی گیرفانە هەمیوانەکەم بۆ نەقرتا
ئەمەم هێبوو، گوڵکەکیش، چووزانم چ رەنگێك بوو، بەس سوور
نەبـوو سێسـووم هێبوو، شووژنێك و دیوار برێك و شەمشاڵێك
لەبەردەم دەروازەی زەخرەفەداری زێرکەشی سێبەرگر پاك نیازم
ـ ئەی دەستەکانت ئەرزێ وەستاژن!
کچەی دارتاش ئەمەی لە هیچەوە ئافراند
پێیەکانم توند توند بەزەمینەوە نووسا بوون
بە گوێزانێك ئەرموکە، رەفتاری دەنگ خنکێنی دەکرد
مووی سنگی دێوان تەراش دەکرد
ـ بەبێ ئۆقیانووسەکە دەرۆی؟
ـ نا دەچمە بن گوش
ئارمووش بە خەلات بۆ خەمە گروو دێنم تا پرخە پرخ و کڵك و
وەشێنی و پەنجە مژینم لەکۆڵ ببتەوە ژووانی ئەوان لە دەوری
ئاگـردانی زەوق بزوێن بوو گۆرانیـان بۆ هەرمێکی لە سوڵك

# کی ئاسنیـــن

عباس عبداللە یوسف

ووست کراوەوە دەچـــری ئەم داوێن پیســــە، خۆی بوو فێرە
شپەرستی‌ی کردم درەختی دەکوشیم و جیوەی لێ هەڵدە
راند
ەرازەوان دەسەو ئەژنۆیە
مورەی ناوکۆشی دەسەمۆیە
و هات و خەونەکە دارژا
داری کردم، هات، گێزەرم داییێ
ۆ من پێش ئەو دەروازەوانە بەخەبەر بووم، چەکدار بووم کە
ەونەکە کراسکۆرکێ بکات
ەی حەپیوکی زەرنیخ بارینی تێبەر دەبێ
یوالێ بە زیوالێ دەکات
ش و فش و تاوسانە دەچێتە سەر نیسکەملی سێ پێچکەیی
ارکێش کردوویە بە ڕۆژی حەشر
ـ زێبازی بەدفەر تۆ نەهەنگێکی مۆمدان بە دەستت بۆ نەهێنام
ـ بەڵێ نەمهێنا نەمهێنا چونکە نەمهێنا قولنج تژی پشیلەی چاو
ەقی گوێ تەبـەقی کلك مەتـرەقی قەترانی‌یە تۆزادەکانیش،
دەستیان لەمل یەك کردووە
دەتوت، ئەم جووتە دڵدارە، دەعبایەکی هەوار کوێری هارە
بەمەموو هۆشم، هۆشی چاویلکە دارم
بەمەرزندەی ئەنگوستان، لاپەڕێکم هەڵدایەوە
یزانم، نژناندنی کەمینێك:
قولەرەشێك ئاژوەری بێ، چی دەوێ؟
بەخت بینیمان کرد و لەنگەرمان گیرکرد ئەورەسەکان، دەورمیان
لە ئیمە دابوو
خەواڵوو بوون، خەومکوتکە بردبوویانی
تازە غەرمبەنگیان خواردبوو
تازەش سەرخۆش بوون
ئەوەك وایان لە ئیمە ئەدەکرد
مەرگەمووشیان دەرخوارد داین
ـ ئێرە کەنارە یان ئێرە ناوەندی ئاوستانە!؟!
کار لەکار ترازابوو، هەڵقە لە هەڵقەش پچرابوو
شەپکە دارەکان، دەچوون مرازی خۆیان حاسل کەن ئیمەش بە
تایبەت من و کەپتانی بەندەر ناسی هەزار دۆست لە شەپکەکان
رادەماین ویکرا دەحەپەساین ـ
پاش ئەم ئاوەستانە هەر ئاوایا؟!

ـ٢ـ

ئاگر ناکێشم، مەی ناخۆم
بەیانیان گۆپاڵەکەم چەور دەکەم
ئەوەك مۆرانە دار بێ
خەنە لە سمێڵم دەدەم
لەبانیۆیەکدا، خۆم بەزیواو دەشۆم و
چ یاسایەك نا دۆزمەوە.
ئاوە لیمۆ فڕ دەکەم و بەدووربین چاوە ئۆری هێشە کوللە دەکەم
پشت ئەو تەمومژە بە ئاستەم تروسکەی فەنەرێك دیارە نووشتە
نووس ئاشکرای کرد:
ـ هەتاو لەبەر خاتری گوڵبە ڕۆژ دەسووڕێتەوە.
١٩٨١/٢/١٩

فەرهەنگۆك
سینسوو = جۆرە مەورەدیکە
حەپیوك = زۆر دەومرێت
زێباز = فرصات
گوڵبەڕۆژ = گوڵبەڕۆژە
هەوار کوێر = وجاغ کوێر

# تراژیدیای مەرگی پاییز

عبدالقادر سعید
١٩٨٦

لاشەیەکی.. ماندووم، ماندوو
هێشتا چەپکێ تیشکی خۆری بەیانیانم
لە پەنجەرەی ماڵەکەی خۆمانە دیوە
بەنیشتمانەکەم نامۆم
کەچی مێژووش بە خوێنەکەم
دێر.دێر هەموو سەرکەوتن و
نووچ دانێکی خۆی نووسیوە.
درەختێکی چەن ساڵەی

بناری کێوی هەرەسم
هەر سیزیفێ سەرکەوتبێ
د ر کابەردێ داگەرابێ
بێهوەری مەرگی چڵ و
چەن د ڵۆپە فرمێسکێکی
منی تیایە.
ئەی لەو زام و ئاسۆرانەی
«لە ئازارا وشەم لە بیر ئەبەنەوە» [1]
لەو هەرەس و دارمانەی
یەک لە دوای یەک
دوایی نایە
ئەمشەو شیعر
دڵۆپە بارانی بە خوڕی
ژووری دڵەوە.
ناهێڵێ چاو بنێمەخەو
شیعر تارمایی خەمێکە
کەم ڕۆژ هەیە بەناو دڵا
ڕانەبورێت و مان نەگرێت
خەمیش نییەو لە خەم ئەچێ
کەدێت وەک گاسن ئەمکێڵێ
ئەمشەر میوانی ناوەختەو
لە ئازارما ئێشک ئەگرێ
سەری ناوە بەسنگمەوە
لەوە ناچێ جێم بهێڵێ.
ئەی ڕووباری وشکی تەمەن

واماسی گوێ کەنارەکان
ئەیانەوێ خۆیان فێکەن
کە ڕووبار مرد..
کە دەریا مرد..
کە جۆگە مرد..
ئەوان ئەمرن
مەنگاویشم وا فێنەکەم
کەئەستێرە هەموو نووستن
مانگ خۆی کوشت و
خۆرەهەڵنەهات
لەنیشتمانی خەرەندا
ڕێ بەر نەدات
وڵاتەکەم ئیسماعیلێکی یاخییە
بڕوای بە پاشگەزبوونەوەی
ئیبراهیم و، فەرمانی مەرگی خۆی نییە.
کەروێشکێکی سرکە هەمیشە تەریوە.
لەسەرابی هەرکانیەک،
لەخەو بینی مەرگی خۆی،
لەترپەی پێی هەر ڕاوچییەک،
ڕاپەریوە..
سنگی شەقاری هەر ئەڵێی،
کاشە بەردی لوتکەی هەرەسی دێرینە
هەرزامێکی
داستانی سەردەمی سۆز
سەردەمی زام،
یاسەردەمێ پێکەنینە
من لەزامی پرسوێی خۆم و
قاقای تۆڵەی ئەهریمەنا
لەسەر دەمێ ڕادەمێنم،
چاوەڕوانیی بازی مەرگی
ڕۆژی هەزار جار هەڵئەدا
زاڵەی ژیان هێندە تاڵ بوو،
مردن تامی ئەوی ئەدا
ئەو دەمە دێ کەمان
کچە قەرەجێکی سادەو ساکار،
پێ لەناوچەمی ئەوینا ڕاکشاو
تاجی گردێ بەسەرەوە

[1] ١ـ تەعبیرێکی مایکۆفسکییە.

ورکەلی دێ..
مبازوی رەنج
راسی سەوزی قەرسیلیان
ی نەپۆشی و..
لوانکەی گلۆکە سورمیان
مل نەکرد
ەموو رۆژێ
ەم دەریا پرمرواریيە
ال بە مال
ست بەبستی
ەبروە چقلی ئەو چاوانەی
ەو دەروونە قەترانیيانەی
خوێنی ساردی لێوی گەستو
ئاگاداری نەکردەوە
ئینجا بە زۆر
دوور بینی لە چاوی برسی
چاوی ماندوو
چاوی تۆلەی نەکردەوە
گوندەکەمان
رۆمایەکی بچکۆلەبوو

ئێرۆن بە دەست و پەنجەی حری
یەکەم گوێسەبانەکەی گردا.
کهانی دێ،
لە ترسی هۆردوی تالانکەر
دەم و چاوی گوڵ رەنگیان
لە خۆلەمێش هەڵنەکێشار
لە خەڵوزانی دێی سووتار
کراسی قەترانیان کردەبەر
وەکو بارەکەوی هێشتا بال نەگرتوو
منال جەستەی هەل لەرزیویان
نەخستە ژێر کەوای ئاودامانی .. یکی
بەسەر زەنیشت و جنێو کاس
بەنووکی نێزە ریزکردوو
ئاسمان کراسی پرسەی پۆشی
ئەستێرەی رەش کز ئەسرتان
بۆنی ئاگر..
بۆنی مردن..



بۆنی تاوان..
بەیانی زوو
لەگەل ئاسۆی هێشتا تیشکی
خۆر نەدیوا
پۆلەمەلی بال هەلکروزاو
رەوە ئاژەلی بێ شوان،
خێزان.. خێزان
لە پال پەیە دیواری ئەژنۆ لەرزیوا
چاوەروانی،
دوا هەناسەو
دوا شالاوی
چرە دوکەلی
دێ یان بوو.
ئەو دەمانە
پاکیز چرۆی گولە باخێکی گوێ چەم بوو
پێش ئەوەی گوڵ چاو هەلبێنێ
پێش ئەوەی بۆن چەم سارێژکا
لە دووربینی روانگە قوولەو قەلاوە
لەبلند گۆی شەوانەی زۆر لە مالانی
دەست لەناو دەست، دوژمنی گەل
تێکەلاوا
شوێن و کاتی
پشکوتنی ئەم چرۆیە
دەماو دەم بوو.
سال مەلێکی ژێر بەرد بارانی راوکەر بوو
سال رێبوارێکی دواکەوتووی
کاروانی بارگەو سەفەربوو
نیمەی پەروبال هەلکیشراو
دەروون پرداخ
ئاخ چزکراو
پۆلەمەلی کەسیرە بووی
رۆژانی بووین،
ژیان قەفەز
رێگە تەلەو داوی وورەبوو
ئەو، رۆژانە
مەرگی نیمە
بەهەر زمانێ باسی کەیت
بەهەر کالایەک بی ..ی

زیاتر نەبوو لەوەی تەنیا
سەلکە تووری لە زەویا هەڵبکێشی[٢]
ئەی خۆری گر لە خۆبەردا و
شاهیدی ئەو شەکە تیەیت،
لە بەرگری هاوینانتا
ئێمە شەوان کەلاکێکی لە هۆش چوو بووین،
بێ دەنگ تر لەبەردی چیا،
هێمن تر لە ئاوی کانی،
دڵنیاتر لە کۆتری تاقی مزگەوت
کەچی تارمایی شمشێری
لە ئێسکمان هەسان کراو
کەچی تارمایی ڕێوییانەی
لە ژێر بنچك
کولانەی سەگ
پشت ئاودەستخانەی بەگوێنی
ئاسمان بەتاڵ
چوار لاتەنراو.

هەموو شەوێ، شەو ناشەوێ
هەموو ساتێ
تا... تاوێ،
میل[٣] پرسیاریان ئەهێنا
بەدوو چاوی ڕوانینمانا
کێ تان ئەوێ...؟؟
١ـ مەرگمان ئەوێ
٢ـ مەرگمان ئەوێ
٣ـ مەرگ
٤ـ مەر
٥ـ مە
هەموو = م
«هەموو دەنگەکان ئەخنکێنرێ»
مەرگ سەربازێکی وونە
[کێتان لەکێ خۆشتر ئەوێ]



مەرگ
مان
ئە
و
ێ..
...رار بروسکەی توورە بووی
...ەوچاوانە بوو وەك چاوی
درندە خوێنیان تێ ئەزا
لێشاوی خەمی پەنگ خواردوو
کاسە...یەکی لێوان لێو بوو
تاڵێ ئەرژا
دەستێکی قورسی دەمار گرژ
...کەداری دەستی هەڵ ئەبری
تۆزی بنمیچی ئەو ڕۆژان
...ەنەعرەتە یەکانەیەکی دڵ پڕبوو
هەر ئەوەندەو
ئیتر دنیا،
لە پێش چاومان ژێرەو ژوور بوو
بەڵێ یاسا
کەڵەشێرێکی ئەخۆش بوو
لە کۆڵیت و کولانەی ئەوانا
هەڵئەنیشت
بەیانیان زوو
بانگی هەقی بۆ هەڵئەدان
هەر.. ملی کەچ
هەردوو دەستی پڕ نزابوو
کێوی ڕەنجی ئەخستە بەر
ڕێژنە گلوبەڵری زریان.
گورگی هاری ئەوسن زیاتر....
ماری هاری گەستن زیاتر....
چاوی تاوانی سوورەبوو
هەتا ڕۆژێ ڕێزی قەرەوڵ تەمەن...
لەدوا شوێن بێ...ی

٢ ـ لە ئازم حیکمەتەوە
٣ـ شتێکی سوورەوە کراوە لە کۆندا ئەهێنرا بەچاوی تاوانباردا.

مەلایەکی دەم گوێزانی
مە چەك سپی بڕۆ بڕا
کۆڵانیان گرت
سەربانیان گرت
هاتنە ژووری
بێ پرسیار
بەبێ وەڵام
بە ڕۆژی نیوەڕۆ
بەزۆر،
پاکیزی تەمەن شانزەساڵ
لەیەکێ لەو ژەندرمانە
مارە بڕا..

ئەوە کەلبەی کەلە گورگێ
ئەوەش کاریلەر ڕەشکەڵەی
بەرچەپەری کۆڕی لادێ
ئەوە قاسپەیە سوێی گیانی.
ئەسپە بەم
ڕاستم.
چەپم،
هەورە سکاڵای زەوی،
ئاسمان
نیقلیم گیەم
پاکیز وەکو مۆمی شەوی چاوەڕوانی
دەم ئێواران
گڕی ئاموزی لە شەوێکی نوێ بەر ئەدا
بەبەهارییەوە ئەکوژایەوە

شەوێك ئەبوو
شەست شەو پاکیز
بەدوای سەرا بێگا وون بوو
شەست شەو پاکیز
شەوێنێکی بێ فەرمانو
فەرمانێکی بێ بێستوون بوو

مەرجی ڕەشی قەترانی شەو، زریان شانەی ئەکردو بەخور ڕێژنەی لێ ئەچوڕا/ چەخماخەی هەور/ چەقەی دانی دارو درەخت/ هانای چۆلەکەی هەلکورماو تەپەی هەنگاوی بەپەلە/ هانکە هانکی هەناسە سوار/ سەمفۆنیای جەرگەی جەنگێ بوو/ مەگەر مێژوو جارێکی تر کاسێتێکی ئەم هەوا دانە لێ باتەوە/ چوار پێنج زەلام/ خوێن لەبەر پێیان ئەچۆڕێ/ گۆلاوەکانی سەر ڕێگا دەمیان ناوە بە جۆراوگەی دە پەنجەی شل/ دەهۆسکی سەرەوژێری تارمایی یەك/.

هێشتا پاکیز ئاسۆیەکە.
چاوەڕوانی گەڕانەوەی
تیشکێ ئەکا
لەبەر دەرگای هەمیشە چاوەڕوانیا
چەخماخەی هەور
نیگای سەرنجی خستەسەر
دەم وچاوێکی ڕەنگ سپی
خورپەی دڵ، سەرنجی قوڵ
ناسییەوە
جارێکی تر، کۆستێکی تر
بەگەر دنیا خۆی هەڵواسیو
پشکۆیەکی تریش چزا
بەناخییەوە
نیستە پاکیز
بە نوکی شەنی، ژانەکان
خۆڵەمێشی بە جێماوی
تازە مەرگی
هاوسەرەکەی بە بانەدا
لەبەر زریانی پاییزی
ئەم عومرەدا،
«با» ئەی هێنێت و
«با» ئەی با.
مەلی ڕوحی شەکەتیوا
لەناوەندی ئوقیانوسا.
مەرگە ساتە



کاشە بەردێ
لە ترۆپکی ژوور هەورەوە
هەرەس بێنێ
مەرگە ساتە
سەرت لەناو شەپۆلی تورەی کەنارا
مەرگە ساتە
جەهەر بە رووتا دابخرێ
پاکیز وا بوو ..
باڵی قەقنەس هەناسەی بوو
کولە ئەستێرە چاوانی
زامی بە قەد کومەزی کاک ئەحمەدی شێخ
ژانی هێندەی رەشە باکەی سلێمانی
بیری وەکو رەگی داچووی،
دار گوێزێ حەوشەی خانەقا
لەسەمفۆنیای جەنگی خوێناو دەروونا
لاوکێ بوو، حەیرانێ بوو،
وەك سەربازی وون ئەجەنگا
پاکیز چوڵەکەی ئەسرەوت بو
لە قەفەزی ئەم وڵاتە
بەرنە ئەبوو
ئاسمان قەفەز ..
زەوی قەفەز
سنورەکان بە ئەڵقەی چاو
تەنرابوو
بەڵام دەنووکی خوێندنی
باڵی خەیاڵی فڕینی
هەتا بڵێی
فراوان بوو
ئاوەڵا بوو.
ئەم ئەیویست گیان
بکات بەبەری ووشەدا
ئەوانیش وایان ئەویست کە،
ئاگر لە مێژووی رابوردوو
ئێستەو



داهاتووی خۆی بەردا،
رازی ئەبوو
ئەم جارەش کۆت لە دەست و پێو
هیوای بخرێ
رازی ئەبوو
لە ژێر برووسکەی شمشێرا
چۆك دابداو
مل کەچ بکرێ
رازی ئەبوو،
لەمەجید بەگ[٤]
لاشەی مرۆڤ بگرون و
لەناو دێی کەڵەوانانا[٥]
پێستەکەی هیزەو مەشکەبێ
رازی ئەبوو
لەبەر ئەوە
تاك و ئەمات
شەپۆلی ناخی ئەسرەوتی
پێی دا ئەگرت
تاکو ئەمات
یاخی ئەبوو.
ئەی ژانداركی مەرگی لەسەر سینە
نووسراو
لێرەش مێخ و گوریس و پەت
لێرەش کوللە ..
ملی هەزاران مارگرێت
سەدان پاکیز
دەیان هیوای سەوز ئەگرێت.
سەر هەڵبڕە
تۆ بڕوانە
بەشوێن کالیسکەی مێژووا

٤ـ مەجیدبەگ گەرەکێکی میللیە لە شاری سلێمانی
٥ـ کەڵەوانـان دێیـەکە لەناوچەی سلێمانی لە بەرەبەرای ئەو ڕۆژگارە شوێنی گەمرایەتی و کۆنەپەرستی بوو.

سەدەکان پێش بڕکێیانە
شۆڕە سواری جبە بەشان
بەسەر کۆڵی ئەسپی سەدەی
ناوەڕاستا
ئەڕوا بەسەر لاشەی ماندووی
سەدەکانا.
ئێستە لەناو تەپ و تۆزی
شۆڕە سوارا
بۆ ئەم شەوە
ئەم مردنە
ئازارێکم ئەگەڕێم بە شوێن برینا
برینێکم ئەگەڕێم بە شوێن ئازارا.

★★★★★★

شەو بوو
شەوگار
پرچی ڕەشی قەترانی
لەبەر گۆلە ئەستێرەدا
دائەهێنا
چاوی بەسوتوی هەناسەی
ئاوارەکان کل ڕێژ ئەکرد
شەو بوو شەوگار
ئێشکی بەدیار سەرەمەرگی
چراکەمانەوە ئەگرت
دەبوژە پیاو
دە ووڵاخی دووپێی،
دەم چاو
ش،
ا
را
و
ە
ی،
ژێر جامانە
هێواش
هێواش
پێیان لەسەر
هێلکەی دڵمانا دادەنا



سەنگەری چۆڵ
دەرگای والا
گیانی نووستوو
یەکەم چرکە
یەکەم دەست ڕێژ
دونکیشۆتی پیاوەتیان
مژدەی دابەسەرکەوتنی
گەورەترین داستانی پەرەی مێژوو.
مەرگ وابوو.
کەلایەکی زەردی درەختە ڕوتەڵەی
کوێ بانیژۀ نزمەکان
مەرگە سەمای کەوتە فڕین
ئەستێرەیەك لە ئاسمانێ دووراکشا
مانگ سەری نایە ژێر باڵی
پەڵە هەورێکی هاوینە
ڕەشەکانی ڕەوەزی خەم،
ئافەتاف کەوتە هەڵقوڵین
ئێستە پاکیز
چرکەیەیەکە بە یانیان زوو
لە سەرکانیو
بەر بەرۆچکەی چێشتەنگاوا
پەپولە ئاسا بڵ ئەگرێ
نهێنی نوری ئاڵتونی
ئێوارانی مەغریبستان
بەگوێی سامی زیندەخەوا
ئەداو ئەفرێ
- کێ ئەڵێ گیان مەڵێ نییە
- کێ ئەڵێ گیان هەر گیان نییە
ئەی کێ ئەڵێ گیان ئازاری
بیرەوەری مەرگەساتی ژیان نییە!
پاکیز وابوو..
خەیاڵی دوور، سەرنجی دوور
پرچی چیرۆکی ئەمری
ئەتا هەتایی بۆ ئەچنی
پاکیز وابوو..
فەرهەنگی بوو،
ووشەکانی
هێمای ئێستاو

داهاتوو بوو
وەک هەزاران
پرچ هەڵە کۆکی ئالەرەتان
لە سێبەری خۆی هەڵنوتا
وەک هەزاران
هەڵۆی شاباڵ هەڵکێشراوی
هەتا هەتایە چاوەڕوان
بە مەرگی خۆی،
دەنگێکی تر
ڕەنگێکی تر
مانایەکی مەزنتری دا بەژیان.
مەرگی پاکیز
پڵکە زێرینەی دوا بارانی
بەخوری دیدەی دایکم بوو
هەموو ڕۆژێ
دەستی چەماوەی لەمل
خەمەکانی ئەکردو هەر،
لەژێلەمۆی هەناسەیا
نوقم ئەبوو.
ئەو سەردەمە
چوار دەوری دنیای ئێمە هەر
ئەوان بوون
«نان ئەبێ خاوەن گشت شت بوون»
هەزارەکان دوو ڕێگەیان لەبەر دەمە
یان ئەوەتا کۆتی مل کەچی لەمل کەن

یان ئەوەتا
دەست بۆ گەروی ئەفسوناوی
چارەنووسی خۆیان ببەن
داستانی مەرگە ساتێ ئەنووسەوە
سەردەمانێ
وەک کەنداوە سەرگەشتەکەی
لە غوربەتا ڕەش هەڵگەڕاو
ناخ تورە بوو
بیری ڕێچکەی ئەو تاوانە
لە دەروونما پیشی ئەخواردوو هەڵئەچوو
کە زانی ئەو موچڕکەیە ڕای ئەژەنم



دەستم ئەدایە تفەنگ
«کە ناری بیر»
سنگی ئەدایە بەر مەرگ و
زەنگە بیری تۆڵەی لە دەستا
ئەسەنم
پاکیز قوربانی قۆناغی
کۆچێکی تازەی مێژوو بوو
هێشتا زانی جوتیارەکان
شارێز نەبوو
ئەو سەردەمە هەڵۆی شاسوار
ڕێبواری بوو
ماندوو..
شەکەت ...
هەناسە سوار
ئەوین دڵێکی بچوک بوو
ڕارا،، تورە..
ڕەنگ زەرد
ساکار
★★★★
ئەی سوارانی چەرخی کاروانی
ئاسمان و زوی و دەریا
هیچ خوری بێ ئاسۆ نەبووەو
هیچ ئاسۆیەکیش بێ خوێنی
دەیان پاکیزیش سور نەبووە
ئەی سوارانی
کۆڵی مەرگ و
ئەوین دارانی کازیوە
مێژوو چاوی قەڵەمێکە
لەبەر تیشکی خورێکی گەش
ئەبینێت کێ
لە سێبەرە زەردەکانا پاڵ کەوتووەو
کێ مەرگیشی وابە پێوە.
★★★
سلێمانی ١٩٨٦

# ئاونگی پیری



شیعری: نەوزاد عەلی ئەحمەد

لەم چرکەنە کێ باڵی تۆ لەتەمی ترۆپکان دەناڵێنێ
سێلاوی چاوی کانیان دەبێ ئەلقەی کام رێبەندان بپسێنێ
خۆرمان لێ دەتکێ، خەڵکی گراوی خۆیان دێننە تکامان
ماچو موچی مردن لەرەوەزان خلۆر دەبێتەوەو لەکەندان-
سەردەردێنێ
ئەم دەفەرە پەمەیی بوو، دەستو قاچی خەرەندانەی لێ ئەڕوابوو
سترانی خێراتی گەردنی ئەم چیایانە وەکو کۆنات لەرزی گرتبوو
سازی ساز ژەنان لەبن دارێکی بێ کڵاو دەژەندرێ
گەردن زەرێ ئەم زەمەنە: ئاگاداربە، کەزیەکانت ئەتخنکێنێ
چرای فریوی دایكو باوکت بەئەسپایی ئەتسووتێنێ

* * *

دەچمە کەپری رەزەوانان ترێیان دێنم، ترێی مێخۆش ....!
ترێ دەتکێتەسەر کەلا وەریوەکان، دەست نوێژی کچانی پێ ناشکێ
کوڵێ من کەینێ ئەم پەیڤانە چاوانت لەگلی رەشتر دەکەن
-ئێوە سێبەران هەڵدەگرن بۆ ئەو پەڕی دونیای دەبەن
دەبێ دیوارە شڕەی بەر قەرسیلان ئاونگی نەگرتبێ .....!؟
کوڕە غەریب: «ئەم رێگایە دوڕیانی بنارانە شەکەت دەبین،
شۆڕە کچێ من مامە پیرەی بلوێر لە دەست.
دێتە ژوانمان نوشتەی دەم بەستن دەژمێرێ
دوگمەی چیایان وەلا دەنێ. ئینجا خەمان هەڵدەرێژێ

* * *

تارماییەك دەخمێم دەنێو دەگەڵ کۆڵەکان ختمم دەکا
کێ بەخۆمان دەگرێ. مەگەر سینەی ئاگراوی تۆ نەبێ
هەڵسە کەپرێ بانگمان دەکا، دەڵێی داری شەکرانێیەو
لەبنەبنێ پیرە قەندیلێ حەیرانێ بەژنێ مەیە.
هەی لەخۆمی...! چەندی بانگ دەکەم دەنگم ناتکاتێ
-مەترسە. لەم رۆژانە باڵت لێ دەڕوێ هەی بەندێ من
کچە تیم حەیران: کەسێ کەسانم تۆی، عەکیدێ من
-بەم زستانە. بەفری ئەمساڵ دەتوێنمەوە
-بەڵکو نزرگاو پیاو چاکی عاشقان بدۆزمەوە



١٩٨٩-٧-٢٧
هەولێر

## دوایە رجوی روح

کەژاڵ ئەحمەد

-١-
رۆحی عاشق
ئارام بوونی دەگمەنە وەك
مەینەتی جەستە ی بزێوی
دەریایەکی ئێجگار بەستوو!
( قەناعەتی ) ساردو سەیرە
وەك دۆلێکی لەژێر لێفەی
بەفری کیمیایدا نوستوو..!!
جەستەی ئاشق..
لەرۆشتندا هەرگیز ناونیشانی وەستان
پێ نازانێ
لەکب بوون و نەنوستندا
سەرما بەگەرما دەزانێ
-٢-
روحی مـــن ..
ئەسپێکی رەسەنە
مەگیرەم ئازیزان
بۆهیچ حیزبێك
بۆهیچ پیاوێك
بۆهیچ کەسێك
دابین نەبووەو ... دابین نابێ ..
تائێستا سوارچاکێ نەبووە
بۆ ( ئەو ) ی عاشقی باڵدار!
دەشێ زۆربەیەك شیابن
ببنە مەیتەری سێبەری
بەڵام هەرگیز کەس بۆی نەبووە
بەشۆرە سوار !!!!
هەر بۆیە منی بروسکە
تائەم عومرە
دەستێك بەرتاڵێ لەیاڵی ئەفسانەیی
ئەسپی یاخیم نەکەوتووە !!!
هەنووکە،
بەتەنیا، مۆسیقای حیلەی و
پاکیزەی غاردانی بۆ ئێوەن
دەنا خۆی ملی رێژ
ئەوجارە پرنورەی عەوێقی ئاسمانی گرتووە
دەنا خۆی بۆکەس نەبووەو بۆکەس نیە !!!!!
دەشێ روحم
بەرسووتمانی ئافرەتانەو
چەخماخەی چیا کەوتبێ
دەشێ جەستەم
لەساتۆکەی بەخشینیدا
ون کردنی گەرمی غورور
جوانی جاویداتەی غووری لاپەسند نەبێ!
دواین جاریش من ئەو هەموو
هەڵهاتن و .. راکردن و
غاردانەم لەبەرئەوەیە
گرتنم گران و رام کردنم مەحال و
شکانم گچکەبێ !!
ژیانم پەرجووبێ و
مردنم گەورەبێ

* مەگیرەم ـ لێم مەگرن
* پەرجوو ـ معجزە

## ڕاسپاردەی خ

خەون نەبوو، ورێنەی تەلەسی زستانێکی ساردو سڕ و کۆچی تۆفانی شەوێکی تووشی بێ کۆتایـــــی شەوی سووتانی برایم و ....

راکشانی بودابوو لەسەر تیغی شمشێر !
ساتەوەختی چاوەڕوانی گڕ تێبەردانی گیانـــــی شیعرێـــــك
شەو ، زیندانێکی ژ ‌ ‌ی زەمینی و نهێنییـــە
تەنیایینە حەللادێکی خەوتوو

خەون نەبوو ،
رۆحی شیرینی بەرخێکی سەربڕاو بووم
بەسەر لاشەی لەخوێن گەوزیووودا بەهەڵکورماوی
لەزەماوەندی قوربانی دا ،
پێستی خۆم داماڵی
ئەوەنا نێچیرێکم ، دەستەمۆ
خوێنم مۆری پاسپۆرتێکی قەڵپەو
کەللەسەرم باجی پەڕینەوەی
ژووری ئاپۆرەی ( ئە ) و ( نە ) ،
خەوی نەزۆکی شووشەیەك حەبی ڤالیۆمم
قەلەمەکەشم لەپرسەی ئەو شیعرە سەرگەردانەن
لەدەلاقەی دیوارە ڕووخاوەکان
لەنێو دەفتەری بیرەوەری دا بەهەتیوی مابونەوە
شەوان بوورین ، هەرنەهات
رۆژانی بوورین ، هەرنەهات
وەرزەکان ، ساڵەکان ، بەچاوتروکانێك تێپەرین
عومری نامۆیی ، گوڵان ئاسا پەرپەر هەڵوەرین
ژوانگەکان لێکترازان




**فەرەیدون سامان**

عاشقە ساویلکەکان ، کتر ئاناسنەوە
ئەمە ئەفسانەی سەردەمی قات وقڕی وبێوڕەییە
ئەمە نەپێشەکی ،نەکۆتایی ئازارەکانە
نەکۆتایی ،نەپێشەکی سەردەمی ڕووخان و
مەرگی ووشە باڵدارەکانە
مەرگ تەتەرێکە سواری ئەسپی گەردەلولی د داڵە
ئاسمان و ڕێسمان بەرەو ( نەبوون ) رادەپێچێ
گوفەکە خاپورەکان دەبنە کۆشکی بلوورین
کوشکی بلوورین ،گەندە گوفەکی ئەمرۆن
شازادەی مێشك پوچەڵ
تاجی زێڕین لەسەر دەکا
کەللەسەری پووکاو،عەرشی پ بکەرە ئیشکـــــی
گۆڕستانـــــە
دنیا فینجانێکی سەرەو نگونە
پڕ لەنەخش و نیگاری بێ مەعناو هیچوبووچ
پیرە قەرەجێکی رووخسار پڕ لەچرچولۆچ
بەگەشبینییەکی درۆزنانە ،

بەشی کردنەوەیەکی نێرەمووکانە خەونەکـــــە
دەگێڕێتـــــەوە ..
شەو قەفەسێکی ئاسنینـــــە
خۆریش ،کۆترێکی دیـــــل
تورِ هەڵدرابووە نێو کونجی تاریکی ئەم قەفەسەوە
بەپەرەی تیشکەکانی ،گڕی نەمری
پرژاندە نێو ئەشکەوتی نهێنی ،
پەیکەرە بەردینەکان هاتنە جوولە
جارێکی تر شەو بەدەست خۆرەوە بارمتە بوو
ئێمەش ماڵاوایمان کرد

بەهەناسەیەکی ساردو کرنووشێکی بودییانە
نیگام لەوستێدانە کرد کەبەمنداڵی شەوانـــە
خەویان لێ دەدزیم
نوێژم بۆ ئەو خاکە کرد کەلەخۆشەویستی بـــێ
بەری کـــردم
برینە گەشەکانم پردی پەڕینەوەی ئازارەکان بوو
هەناسەیەکی سەرمەست بووم خنکام
تێکەڵ نەبووم بەو دوکەڵەی کە دەمامکی جۆراو
جۆری
ڕۆژگارێکە ناموترە لەخەونی ڕەنگاوڕەنگی
منداڵێکی ساوا .

بوومە تەمێکی سەرکەش و ڕوەو باڵای هەورەکـــان
هەڵکشـــــام
ئاسمانی بیابانی وشکەڵانی کوژالك و درکی ژەهراوی
لانەی داڵە گەندە خۆرەکان بوو
ئەمە خەونی تراژیدیای دوالاپەڕەی داستانێکـــی
قاچاغــــە
پەیڤەکان نەبەمیکرۆسکۆپ و نەبەتەلسکۆپ
ناببینرێن و ناخوێنرێنەوە
خەفیەکان ،ماڵ بەماڵ ،کۆڵان بەکۆڵان
لەدەشت و چیاوزینران و
تەنانەت بست بەبستی گۆڕستانەکان دەگەڕێن
من نازانم کەی دەمرم
ئەمە بڕیاری پیاڵە ژەهرێکی شیرینە
ئەمە زایەڵەی دەنگی گوللەیەکی سەرگەرمە
بەڵام کۆتاییەکان
سەرەتای هەڵاتنـــــن
سەرەتای شێت بونن
سەرەتای خۆ کوشتنـــــن ....

هاوینی ١٩٩٢

# شیعری ئەدونیس

وەرگیرانی محسن ئەحمەد

١- رۆژانی رابردووم گۆڕێکە
بەڵام بێ جەستە

٢- دان بە هەڵەی خۆم دادەنێم
وا هەست دەکەم لەجێی خۆی بوو .

٣- دەنووسم -
لەمە تاقە گەورە رێگایە
تا خۆت بخوێنیتەوەو گوێ لە جیهان بگرێ

٤- درەختەکان :
دەسماڵی گرێدراون بەدامەنی ئاسۆوە
چرۆکانیش مەمکیانن .

٥- رووناکی بەرهەڵستی ناکات
رووناکی یا هێرش دەبات یا خۆی بەدەستەوە
دەدات

٦- ئەگەر دەریا داستان بوایە
ووشەکان باڵندە بوون .

٧- خۆڵ برای جەستەیە
هاوڕێی گیانە .

٨- بونەوەرەکان گشتیان بەرەو پیری مەرگ دەچن ،
تەنیا مرۆڤ نەبێت ،
مەرگ بەپیریەوە دێت .

٩- سێبەری گوڵ
گوڵێکی دیکەی سیسە .

١٠- پاکترین ئاخاوتن لە دەمی ئاسمان دێتە خوارێ
کەچی پێی دەڵێن قسەی دابەزیوو .

١١- دەنگ بەربانگی ئاخاوتنە .

١٢- خۆر ماڵێکی هەیە
رێی بۆ ناچێ .

١٣- بەڵێ ،تیشکیش کرنوش دەبا
بەڵام بۆ تیشکێکی دیکە .

١٤- تیشك ناتوانێ بخەوێ
تا کراسی تاریکی نەپۆشێ .

١٥- ئاو منداڵێتی هەورە .

١٦- کەنار سەرینێکە
شەپۆل پاڵی پێداوەتەوە .

١٧- باخچە ژنێکە
خۆڵ لەشیەتی
گیاش جلو بەرگی .

١٨- رووخسار رۆشنایی لەشە
کە تاریك دادێ
هەموو لەش دەکوژێتەوە .

١٩- ئاسمان دەتخوێنێتەوە
بەڵام دوای ئەوەی زەمین دەتنووسێ .

٢٠- لەم
پیرۆزباییت لێ دەکەم
کە هەر تەنیا تۆ لە توانات دا هەیە
ئاوو سەراب
لە جامێك بکەی .

# ئاوور

حەمە فەرەج

شاخ دوو باڵی کۆتری سپی
داری قەد پاڵ ..
نەوقەو میروی قژی ئەوە
ئەمشەو بەفرێ تر ئەبارێ ...
هەر بەو بەفرە دەربەن قژی ..
خۆی مێش ئەکا
هەنگاو ..
خرچەی بەفری قوڕاوی دەم ڕێیە
ئەوا شلێپەی بیرکردنەوەم
بۆ بینینی چاوەکانت شتی پێیە
هاتووم بۆ لات ..
سەرم قاڵە ..
دەریشم کەی پێیەکانم هی خۆم نیە
دڵەڕاوکێ و کزەی سەرماکەش
قووتمەدەن
کەچی هەر دێم و باکم نیە ...
عەشق ئاوها پڕ لە تینە
خوێن بەرەو سیما سەرئەخا
هەنگاوێکیش باکی نەبێ..
دۆڵی دەربەنی هاتنیش
پڕ لە سێڵاوی بەفرئەکا
کە ئەهاتم !!
ڕۆحم تینوو

فرتەی دڵم چۆلەکە بوو...
لەناو مشتی ماڵێکی چەتوونا بوو
کۆڕەپانی هیچ شەرێکیش
وەکۆ ئەوسای من ..
سەربازێکی ترسنۆکی تیێدا نەبوو..
نەبوو ...
نەبوو ...
گیان بەوەبوو پێیەکانم هی خۆم نەبوو
بەرێت خستم ..
هەنگاوەکانم لە گریان ژیر بوونەوە
کەوتمە سەر ملی رێگاکە و
بەیەکەوە تواینەوە
بیرم هەر لەلای باران بوو
کەبەر یەخەو دەستم تەڕ بوو
بەسەر دەربەنی لای راستما
نیگایەکی ئاسمانم کرد .. هەوری نەبوو !!
ئاورێکم لێ دایتەوە بزانم نیشتا وەستاوی ؟ !
ئینجا زانیم باران نیە ..
یەکۆ دوو دڵۆپ فرمێسکی خۆڵەمێشیە ..
ئەو کاتەی کە بە رێت خستم لە چاو زایی .

# داستانی راپەڕین

جەوهەر کرمانج

ئەو کاتەی کە
من لێتانەوە نزیک بووم
تەتەر .. جار .جار
بۆنی ئێوەی بەنامە پێدا دەپژاندم
ئەو نەبوایە .
نیگام لەناو بەفری قەمپاڵ دەتواندەوە
تاتێکەڵ ئەو جۆگانەبم
بەرەو ئێومیان دەخشاندم
من ئەو تفەنگی عیشقە پڕ خەتەرە بووم
گەر پەنجەی ئێوە نەبوایە
کوا شــریقـــــژن
ماڵی گەرووی پێ دەزانیم
ریبوارێکی نەفەس سواری
ئەم داستانە سەفەرەبووم
گەر نانی ئێوە نەبوایە بە توێشووی ریم
کوا هەنگاوم ریّی دادەگرت
من و ئێوە ،
پەردە رۆحێک لە نێوانمان .
رایەڵ کرابوو وەکو پرد
بەلام تۆفانە ئەنفالی لێکی کردین .
لێک دابراین .

وەک چۆن گورگ
کارو بزن لێک دادەبڕێ
وادابراین . .
کەدابراین . .
وەرزی زاووزێ ی سەنگەربوو
وەرزی پێکەیینی رەزی ،
رقی چیاو دەشت و دەربوو
کەشی ئاوس بوونی جادەو
کۆلان و شەقامی شاربوو
هەرەتی دروێنەی خەم و
سەدان سەری ،
بەسەر شانی زوحاکی بەعس دا ماربوو
ئەو دەمە من لێرە نەبووم
بەلام لەوێ . . لە شامەوە
لەپەنجەرەی زامی مەولانا خالیدی ،
غوربەت نیش وهــــە میشە نا ئارامەوە

بەچاوی دڵ ،
یەک بە یەک ئێوەم دەبینی
جەستەم لێتانەوە دوور بوو
بەڵام دەمدیت . .

زەوی لەژێر هەنگاوتانـــدا
سەرکە بزۆتێکی سوور بوو
لێرە نەبووم ..
بەڵام هەموو گیانم هەست بـــوو
هەستیشم بیوە راداری لەتەماشای ،
ئەسپە وڵاتی سەرکێشـا
دەمبینی چۆن ،
لغاوو سندمی دەپسـاند
مێخ زنجیری داکوتراوی
ژەنگ هەڵگرتووی هەڵدەکێشا
گیانم هەمووی ،
دەماری لەشم موو بەمووی
لە ناو لە پی ئەو پێشمەرگە شێتگیرە بـــوو
سێرەی دەگــــــرت،
لەو مێـرده زمـە پۆستاڵ روانـــەی
لەومتی هـــەن
کۆسپی سەر رێی پێنگ کەمین و ترازانـــــی
جـــووتـی لـــێـــــون
هەناســـەم تژی بـەرامـــەی
ئەو باروتـــــە بخـــووره بـــــوو
بۆ ســـەر سینگـــی قەتـران دڵـــــێ :
گوللـەی سووری پێش خـۆی دەدا
تاکام زووتـــر بیـێــــە نـگـێـون
لەوێ .. بەگـــوێی
بیســـیم بیستـــــــم
کوردستانــــم .......
شەختە بەنـدانی زستانی شکانـــدوە و
سەره تاتکـبێیـــمتـــی لەگەڵ
خـاپەرۆکـــــی سـەدەی بیستـــــم
لەوێـوە گوێـم لـێ بـــوو سلێمانـــی
خرۆشـــا بـــوو ...
لەگەڵ دەنـگـــی شێخ مەحموود و
گازه گـازی نۆبەتـــداران
چاوم لـێ بـــوو .. هـەر با با بـــوو
ماقەنزەمەی راتەکێشـــــا و
پەنجەی دەخستــە سەر جەرگی پەلاپیتکــ ،
مەتـره لۆز و جامبێزاران
تا بگـرن شـاری کەرکوکــــێ
لێم دیار بـــوو لـە سووردەش را
بەرەو دەربەنـــــدی بازیان
شێـخ بە سـواری ئەسپەشـێوە
دەستێکـی لـە سـەر برین و
بـەوەی دیشـــــی ،
ریشــمـــە و هەوسـاری گـرتبـــوو
بە هەشتـاوی ،
دەچوه پێشـوازی نـۆ بـــووکـــێ
تـــا دەنـگـــی هـەتـەری دەکــــرد
بانـگی رادێـــــشـــت :
هۆ کـەریمـی فـەتاحـەکان
ئاگـــادار بــــن
بـــووک جـــوانکەیــــە،
بگرن ئـەوە گڵێنـەی چـاو بـا نـە تووکــــێ

چۆراوگەی خوێن
لە مزگێنی و نەختی لەنجەی
ئەوە زامی نقێم سوورم
بۆ ئەلقەی ئەنگوست و پەنجەی
ئەوە هەموو سلێمانی و
سەر لەشکر و سوارەکانی
بۆ جلیتانێ و رمبازی پێش کەژاوەی
ها ئەزمرو پیرەمەگروون
بۆ دابینی گوارەکانی
ئەوەش رەنگیانەی فرمێسکم
بۆ لاسەرە و
زولف و پەرچەم و ئەگریجەی
تراکەی با شەدەی سوور بێ
رەشبەڵەکی خەنە و خوێنی بۆ بگێڕن
بالبنگاکەی ،
ئارموشی پەڕی نەعام بێ
بۆن و بەرامەی مێخەکێ و
عەتری رەیحانەو بخور بێ
لەبازاڕی چین و سەمەر قەند و شام بێ
هێل و دارچینی لە جۆنیی دڵ بهێڕن
رەشماڵی شەش تەختە هەڵدەن

بو جێی رازی
قاوەی لە فنجانەی مەمکان بو بگێڕن
کەت کەتە نەرمە بالیفان
دانێنە بن سەری نازی



بەڵێ بە چاوی غووربەت ؛
دەمبینی چۆن سلێمانی
ببوە گڕکانێکی سوور و
بۆ تاقی ئاسمان رۆیی بوو
دار و دیوار ..
تەنی بێگانەیان لە خۆدا دەتەکان
سەرا سەر رەنگ و روخساریان
زێدە کوردانە و خۆیی بوو
ئاگام لێ بوو ..
تا هەڵەبجەش ..
هەڵەبجەی پرسە و ماتە میش
هەڵەبجەی کانگەی شیوەن و
هەموو لەش ، کۆڤان و خەمیش

باوەشی شنرویّ دا
ەری دیلانی جۆش داوە و
ە وەندی سپی لە مستە و
ار شێوی رەشی فڕی دا
ک مانگی چواردە لێم دیار بوو
لۆن حاجی ..
ولاڵە سورەی هاموونی
یعر چن لە ناو لەپ دا بوو
یدا لە سینگ و بەرۆکی
مییە سولتان و باواجی
ەنگیّ .. لە دەنگی شێری ناو ؛
یشەو برینداری دەکرد
نکی زولاڵ ....
وەکو دەنگی سێوەی نەمر.... دەنگی دڵدار
یّ پەروا هاواری دەکرد
ەی رەقیب هەرماوە قەومی کورد زمان
ایشکێنی دانەری تۆپی زەمەن
چاوم لیّ بوو ... لە هەولێریش
لە هەولێری رەنجبەر و عبدالخالق ی قەڵەم تیژرو
لە سیپارەی دوژمن فێریش
ەقام و خوێن ،
لە ئاستەم لێک دەکرانەوە
لە زۆر جێهان .....
خوێن لە سەر شانی شەقام را
قیت .. قیت رابوە سەر پێیان
لە زۆر شوێنیش ،
شەقام لە سەری خوێنی گەش وەرگالا بوو

وەک جادەکەی دەوری قەڵا
ببوە کۆفی
پڕ بە گەرووی جاڕی دەدا
من بوم لە شەوانی سەخت و
شەری تیر دا
دە بوم بە فەرشی کاشانی
بۆ هەنگاوی پێشمەرگانەی
سەدانی وەک
سەردار سۆفی
لە بادینان ...
بادینانی کانگەی عەشقی مەم و زین و جوانیدا
لە حوجرەی مەلای جزیری و
فەقێ تەیران و خانی دا
خابوور لافاوی تۆڵە بوو ،
تۆڵە دەکولا و کەفی دەکرد
بەلا لێوی پڕا دەلال دەهاتە خوار
شوێنەواری پەڵەی خوێنی دەسڕیەوە و
پەت و سێدارە و شمشێری رادەماڵی
وەک چیلکەدار
ئەوان رۆژان ...
هەموو جیهان ببوە چاوو
ببوە کوێچکە و ببوە زمان
بە یەکەوە ،
لە گەورە ترین
داستانی ئەم سەردەمەی کورد رادەمان

بەهاری ١٩٩٢

# من و ئەو

مەهدی خوشناو

تابلۆی یەکـــەم

دونیا لەدەمی شەوابوو
ئاسمانێکی کپ و بێ دەنگ
ئەستێرەکان بێدار چاویان لێك نەدەنا
وەك ئەوانیش لەچاوەڕێی تەقینەوەی
زەمین دابن
من هێشتا زەرنەقوتەی هێلانەبووم
هێشتا کۆرپەی نێو باوەش و جۆلانەبووم
گۆرانیم گوت ،ئەستێرەم بۆهاتنە سەما
قازوقورینگم لێ پەیدابوون
توندوتۆڵ هەنگاوم دەنا
بەئومێدی ڕێگایەك بووم
بەئومێدی نیگایەك بووم
بەئومێدی دەرگایەك بووم

تابلۆی دووەم

گێژەنی تورەی بەرمۆدا
هەلی لۆشتم
شەوەو کابوسێکی سامناك
سەمای لەناخەوە کوشتم
فرێی دامە گەروی برسي گەلەگورگێك
پڕیان دامێ ،هەلپەیان بوو
لەت لەتم کەن
لەئاگردانێکی خامۆش ببمە پشکۆ
گەرم کاتەوە لەشی ساردی دۆڕاوێ
لەبن چرنوکی توترك و درکەزی پەنجەی پیسي ئەو
لەبەژنی یەك پارچەژانی تاڵ و برینم
خوێن دەچۆڕا
لەگیانەلای مەرگی پاکی مەسیحیدا
گشت شتە پاکەکانیشم لێ بوونە گۆڕو
بوونە تابوت و سێدارە ..

تابلۆی سێیـــــەم

بروسکەی هەورە تریشقە
بوومەلەرزەی بێ ئامانی ئەوساتەبوو
چەخماخەی دا
ئاسمانوخاك سوور هەڵگەڕان
دیوارو تانۆکیش بەخوێن سواخ دران
خۆر لەلوتکە دابەزی و هاتە نێو لەپم
باران دایگرد گوناهەکان بشواتەوە
ـ گرمە گرمە
شتێك هەردەبێ ڕوویدا
نرکەی ناخی چ شاخێکی [illegible]ر هەنیشکی پێشمەرگەیە !؟
نالەی دایکی کامە پێشمەرگەی شەهیدە
یاپەیامو نێردەی خوایە
دەگاتەجێ و
دەنگم دەدا
وەکو وولاتێکی بێ پێشمەرگەو نوغرۆ
لەنێو تابوتا هەستمەوە
سەنگەر بگرم ،بکەومەخۆ
ئەم جەستە ماندوو شەکەتەم
ئەم چاوانەی شێتی خەوەو
ئەم گیانەی نوقمی وەنەوز
هەربەم مەرگە بوکێنیەی
مەترس کفنم لێ دەکرد
بووم بەبووکی شەوی پەردە
بۆ عیشقێکی سپی و
بەهارێکی سەوز

تابلۆی کۆتایی

ئەویش لەچاونوقانێکدا
بوو بەپەرەی ڕۆژ ژمێری فرێ دراوی بن مێزو
بوو بەقونك و سۆتەکەی نێو تەبلە جغارەی
بارەکان

ممتاز حەیدەری

# بەیادی ٩٥ ساڵەی رۆژنامەنووسی کوردی

## یەکەم رابەری ووشەی کوردی

بەرلەسەدەیەک ، لەکاتێکا دەوڵەتی داگیرکەری عوسمانی ژێرخانوسەرخانەکەی دەهاتە هەژان و لەرزین ، ودەسەڵاتی دامودەزگاکانی دەوڵەت بەرەو لاوازی و بێ هێزی دەچوو ، ئالەوکاتەدا هۆشیاری سیاسی و گیانی نیشتمانیو کۆششی نەتەوە ژێر دەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی ، ئەو ژێرخان و سەرخانەکەی ( لە تەک چەند فاکتەرێکی دیکە ) زیاتر دەیان هەژاندو لاوازیان دەکردو ئالای جیابوونەوە دەوڵەتی سەربەخۆیان بەرزدەکردەوە لەونەتەوە ژێر دەستوستەمدیدانە ، نەتەوەی کوردمان ، کەلەچەرخی (١٦) هەمەوە بەشێکی گەوردی لەبن دەستی دەوڵەتی ئیستعماری عوسمانی بوو ، بگرە دژایەتی کورد لەهەموو نەتەوە ژێر دەستەکانی دیکە زیاتریان دەکرد . بۆیە کە بە دەیان جوولانەوەی چەکداریو ڕاپەرینو شۆڕشی ناوە ،ناوە ، هەرجارێ لەبەشێکی کوردستانی داگیرکراو دژی رژێمی گەندەلی عوسمانی بەرپا دەبوو . لەتەک ئەمبزافی چەکداریو ڕاپەرین و شۆڕشانە ، ڕاپەرینێکی زۆر گرنگ رووی‌دا ، واتە یەکەم ڕاپەرینی ڕۆشنبیری کوردی ، ئەویش بە دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی ـ ١٨٩٨/٤/٢٢ـ بەناوی ( کوردستان) ی دایک لەلایەن ژمارەیەک رووناکبیرانی کورد بەنایبەت بەدرخانی‌یەکان لەسەرووی ئەم بنەماڵە نیشتمانپەروەرو تێکۆشەرە حەزرەتی مقدادبەگ و حەزرەتی ئەورەحمان بەگ . . دیارە ئەم حووتە رووناکبیرە شۆڕشگێرە دەوری سەرەکیان لەدەرکردنی ڕۆژنامەی کوردستان هەبوە .

کەواتە ئەمساڵ ، یادی ( ٩٥) ساڵەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردییە ، یادی بیرەوەری دەورکردنەوەو هەڵسەنگاندنی خەبات و کۆششی خوێناویی ماوەی (٩٥) ساڵە لەپێناوی ژیانێکی کۆمەڵایەتیی کامەران و وەدەستهێنانی مافی ڕەوای نەتەوەیی لەنیشتمانێکی سەربەخۆو یەکگرتودا .

دەرچوونی ، یەکەم ڕۆژنامەی کوردی نیشانەیەکی پڕشنگدارە لەمێژووی خەباتی ڕۆشنبیری و ژیانی ڕۆژنامەنووسیی نیشتمانی بەتایبەتی ، تێکۆشانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و نەتەوەیی بەگشتی،بگرە بەکارهێنانی چەکی ووشەبوو لەکۆری ململانێی نەتەوەیی وسووتەمەنی چرای هۆشیاری شارستانییەت و سیاسیی بوو...ا زێدە بەکورتی دەڵێم ئەم (٩٥) ساڵە رەنگدانەوەی خەیاڵی ئالۆزو دژواری کلتوریو ڕۆژنامەنووسیو کۆمەڵایەتییو نەتەوەیی کوردە ، بۆیە کەهەڵدەگرێ بەئەندازەی درێژایی ئەم (٩٥) ساڵەوپیرۆزیو گەورەیی دەوری نیشتمانپەروەرانەی ڕۆژنامەنووسی کوردی هەقی ڕەوای ئەم یادە بەئەنجام بدەین هەر لەئێستاوە لیژنەیەکی ئامادەکاری کارامە بۆ ئەم مەسەلە پیرۆزو گران بەهایە دروستبکرێ ...ا ٭

٭ یادی (٩٥) ساڵەی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ـ کوردستان ـ هەر پڕشنگدار بێ ...ا

٭ یادی پیشەنگی کاروانی روژنامەنووسی کوردی هەمیشە زیندووبێ ...ا

٭ یادی ڕێبەرانی یەکەم ڕاپەرینی ووشەی کوردی هەر نەمر بێ ...ا

# هەوڵ و مەبەست

دەق وەک دوا دارشتەی هزر هەر لەگەڵ راخستنیەوە بەسەر رووپەری گۆڤارو رۆژنامەکان یا ئەوەتا مەرگی خۆی رادەگەیەنێ ، یا خود بەردەوامی خۆی وداهێنەرەکەی دەسەلمێنێ.. بۆیە نووسەران بەتایبەتیش نووسەرانی پڕ ئەزموون و ئەندێشمەندی دووربیر ...

هەوڵی ئەوەنادەن لەگەڵ داهێنانی دەقێک دالە هەربوارێک دابێت بریاری بڵاوکردنەوەی بدەن چونکە پێیان وایە بڵاوکردنەوەی هەردەقێک ، ئاشکراکردنی کۆمەلێک نهێنی وردە نوێشکی هەڵقرچاوی کۆمەلێک ئێسقان وبازرقەی ساتە وەختێکی باشی خوێنە... وەرچەرخانی شێوازی خودی نووسەرە... بۆیێکە ئەم دەقە دەبێ چاوێدانیو نەمربێ ، ئاسەواری کاریگەری خۆی هەبێ ...

چونکە بەمپێو دانگە داهێنان کوشتنی بەشێکە لەجەستەی داهێنەر بەرەو نەمری ، کەلەگەڵ بەردەوامی تەمەن جەستەی دەبێتە مەیدانی قوربانیدانو هزر رابەرایەتی دەکا ...

مەبەست لەمچەند ووشانەی سەرەوە ئەوەیە ، داهێنەری راستەقینە شاعیربێ یا چیرۆک نووس ، رەخنەگربێ یا رۆمان نووس ، زۆرکەم دەبینرێ هەڵپەی بڵاوکردنەوەی هەبێت .. بەتایبەت لەژانری داهێنانی تایبەتی خۆیان ئێمە لەگۆڤاری کاروان ئەوکاتە بەختەوەر دەبین کەهەرچی بەرهەمی باشە بەزووترین کات بڵاوی بکەینەوەو کاتی بەسەردا ئەڕوات ، ئەگەر بۆشمان بکرێ قەبارەی گۆڤارەکە بەپێی ئەوهەموو بابەتە چاکانە گەورەبکەین کەلەماوەی مانگێک دابۆمان دێت ...

بەڵام بریا هەموولایەک دەبانزانی دواخستنی بابەتەکان لەچیدایە بریا خاوەن گلەییەکان .. لەمەڕ دواخستنی دەقەکانیان دەیانزانی کاری چاپخانەو گیروگرفتی کەرەستە لەم سەردەمەی ئێمەدا چەند بەسەختی بەرێوەدەچێ هیوادارین لەئاستی بڕواو لێکدانەوەی هەموو لایەک بن .

سکرتێری نووسین )

KARWAN

Uprising Issues

A Monthly Literary and Cultural Magazine

Issued in Kurdish by
The Ministry Of Culture
Kurdistan Province Government

*No.3*



تابلوی بەرگی یەکەمو دووەم/دارا محمد علی

نرخی: ٢ دیناره